ابو داود سليمان بن الاشعث السجستاني

هەزار فەرموودە لە فەرموودەکانی

# سوننی ئەبوداود






بەرگی چوارەم

وەرگێڕانی

ناصح ابراهيم سازانی

التفسير



# هەزار فەرمودە
# لە فەرمودەکانی
# سونەنی ئەبو داود

## بەرگی چوارەم

**لە فەرمودەی سێ هەزار و هەشتاو نۆوە**
**بۆ چوار هەزار و نۆزدە**


نـوسـینـی :

أبو داود سليمان بن الأشعث السجستانی

وەرگـێڕانی :

ناصح ئیبراهیم سازانی




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پەرتوکی تەرم (جەنازة)

## ١٥ - كتاب الجنائز

### باسی نەخۆشیەکان کەفارەتی گوناهو تاوانەکانن

### ١ - باب الأَمْرَاضِ الْمُكَفِّرَةِ لِلذُّنُوبِ.

٣٠٨٩ - (ضعيف) عن عامر الرامى قال: إِنِّي لَبِبِلاَدِنَا إِذْ رُفِعَتْ لَنَا رَايَاتٌ وَأَلْوِيَةٌ, فَقُلْتُ, مَا هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا لِوَاءُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ تَحْتَ شَجَرَةٍ قَدْ بُسِطَ لَهُ كِسَاءٌ وَهُوَ جَالِسٌ عَلَيْهِ, وَقَدِ اجْتَمَعَ إِلَيْهِ أَصْحَابُهُ, فَجَلَسْتُ إِلَيْهِمْ, فَذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَسْقَامَ, فَقَالَ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَصَابَهُ السَّقَمُ ثُمَّ أَعْفَاهُ اللَّهُ مِنْهُ كَانَ كَفَّارَةً لِمَا مَضَى مِنْ ذُنُوبِهِ, وَمَوْعِظَةً لَهُ فِيمَا يَسْتَقْبِلُ, وَإِنَّ الْمُنَافِقَ إِذَا مَرِضَ ثُمَّ أُعْفِيَ كَانَ كَالْبَعِيرِ عَقَلَهُ أَهْلُهُ ثُمَّ أَرْسَلُوهُ, فَلَمْ يَدْرِ لِمَ عَقَلُوهُ, وَلَمْ يَدْرِ لِمَ أَرْسَلُوهُ؟). فَقَالَ رَجُلٌ مِمَّنْ حَوْلَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, وَمَا الأَسْقَامُ؟ وَاللَّهِ مَا مَرِضْتُ قَطُّ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قُمْ عَنَّا فَلَسْتَ مِنَّا). فَبَيْنَا نَحْنُ عِنْدَهُ إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ عَلَيْهِ كِسَاءٌ وَفِي يَدِهِ شَيْءٌ قَدِ الْتَفَّ عَلَيْهِ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي لَمَّا رَأَيْتُكَ أَقْبَلْتُ إِلَيْكَ فَمَرَرْتُ بِغَيْضَةِ شَجَرٍ فَسَمِعْتُ فِيهَا أَصْوَاتَ فِرَاخِ طَائِرٍ, فَأَخَذْتُهُنَّ فَوَضَعْتُهُنَّ فِي كِسَائِي, فَجَاءَتْ أُمُّهُنَّ فَاسْتَدَارَتْ عَلَى رَأْسِي, فَكَشَفْتُ لَهَا عَنْهُنَّ, فَوَقَعَتْ عَلَيْهِنَّ مَعَهُنَّ, فَلَفَفْتُهُنَّ بِكِسَائِي, فَهُنَّ أُولاَءِ مَعِي, قَالَ: (ضَعْهُنَّ عَنْكَ). فَوَضَعْتُهُنَّ, وَأَبَتْ أُمُّهُنَّ إِلاَّ لُزُومَهُنَّ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَصْحَابِهِ: (أَتَعْجَبُونَ لِرُحْمِ أُمِّ الأَفْرَاخِ فِرَاخَهَا؟). قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ -صلى

الله عليه وسلم-, قَالَ: (فَوَالَّذِي بَعَثَنِي بِالْحَقِّ لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ أُمِّ الأَفْرَاخِ بِفِرَاخِهَا, ارْجِعْ بِهِنَّ حَتَّى تَضَعَهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُنَّ وَأُمُّهُنَّ مَعَهُنَّ). فَرَجَعَ بِهِنَّ.

واتە: لە عامیری رامیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە وڵاتی خۆمان هەندێ ئاڵاو پەرچەمی لەشکر بەرزکرانەوەو دەرکەوتن، وتم: ئەمانە چین؟ وتیان: ئەوە ئاڵاو بەیداخی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، رۆشتم بۆ خزمەتی لەژێر درەختێکدا فەرشێکیان بۆ راخستبوو لەسەری دانیشتبوو، هاوەڵانی لەدەوری کۆبوووبوونەوەو دانیشتبوون، منیش لەلایان دانیشتم، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی دەردو نەخۆشیەکانی دەکرد فەرمووی: (بێگومان باوەڕدار کاتێ کە توشی دەردو نەخۆشیەك دەبێت، لەپاشدا خوای گەورە شیفای دەدات و چاکی دەکاتەوە ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهە رابووردوەکانی، هەروەها دەبێت بە پەندو ئامۆژگاری بۆ رۆژانی داهاتوی، بەڵام کەسی ناپاك و مونافیق کاتێ کە توشی دەردو نەخۆشیەك دەبێت و چاك دەبێتەوە وەك وشترێ وایە کە خاوەنەکەی جاربەجارێ دەیبەستێتەوەو جاربەجارێ بەرەڵای دەکات، نازانێ بۆچی بەستویانەتەوە و بۆچی بەرەڵایانکردوە)، پیاوێ لەوانەی کە لەدوری بوون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەردو نەخۆشی چی یە؟ سوێند بە (الله) هەرگیز نەخۆش نەکەوتوم، فەرمووی: (هەستە لەگەڵ ئێمە دامەنیشە تۆ لە ئێمە نیت).

ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دانیشتبووین، پیاوێ هاتە خزمەتی پۆشاکێکی لەبەردا بوو شتێکی بەدەستەوە بوو بە پۆشاکەکەی داپێۆشبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە تۆم دی هاتم بۆ خزمەتت، دام بەلای کۆمەڵە دەوەنێکی چڕدا گوێم لە دەنگی هەندێ بێچوە باڵندە بوو، خستنمە ناو پۆشاکەکەمەوە، دایکیان هات بەسەر سەرمدا دەسوڕایەوە، بێچوکانیم نیشاندا ئەویش هات بۆ لایان گرتم و پێچانمەوە،

ئەوەتان پێمن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لەسەر زەوی دایان بنێ)، دایکەکەیان خۆی پێوە نوساندبوون نەیدەویست لێیان جیاببێتەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵانی فەرمووی: (روحم و بەزەیی ئەو دایکەتان بەلاوە سەیرە بۆ بێچوەکانی) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (سوێند بەو (الله)یەی کە منی بەحەق رەوانەکردوە خوای گەورە بە روحم و بەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو دایکە بۆ بێچوەکانی، لەکوێ هێناوتن خۆیان و دایکیشیان ببەرەوە بۆ ئەو شوێنە). ئەویش بردنیەوە بۆ جێگەی خۆیان.

٣٠٩٠ - (صحيح) عن محمد بن خالد, عن أبيه, عن جده وكانت له صحبة من رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا سَبَقَتْ لَهُ مِنَ اللَّهِ مَنْزِلَةٌ لَمْ يَبْلُغْهَا بِعَمَلِهِ ابْتَلَاهُ اللَّهُ فِي جَسَدِهِ أَوْ فِي مَالِهِ, أَوْ فِي وَلَدِهِ). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: زَادَ ابْنُ نُفَيْلٍ: (ثُمَّ صَبَّرَهُ عَلَى ذَلِكَ). ثُمَّ اتَّفَقَا (حَتَّى يُبْلِغَهُ الْمَنْزِلَةَ الَّتِي سَبَقَتْ لَهُ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی خالیدەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە کە هاوەڵێتی پێغەمبەری کردوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (بێگومان بەندەیە کە خوای گەورە پێشتر پلەو پایەیەکی بەرزی بۆ دانابێ بە کردەوەی خۆی نەگاتە ئەو پلەوپایەیە، خوای گەورە خۆی یان منداڵەکەی توشی دەردو نەخۆشی دەکات یا ماڵ و سامانی توشی زەرەرو زیان دەکات). ئەبوو داود دەڵێت: ئیبنو نوفەیل ئەمەی بۆ زیاد کرد: (لەپاشدا ئارامی پێ دەبەخشێ لەسەری)، ئینجا هەردوو راوی یەك دەنگن (هەتا دەگاتە ئەو پلەوپایەیەی کە خوای گەورە پێشتر بۆی داناوە).

## باسی دەربارەی ئەگەر کەسێ بەردەوام کردەوەیەکی چاك بکات نەخۆشی و سەفەر سەرقاڵیان کرد نەیتوانی ئەو کردەوە بکات.

## ٢ - باب إِذَا كَانَ الرَّجُلُ يَعْمَلُ عَمَلاً صَالِحًا فَشَغَلَهُ عَنْهُ مَرَضٌ أَوْ سَفَرٌ.

٣٠٩١ - ( حسن ) عن أبو موسى قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ يَقُولُ: (إِذَا كَانَ الْعَبْدُ يَعْمَلُ عَمَلاً صَالِحًا فَشَغَلَهُ عَنْهُ مَرَضٌ أَوْ سَفَرٌ :كُتِبَ لَهُ كَصَالِحِ مَا كَانَ يَعْمَلُ وَهُوَ صَحِيحٌ مُقِيمٌ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: زیاتر لە جارێ یان دوو جار لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (ئەگەر بەندەیە لەکاتی لەش ساغی و لەشوێنی نیشتەجێی خۆیدا بەردەوام بێت لەسەر کردەوەیەکی چاك، کاتێ کە نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد پاداشتی هەمان کردەوەی بۆ دەنوسرێت کە پێشتر لەحاڵەتی لەش ساغی و لە شوێنی نیشتەجێی خۆیدا ئەنجامی دەدا).

## باسی سەبارەت بە سەردانی ئافرەتان.

## ٣ - باب عِيَادَةِ النِّسَاءِ.

٣٠٩٢ - (صحيح) عن أم العلاء قالت: عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَرِيضَةٌ فَقَالَ: (أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلاَءِ, فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللَّهُ بِهِ خَطَايَاهُ كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ).

واتە: لە (أُمّ الْعَلاَء)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نەخۆش بووم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەردانی کردم فەرمووی: (ئەی (أُمّ الْعَلاَء) موژدە بێ لێت، خوای گەورە بە نەخۆشی موسوڵمان لە گوناه پاك دەکاتەوە وەك چۆن بە ئاگر زێڕ و زیو لە ژەنگ و چڵك پاك دەکاتەوە).

٣٠٩٣ - (ضعيف الاسناد لكن شطر: (من حوسب...) الخ صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي لأَعْلَمُ أَشَدَّ آيَةٍ فِي الْقُرْآنِ, قَالَ: (أَيَّةُ آيَةٍ يَا عَائِشَةُ؟). قَالَتْ: قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ) قَالَ: (أَمَا عَلِمْتِ يَا عَائِشَةُ أَنَّ الْمُؤْمِنَ تُصِيبُهُ النَّكْبَةُ أَوِ الشَّوْكَةُ فَيُكَافَأُ بِأَسْوَإِ عَمَلِهِ, وَمَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ). قَالَتْ: أَلَيْسَ اللَّهُ يَقُولُ: (فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا) قَالَ: (ذَاكُمُ الْعَرْضُ, يَا عَائِشَةُ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ عُذِّبَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من دەزانم کام ئایەتە لە قورئاندا توند ترو قورس ترە لەسەر موسوڵمان، فەرمووی: (ئەی عائیشە کام ئایەتە؟). وتی: ﴿ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴾ سورە النساء: ١٢٣. واتە: هەرکەسێك هەر کارێکی ناڕەواو خراپ بکات، دڵنیابن هەر بەو کارەی خۆیە جەزرەبە دەدرێت. فەرمووی: (ئایا نازانی ئەی عائیشە کەسی باوەڕدار کاتێ کە توشی نەخۆشی و ناخۆشی و بەڵاو کارەسات دەبێت دەبێتەهۆی کەفارەت و سڕینەوەی کردەوە خراپەکانی، هەرکەسێك لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت سزا دەدرێت).

عائیشە وتی: مەگەر خوای گەورە نافەرمووێت:

﴿ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴾ سورە الأنشقاق: ٨. واتە: نیتر لێپێچینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵ دەکرێت.

فەرمووی: (ئەی عائیشە ئەو لێپێچینەوە ئاسانە نیشاندانی کردەوە خراپەکانە، هەرکەسێك گفتوگۆی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت واتە لە کردەوەکانی بکۆڵرێتەوە لەو ڕۆژەدا لەناودەچێت).

## باسی سەبارەت بە سەردانی نەخۆش.

## ٤ - باب فِي الْعِيَادَةِ.

٣٠٩٤ - (ضعيف الاسناد لكن قصة القميص صحيحة) عن أسامة بن زيد قال: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ فِي مَرَضِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ, فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ عَرَفَ فِيهِ الْمَوْتَ, قَالَ: (قَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ حُبِّ يَهُودَ), قَالَ: فَقَدْ أَبْغَضَهُمْ أَسْعَدُ بْنُ زُرَارَةَ, فَمَهْ؟ فَلَمَّا مَاتَ أَتَاهُ ابْنُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ قَدْ مَاتَ, فَأَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ, فَنَزَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَمِيصَهُ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچو بۆ سەردانی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئوبەی کاتێ کە نەخۆش کەوت هەر بەو نەخۆشیەش وەفاتی کرد، کە چوە ژورەوە بۆلای نیشانەی مردنی لێ بەدی کرد، فەرمووی: (خۆشەویستی جولەکەم لێ قەدەغە کردی هەوڵم دا کە لێیان دوربکەویتەوە)، وتی: خۆ ئەسعەدی کوڕی زوراره دەیبووغزاندن و رقی لێیان بوو چ سودێکی پێ گەیاند خۆ لە مردن رزگاری نەبوو؟ کاتێ کە مرد کوڕەکەی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئوبەی مرد، کراسەکەتم بدەرێ با بیکەم بە کفن بۆی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کراسەکەی داکەندو پێی دا.

## باسی دەربارەی سەردانی نەخۆشی خاوەن پەیمان کە ئایا دروستە یان نا؟

## ٥ - باب فِي عِيَادَةِ الذِّمِّيِّ.

٣٠٩٥ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ غُلاَمًا مِنَ الْيَهُودِ كَانَ مَرِضَ, فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ, فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ, فَقَالَ لَهُ: (أَسْلِمْ). فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ لَهُ أبووهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ, فَأَسْلَمَ, فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقُولُ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَنْقَذَهُ بِي مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە منداڵێك لە منداڵەکانی جولەکە نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی کرد، لەلای سەریەوە دانیشت، پێی فەرموو: (موسوڵمان ببە). منداڵەکە سەیری باوکی کرد کە لەلای سەریەوە بوو، باوکی پێی وت: بە گوێی باوکی قاسیم بکە واتە بەگوێی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بکە، ئەویش موسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا فەرمووی: (سوپاس بۆ خوای گەورە کە بەهۆی منەوە لە ئاگری دۆزەخ رزگاری کرد).

## باسی رۆشتن بۆ سەردانی نەخۆش بە پێ.

## ٦ - باب الْمَشْيِ فِي الْعِيَادَةِ.

٣٠٩٦ - (صحيح) عن جابر قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي لَيْسَ بِرَاكِبِ بَغْلاً وَلاَ بِرْذَوْناً.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی منی دەکرد، نە بەسواری ئێستر دەهات بۆ سەردانم نە بە سواری بارگیر.

## باسی دەربارەی سەردانی نەخۆش بە دەستنوێژەوە.

## ٧ - باب فِي فَضْلِ الْعِيَادَةِ عَلَى وُضُوءٍ.

٣٠٩٧ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ وَعَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ مُحْتَسِبًا بووعِدَ مِنْ جَهَنَّمَ مَسِيرَةَ سَبْعِينَ خَرِيفًا). قُلْتُ يَا أَبَا حَمْزَةَ: وَمَا الْخَرِيفُ؟ قَالَ: الْعَامُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك دەستنوێژێك بگرێت بە تەواوی و بە جوانی و لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە سەردانی برایەکی موسوڵمانی بکات بە ئەندازەی حەفتا ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دور دەخرێتەوە). وتم: ئەی ئەبا حەمزە (خریف) یانی چی؟ وتی: واتە: ساڵ.

٣٠٩٨ - (صحيح موقوف) عن علي, قال: مَا مِنْ رَجُلٍ يَعُودُ مَرِيضًا مُمْسِيًا إِلاَّ خَرَجَ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَسْتَغْفِرُونَ لَهُ حَتَّى يُصْبِحَ, وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ, وَمَنْ أَتَاهُ مُصْبِحًا خَرَجَ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَسْتَغْفِرُونَ لَهُ حَتَّى يُمْسِيَ, وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرکەسێك سەر لە ئێوارە بچێت بۆ سەردانی موسوڵمانێ ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکە دەردەچن لەگەڵی هەتا بەیانی داوای لێ خۆش بوونی بۆ دەکەن و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، لە بەهەشتدا باخێکی دەدەنێ بۆ خۆی، وە هەرکەسێك سەر لە بەیانی بچێت بۆ سەردانی موسوڵمانێ ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکە دەردەچن لەگەڵی هەتا ئێوارە داوای لێ خۆش بوونی بۆ دەکەن و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، لە بەهەشتدا باخێکی دەدەنێ بۆ خۆی).

٣٠٩٩ - ( صحيح مرفوع) عن علي, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بِمَعْنَاهُ, لَمْ يَذْكُرِ الْخَرِيفَ.

واته: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام ڕاوی باسی باخ(خريف)ی نەکرد.

٣١٠٠ - ( صحيح مرفوع) عن أبو جعفر عبد الله بن نافع, قال: وَكَانَ نَافِعٌ غُلَامَ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ, قَالَ: جَاءَ أَبو مُوسَى إِلَى الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ يَعُودُهُ... قَالَ أَبوو دَاوُدَ وَسَاقَ مَعْنَى حَدِيثِ شُعْبَةَ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: أُسْنِدَ هَذَا عَنْ عَلِيٍّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ صَحِيحٍ.

واته: لە ئەبو جەعفەری کوڕی (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی نافعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نافع غوڵامی حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوایان لێ بێ، وتی: ئەبو موسای ئەشعەری سەردانی حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی کرد.. ئەبوو داود دەڵێت: ڕاوی مانای فەرمودەکەی شوعبەی گێڕایەوە، واتە لە ڕێگەی یەکەمەوە کە لە پێشەوا عەلی یەوە هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە لە لە پێشەوا عەلی یەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە هاتوە هەر هەموویان (صحيح)ن.

## باسی سەبارەت بە سەردانی نەخۆش جار لەدوای جار.

## ٨ - باب فِي الْعِيَادَةِ مِرَارًا.

٣١٠١ - (صحيح) عن عائشة, قالت: لَمَّا أُصِيبَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ يَوْمَ الْخَنْدَقِ رَمَاهُ رَجُلٌ فِي الأَكْحَلِ, فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ فَيَعُودُهُ مِنْ قَرِيبٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە سەعدی کوڕی (معاذ) – گەورەی هۆزی ئەوس بوو - لە جەنگی خەندەق دا دەماری باڵی پێکراو بریندا بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوتدا خێمەیەکی بۆ هەڵدا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ڕۆژانە سەردانی بکات.

## باسی سەبارەت بە سەردانی کەسێ چاوی ژان بکات.

## ٩- باب فِي الْعِيَادَةِ مِنَ الرَّمَدِ.

| ٣١٠٢ - (حسن) عن زيد بن أرقم, قال: عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِعَيْنَيَّ. |
|---|

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چاوم ئێشی دەکرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو بۆنەوە سەردانی کردم.

## باسی دەرچوون لە شوێنێ کە نەخۆشی (طاعون)ی تێدا بڵاوبێتەوە.

## ١٠ - باب الْخُرُوجِ مِنَ الطَّاعُونِ.

| ٣١٠٣ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عوف, قال: سمعت رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم يقول: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تُقْدِمُوا عَلَيْهِ, وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ). يَعْنِى الطَّاعُونَ. |
|---|

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیست دەیفەرموو: (ئەگەر بیستتان

نەخۆشی (طاعون) لە خاكێكدا هەیە مەچنە ئەوێ و بە پیریەوە مەچن، ئەگەر لە شوێنێكدا بوون نەخۆشی (طاعون)ی تێدا بڵاوبووەوە لەو شوێنە دەرمەچن و خۆتان دەرباز مەكەن لەدەستی).

## باسی پاڕانەوە بۆ نەخۆش کە چاك بێتەوە لەکاتی سەردانی کردنیدا.

## ١١ - باب الدُّعَاءِ لِلْمَرِيضِ بِالشِّفَاءِ عِنْدَ الْعِيَادَةِ.

٣١٠٤ - (صحيح) عن عائشة بنت سعد, أن أباها قال: اشْتَكَيْتُ بِمَكَّةَ, فَجَاءَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي, وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِي, ثُمَّ مَسَحَ صَدْرِي وَبَطْنِي, ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا وَأَتْمِمْ لَهُ هِجْرَتَهُ).

واتە: لە عائیشەی کچی سەعدەوە، دەگێڕنەوە، کە باوکی - واتە سەعد - وتویەتی: لە مەککە نەخۆش کەوتم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ سەردانم، دەستی دانا لەسەر نێوچاوانم، ئینجا دەستی هێنا بە سینگ و سکمداو فەرمووی: (خودایە شیفای سەعد بدەو کۆچەکەی بۆ تەواو بکە لە مەککە نەمرێت).

٣١٠٥ - (صحيح) عن أبو موسى الأشعري, قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم (أَطْعِمُوا الْجَائِعَ, وَعُودُوا الْمَرِيضَ, وَفُكُّوا الْعَانِيَ). قَالَ سُفْيَانُ: وَالْعَانِي: الأَسِيرُ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (برسی تێر بکەن و، سەردانی نەخۆش بکەن و، دیل ئازاد بکەن). سوفیان وتی: (العانی) واتە: دیل.

## باسی پاڕانەوە بۆ نەخۆش لەکاتی سەردانی کردنیدا.

## ١٢ - باب الدُّعَاءِ لِلْمَرِيضِ عِنْدَ الْعِيَادَةِ.

٣١٠٦ - (صحيح) عن ابن عباس: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ عَادَ مَرِيضًا لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ: أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ, رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ, أَنْ يَشْفِيَكَ: إِلاَّ عَافَاهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی اللە علیە وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (کەسێ بچێ بۆ سەردانی نەخۆشێ کە ئەجەلی نەهاتبێ حەوت جار بڵێ: (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ, رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ, أَنْ يَشْفِيَكَ). داوا لە خوای گەورە دەکەم، کە خاوەنی عەرشی گەورەو مەزنە دەرمانی دەردت بکات و شیفات بدات، ئیلا خوای گەورە شیفای دەدات و چاکی دەکاتەوە لەو نەخۆشیە).

٣١٠٧ - (صحيح) عن ابن عمرو قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ يَعُودُ مَرِيضًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ, يَنْكَأُ لَكَ عَدُوًّا, أَوْ يَمْشِي لَكَ إِلَى جَنَازَةٍ). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: وَقَالَ ابْنُ السَّرْحِ (إِلَى صَلاَةٍ).

واتە: لە ئیبنو عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێك چوە سەردانی نەخۆشێك با بڵێت: (اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ, يَنْكَأُ لَكَ عَدُوًّا, أَوْ يَمْشِي لَكَ إِلَى جَنَازَةٍ). خوایە شیفای بەندەکەت بدە، هەستێت بە بریندارکردنی دوژمنێك، لەسەر تەرمێ نوێژ بکات و لەگەڵی بڕوات بۆ گۆڕیستان). ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو سەرح وتی: (بڕوات بۆ نوێژ).

## باسی سەبارەت بە خراپی ئاوات خواستن بۆ مەرگ.

## ١٣ - باب فِي كَرَاهِيَةِ تَمَنِّي الْمَوْتِ.

٣١٠٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: (لاَ يَدْعُوَنَّ أَحَدُكُمْ بِالْمَوْتِ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ, وَلَكِنْ لِيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِى مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِى, وَتَوَفَّنِى إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِى).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێك لە ئێوە لەبەر زیانێ کە تووشی بوو داوای مەرگ نەکات، بەڵکو با بڵێت: (اللَّهُمَّ أَحْيِنِى مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِى, وَتَوَفَّنِى إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لى). ئەی خودایە! هەتا ژیانم بۆم باشترە بمژێنە، کەی مردنم باشتر بوو بۆم ئەوا بم مرێنە).

٣١٠٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: أن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قال: (لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێك لە ئێوە ئاوات بۆ مەرگ نەخوازێت).

## باسی مردنی کوتوپڕ.

## ١٤ - باب مَوْتِ الْفَجْأَةِ.

٣١١٠ - (صحيح مرفوعا و موقوفا) عن عبيد بن خالد السلمي, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَوْتُ الْفَجْأَةِ أَخْذَةُ أَسَفٍ).

واتە: لە عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مردنی کوتوپڕ جێی نیگەرانی و داخە).

## باسی دەربارەی فەزڵی ئەو کەسەی بە نەخۆشی (طاعون) دەمرێت.

## ١٥ - باب فِي فَضْلِ مَنْ مَاتَ فِي الطَّاعُونِ.

٣١١١ - (صحيح) عن جابر بن عتيك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَ يَعُودُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ ثَابِتٍ, فَوَجَدَهُ قَدْ غُلِبَ, فَصَاحَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمْ يُجِبْهُ, فَاسْتَرْجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (غُلِبْنَا عَلَيْكَ يَا أَبَا الرَّبِيعِ). فَصَاحَ النِّسْوَةُ وَبَكَيْنَ, فَجَعَلَ ابْنُ عَتِيكٍ يُسْكِتُهُنَّ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (دَعْهُنَّ, فَإِذَا وَجَبَ فَلاَ تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ). قَالُوا: وَمَا الْوُجُوبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (الْمَوْتُ). قَالَتِ ابْنَتُهُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأَرْجُو أَنْ تَكُونَ شَهِيدًا فَإِنَّكَ كُنْتَ قَدْ قَضَيْتَ جِهَازَكَ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَوْقَعَ أَجْرَهُ عَلَى قَدْرِ نِيَّتِهِ, وَمَا تَعُدُّونَ الشَّهَادَةَ؟). قَالُوا: الْقَتْلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الشَّهَادَةُ سَبْعٌ سِوَى الْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: الْمَطْعُونُ شَهِيدٌ, وَالْغَرِقُ شَهِيدٌ, وَصَاحِبُ ذَاتِ الْجَنْبِ شَهِيدٌ, وَالْمَبْطُونُ شَهِيدٌ, وَصَاحِبُ الْحَرِيقِ شَهِيدٌ, وَالَّذِى يَمُوتُ تَحْتَ الْهَدْمِ شَهِيدٌ, وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهِيدٌ).

واتە: لە جابری کوڕی عەتیکەوە دەگێڕنەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی (ثابت)ی کرد، بینی نزیك بۆتەوە لە مردن، قسەی لەگەڵ کرد هەتا بزانێ لەژیاندا ماوە یان نا، وەڵامی نەدایەوە، (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُون)ی کردو فەرمووی: (روحت دەرچو پێش ئەوەی بە زیندوێتی بگەینە سەرت ئەی باوکی رەبیع)، جا ئافرەتان دەنگی

بەرزبووەوەو گریان، ئیبنو عەتیك بێ دەنگی کردن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (وازیان لێ بێنن چونکە گریانەکەیان نەگەیشتۆتە رادەی شیوەن و رِۆ رِۆو هاوار کردن، کاتێ کە مرد با شیوەن و رِۆ رِۆ نەکەن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (وجوب) مانای چی یە؟ فەرمووی: (واتە: مردن)، کورەکەی وتی: (سوێند بە (الله) هیوادارم شەهیدی ناو جەرگەی گۆرەپانی جەنگ بێ چونکە بە تەواوی خۆی ئامادەکردبوو بۆ جەنگ و جیهاد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە بەپێی نیەتی خۆی پاداشتی دەداتەوە، ئێوە چ شتێ بەشەهیدی حساب دەکەن؟)، وتیان: کوژران لە پێناوی خوای گەورەدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (جگە لە کوژران لە پێناوی خوای گەورەدا شەهیدی حەوت جۆرە: ئەو کەسەی کە بە نەخۆشی (طاعون) بمرێت، خنکان لەناو ئاودا شەهیدە، ئەوەی بە نەخۆشی سیل مردوە شەهیدە، ئەوەی بە سك ئێشە مردوە شەهیدە، ئەوەی بەهۆی سوتانەوە مردوە شەهیدە، ئەو کەسەی لەژێر شتی روخاودا بمرێت شەهیدە، ئەو ژنەی کە سکی هەبێت بمرێت و منداڵەکەی لەسکدا بێت شەهیدە).

## باسی نینۆککردن و لابردنی مووی شەرمگەی نەخۆش

### ١٦ - باب الْمَرِيضِ يُؤْخَذُ مِنْ أَظْفَارِهِ وَعَانَتِهِ.

٣١١٢ - (صحيح) عن أبي هريرة, قال: ابْتَاعَ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ خُبَيْبًا - وَكَانَ خُبَيْبٌ, هُوَ قَتَلَ الْحَارِثَ بْنَ عَامِرٍ يَوْمَ بَدْر - فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيرًا, حَتَّى أَجْمَعُوا لِقَتْلِهِ, فَاسْتَعَارَ مِنَ ابْنَةِ الْحَارِثِ مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا, فَأَعَارَتْهُ, فَدَرَجَ بُنَيٌّ لَهَا وَهِيَ غَافِلَةٌ حَتَّى أَتَتْهُ فَوَجَدَتْهُ مُخْلِيًا وَهُوَ عَلَى فَخِذِهِ وَالْمُوسَى بِيَدِهِ فَفَزِعَتْ فَزْعَةً عَرَفَهَا فِيهَا, فَقَالَ: أَتَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ مَا كُنْتُ لأَفْعَلَ ذَلِكَ!. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: رَوَى هَذِهِ الْقِصَّةَ شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ, عَنِ الزُّهْرِيِّ, قَالَ أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عِيَاضٍ, أَنَّ ابْنَةَ الْحَارِثِ أَخْبَرَتْهُ, أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا - يَعْنِي لِقَتْلِهِ - اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا, فَأَعَارَتْهُ.

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خوبەیب و هاوڕێکانی بە دیل گیران کافرەکان خوبەیبیان برد بۆ مەککە لەوێ فرۆشتیان، کوڕەکانی (حارث)ی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەل خوبەیبیان کڕی بۆ ئەوەی لەتۆڵەی باوکیاندا بیکوژنەوە - لەبەرئەوەی لە جەنگی بەدردا (حارث)ی کوڕی عامیری باوکیان بە دەستی خوبەیب کوژرابوو - خوبەیب بەدیلی لەلایان مایەوە هەتا هەموویان کۆبوونەوەو سووربوون لەسەر ئەوەی کە بیکوژن، جا خوبەیب داوای تیغێکی کرد لە کچێکی (حارث) هەتا مووی شەرمگەی پێ لابات، ئەویش تیغێکەی دایە، کچەکەی (حارث) منداڵێکی بچوکی هەبوو ئاگای لێی نەبوو بە گاگۆڵکێ خۆی گەیاندە لای خوبەیب، جا خوبەیب لەسەر رانی خۆی داینا و تیغەکەی بەدەستەوەبوو کاتێ کە دایکەکە بەو شێوەیە منداڵەکەی بینی زۆرترساو زەندەقی چو، خوبەیب وتی: ئەوە دەترسی بیکوژم؟ من هەرگیز شتی وەها ناکەم. ئەبو داود دەڵێت: شوعەیبی کوڕی ئەبو حەمزە ئەم بەسەرهاتەی لە زوهریەوە گێڕاوەتەوە، وتی: (عبید الله)ی کوڕی (عیاض) هەواڵی پێدام کە کوڕێکی (حارث) بۆی گێڕاوەتەوە، کاتێ کە ئەوان واتە کوڕەکانی (حارث)ی کوڕی عامیر کۆبوونەوە - بۆ کوشتنی خوبەیب - خوبەیب داوای تیغێکی کرد هەتا مووی شەرمگەی پێ لابات، ئەوانیش تیغێکیان دایە.

## باسی گومانی باش بردن بە خوای گەورە لەکاتی مردندا.

## ١٧ - باب مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ حُسْنِ الظَّنِّ بِاللَّهِ عِنْدَ الْمَوْتِ.

٣١١٣ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلَاثٍ, قَالَ: (لاَ يَمُوتُ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیست لەپێش مردنی بەسێ

رۆژ فەرمووی: (هیچ کەسێ لەئێوە نەمرێ هەتا گومانی باش دەبێت بە خوای گەورە). - واتە بە هیوای ئەوە بێت کە خوای پەروەردگار لەتاوانەکانی دەبوورێت و لێی خۆش دەبێت - .

## باسی باشی پاککردنەوەی پۆشاکی مردو لەکاتی مردنیدا.

## ١٨ - باب مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ تَطْهِيرِ ثِيَابِ الْمَيِّتِ عِنْدَ الْمَوْتِ.

٣١١٤ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري, أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ دَعَا بِثِيَابٍ جُدُدٍ فَلَبِسَهَا, ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ الْمَيِّتَ يُبْعَثُ فِي ثِيَابِهِ الَّتِي يَمُوتُ فِيهَا).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە: کە لەکاتی سەرەمەرگدا داوای جل و بەرگە تازەکانی کرد بۆیان هێنا لەبەری کرد، پاشان وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بێگومان مردوو بەو پۆشاك و جل و بەرگەوە زیندو دەکرێتەوە کە کاتێك مردووە لەبەریدا بووە).

## باسی چی باشە بووترێت لەلای مردودا.

## ١٩ - باب مَا يُسْتَحَبُّ أَنْ يُقَالَ عِنْدَ الْمَيِّتِ مِنَ الْكَلَامِ.

٣١١٥ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا, فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ).فَلَمَّا مَاتَ أَبوو سَلَمَةَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَقُولُ؟ قَالَ: (قُولِي: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ, وَأَعْقِبْنَا عُقْبَى صَالِحَةً). قَالَتْ: فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ تَعَالَى بِهِ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئومموو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەسەرەمەرگی کەسێك یان لەکاتی مردنیدا ئامادەبوون، ئەوا قسەی خێر بکەن، لەبەرئەوەی مەلائیکەکانی خوای پەروەردگار ئامینی لەسەر دەکەن) - کەواتە بۆی بپارێنەوەو (لا اله الا الله) بکەن بەڵکو ئەویش بیڵێ -، کاتێ کە ئەبو سەلەمە مرد وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی بڵێم؟ فەرمووی: (بڵێ: خوایە لیی خۆشبە، وە جێگەکەی پڕبکەیتەوە بۆم بەچاکتر). وتی: ئەوە بوو خوای گەورە جێگەکەی پڕکردەوە بۆم بەچاکتر لەجیاتی ئەو موحەممەدی صلی الله علیه وسلم کردە هاوسەرم.

## باسی دەربارەی تەڵقینی مردو.

## ٢٠ - باب فِي التَّلْقِينِ.

| ٣١١٦ - (صحيح) عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ). |
|---|

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ دوا وتەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) بێت دەچێتە بەهەشتەوە).

| ٣١١٧ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ قَوْلَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). |
|---|

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە: کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسانەتان کە لە سەرەمەرگدان وتەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) بدەن بە گوێیاندا).

# باسی داخستنی چاوەکانی مردو

## ٢١ - باب تَغْمِيضِ الْمَيِّتِ.

٣١١٨ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ, فَصَيَّحَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ, فَقَالَ: (لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ بِخَيْرٍ, فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ). ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِي سَلَمَةَ, وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ, وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ, وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ رَبَّ الْعَالَمِينَ, اللَّهُمَّ افْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ, وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَتَغْمِيضُ الْمَيِّتِ بَعْدَ خُرُوجِ الرُّوحِ, سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ النُّعْمَانِ الْمُقْرِئَ, قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مَيْسَرَةَ رَجُلاً عَابِدًا يَقُولُ: غَمَّضْتُ جَعْفَرًا الْمُعَلِّمَ وَكَانَ رَجُلاً عَابِدًا فِي حَالَةِ الْمَوْتِ, فَرَأَيْتُهُ فِي مَنَامِي لَيْلَةَ مَاتَ يَقُولُ: أَعْظَمُ مَا كَانَ عَلَيَّ تَغْمِيضُكَ لِي قَبْلَ أَنْ أَمُوتَ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە لای ئەبو سەلەمە کاتی ڕۆح دەرچونی چاوەکانی کرابوونەوە، چاوەکانی داخست، کەسوکاری ئەبوو سەلەمە شڵەژان و کردیان بە هاوت و هاوار، فەرمووی: (دوعا لە خۆتان مەکەن بە خێر نەبێت، لەبەرئەوەی مەلائیکە (آمین)ی لەسەر پاڕانەوەکانتان دەکەن)، لەپاشدا فەرمووی: (خوایە لە ئەبوو سەلەمە خۆشبە، لەناو هیدایەت دراواندا پلەوپایەی بەرزبکەرەوە، جێگەی پڕبکەرەوە بۆ ئەوانەی کە لەدوای بەجێماون، ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانیان لە ئێمەش و لەویش خۆشبە، گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە، روناکی بکەرەوە پڕی بکە لە نور بۆی). ئەبو داود دەڵێت: وە داخستنی چاوەکانی مردو لەدوای روح دەرچونی، بیستم لە موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی نوعمانی (مُقْرِئَ) وتی: لە ئەبوو مەیسەرەم بیستوە کە بەندەیەکی خواناس بوو دەیوت: چاوەکانی جەعفەری مەعەلیمم داخست کە پیاوێکی خواناس بوو، ئەو شەوەی کە مرد لەخەومدا بینیم دەیوت: داخستنی چاوەکانم لەلایەن تۆوە گەورەترین شت بوو بۆ من.

## باسی دەربارەی وتنی: ( إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ). لەکاتی توشبوونی بەلاو موسیبەتدا.

## ٢٢ - باب فِي الِاسْتِرْجَاعِ.

٣١١٩ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: قال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: (إِذَا أَصَابَتْ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَقُلْ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). اللَّهُمَّ عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيبَتِي, فَآجِرْنِي فِيهَا, وَأَبْدِلْ لِي خَيْرًا مِنْهَا).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚرنەوە، کە وتویەتی: پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسیٚ لە ئیٚوە توشی بەلاٌو موسیبەتیٚ بوو با بلٚیٚ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). واتە: ئیٚمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕیٚینەوە. خوایە داوای پاداشتت لیٚ دەکەم و بە هیوای پاداشتی تۆم، تۆش پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم بەلاٌو موسیبەتە، شتیٚکم توش بکە لەوە چاکتر بیٚت.

## باسی سەبارەت بە داپۆشینی مردو.

## ٢٣ - باب فِي الْمَيِّتِ يُسَجَّى.

٣١٢٠ - (صحيح) عن عائشة, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُجِّيَ فِي ثَوْبٍ حِبَرَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚرنەوە، کە پیٚغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە مرد بە پۆشاکیٚکی یەمەنی دایانپۆشی کە لە لۆکە یان لە کەتان دروست دەکرا.

## باسی خوێندنی سورەتی یاسین بەسەر مردودا.

## ٢٤ - باب الْقِرَاءَةِ عِنْدَ الْمَيِّتِ.

٣١٢١ - (ضعيف) عن معقل بن يسار قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (اقْرَءُوا (يس) عَلَى مَوْتَاكُمْ).

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سورەتی یاسین بخوێنن بەسەر مردوانتاندا).

## باسی دانیشتن لەکاتی توشبوونی بەڵاو موسیبەتدا.

## ٢٥ - باب الْجُلُوسِ عِنْدَ الْمُصِيبَه.

٣١٢٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: لَمَّا قُتِلَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٌ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ, جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ الْحُزْنُ, وَذَكَرَ الْقِصَّةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە زەیدی کوڕی (حارثة) و جەعفەر و (عبد الله) کوڕی ڕەواحە سەرکردەکانی جەنگی (مؤتة) کوژران، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوت دانیشت خەم و پەژارە بە ڕوخساریەوە دیار بوو بۆ کوژرانی ئەوانە - بێگومان پێشوازی لە خەڵك نەکرد وەك ئەوەی کە ئەمڕۆ دەکرێت، بەڵکو بێ تاقەتی کوژرانی ئەو سەرکردە بەڕێزانە بوو -، جا ڕاوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە.

# باسی سەبارەت سەرخۆشیکردن

## ٢٦ - باب فِي التَّعْزِيَةِ.

٣١٢٣ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: قَبَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِى مَيِّتًا - فَلَمَّا فَرَغْنَا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَانْصَرَفْنَا مَعَهُ, فَلَمَّا حَاذَى بَابَهُ وَقَفَ, فَإِذَا نَحْنُ بِامْرَأَةٍ مُقْبِلَةٍ, - قَالَ: أَظُنُّهُ عَرَفَهَا - فَلَمَّا ذَهَبَتْ إِذَا هِىَ فَاطِمَةُ - عَلَيْهَا السَّلاَمُ - فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَخْرَجَكِ يَا فَاطِمَةُ مِنْ بَيْتِكِ؟). فَقَالَتْ: أَتَيْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَهْلَ هَذَا الْبَيْتِ فَرَحَّمْتُ إِلَيْهِمْ مَيِّتَهُمْ, أَوْ عَزَّيْتُهُمْ بِهِ, فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَلَعَلَّكِ بَلَغْتِ مَعَهُمُ الْكُدَى). قَالَتْ: مَعَاذَ اللَّهِ!! وَقَدْ سَمِعْتُكَ تَذْكُرُ فِيهَا مَا تَذْكُرُ, قَالَ: (لَوْ بَلَغْتِ مَعَهُمُ الْكُدَى). فَذَكَرَ تَشْدِيدًا فِي ذَلِكَ, فَسَأَلْتُ رَبِيعَةَ عَنِ الْكُدَى, فَقَالَ: الْقُبوورُ فِيمَا أَحْسِبُ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم مردویەكمان ناشت كاتێ كە گەڕاینەوە لەبەردەم دەرگای ماڵی خۆیان راوەستا ئافرەتێكی بینی بەرەو ماڵی خۆیان دەهات: وتی پێمان وابوو ناسیبێتی — كاتێ كە پێی گەیشت سەیرمان كرد (فاطمة)ی كچی خۆیەتی سەلامی خوای لەسەر بێ، پێی فەرموو: (ئەی (فاطمة) كچی خۆم چی تۆی لەماڵەوە هێناوەتەدەر؟)، وتی: هاتم بۆلای كەسوكاری ئەم ماڵە بەزەیم پێیاندا هاتەوە سەرخۆشیم لێ كردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (لەوانەیە لەگەڵ ئەواندا گەیشتبێتە گۆڕستانەكە)، وتی: (معاذ الله)پەنا بەخوا گوێم لێ بووە لەوبارەوە چی و چیت باسكردوە - واتە لەبارەی چوونی ئافرەتان بۆ گۆڕستان و شوێنكەوتنی جەنازە لەلایەن ئافرەتانەوە -، فەرمووی: (ئەگەر لەگەڵ ئەواندا گەیشتبێتە گۆڕستانەكە)، باسی هەڕەشەی توندی لەوبارەوە كرد سەبارەت بە (كدی) لە رەبیعەم پرسی، وتی: پێم وایە گۆڕەكان بێ.

## باسی ئارامگرتن لەسەرەتای لێ قەومان و کارەساتەوە

## ٢٧ - باب الصَّبْرِ عِنْدَ الصَّدْمَةِ.

٣١٢٤ - (صحيح) عن أنس قال: أَتَى نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا, فَقَالَ لَهَا: (اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي). فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِي أَنْتَ بِمُصِيبَتِي؟ فَقِيلَ لَهَا: هَذَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ! فَأَتَتْهُ, فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بووابِينَ, فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, لَمْ أَعْرِفْكَ, فَقَالَ: (إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى). أَوْ (عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ژنێ لەسەر گۆڕی منداڵێکی دەگریا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە لای پێی فەرموو: (لەخوا بترسەو ئارام بگرە)، ژنەکە وتی: جا تۆ چ دەربەستی لێ قەومان و کارەساتی منی؟ کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆیشت، پێی وترا: ئەوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو، چو بۆ ماڵی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبەردەم دەرگاکەیدا دەرگەوانی نەبینی چووە ژورەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، نەمناسیت، فەرمووی: (ئارامگرتن دەبێت لەسەرەتای لێ قەومانەوە بێت)، یان فەرمووی: (دەبێت لەیەکەم جاری لێ قەومانەوە بێت).

## باسی سەبارەت بە گریان بۆ مردو

## ٢٨ - باب فِي الْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ.

٣١٢٥ - (صحيح) عن أسامة بن زيد: أَنَّ ابْنَةً لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِ وَأَنَا مَعَهُ وَسَعْدٌ, وَأَحْسِبُ أُبَيًّا: أَنَّ ابْنِي أَوْ بِنْتِي قَدْ حُضِرَ فَاشْهَدْنَا, فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ, فَقَالَ: (قُلْ: لِلَّهِ مَا أَخَذَ, وَمَا أَعْطَى, وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ إِلَى أَجَلٍ). فَأَرْسَلَتْ تُقْسِمُ عَلَيْهِ, فَأَتَاهَا, فَوُضِعَ الصَّبِيُّ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ, فَفَاضَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: مَا هَذَا؟ قَالَ: (إِنَّهَا رَحْمَةٌ, وَضَعَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ مَنْ يَشَاءُ, وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ).

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، کە یەکێ لە کچەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نێردراوێکدا هەواڵی نارد بۆ باوکی و گوتی: کوڕێك یان کچێکم خەریکە ئەمرێ بابێ بۆ لامان، لەوکاتەدا من و سەعد لە خزمەتیدا بووین، پێم وایە ئوبەی کوڕی کەعبیششمان لەگەڵ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نێردراوەکەدا سڵاوی بۆ ناردوو فەرمووی: (بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ: خوای گەورە خۆی خاوەنی ئەو شتەیە کە ئەیباتەوەو خاوەنی ئەوەشە کە ئەیبەخشێ، هەموو شتێك لای خوای پەروەردگار کاتێکی دیاریکراوی هەیە)، ئەویش جوابی ناردەوە بۆ باوکی وتی پێی رابگەیەنن کە سوێندی لەسەر خواردووی کە دەبێت ئامادەبیت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا رۆشت بۆ ماڵی کچەکەی، مناڵەکەیان خستە باوەشی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، مناڵەکە دەستیکرد بەجوڵان و نارەحەت بوو باری تێکچوو خەریك بوو دەمرد، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاوەکانی پڕبوو لە فرمێسك، سەعد وتی: ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: (ئەوە رەحم و بەزەیی خواییە دەیخاتە دڵی هەر کەسێك کە بیەوێت لەبەندەکانی، بەڕاستی خوای گەورە بەزەیی بەو بەندانەدا دێتەوە کە خاوەنی سۆزو بەزەیین).

٣١٢٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وُلِدَ لِيَ اللَّيْلَةَ غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي: إِبْرَاهِيمَ). فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, قَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَكِيدُ بِنَفْسِهِ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَدَمَعَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (تَدْمَعُ الْعَيْنُ, وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ, وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا, إِنَّا بِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەمشەو کوڕێکمان بووم ناوم نا ئیبراهیم بەناوی باوکمەوە). جا راوی فەرموودەکەی باس کرد، ئەنەس وتی: بەڕاستی بینیم لە مردن نزیك بوویەوە لەبەردەست پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، چاوەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فرمێسکیان پێدا دەهاتەخوارەوە، فەرمووی: (چاوەکان فرمێسك دەڕێژن و، دڵیش تەنگ دەبێت و، ئێمە هیچ شتێك ناڵێین شتێك نەبێت کە خوای پەروەردگار پێی رازی بێت، ئەی ئیبراهیم ئێمە بە مردنی تۆ دڵ تەنگ و خەمبارین).

## باسی سەبارەت بە شیوەن و گریان و لاواندنەوە.

### ٢٩ - باب فِي النَّوْحِ.

٣١٢٧ - (صحيح) عن أم عطية قالت: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا عَنِ النِّيَاحَةِ.

واتە: لە ئوممو (عطية)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شیوەنکردن و لاواندنەوەی بۆ مردو لێ قەدەغەکردوین.

٣١٢٨ - (ضعيف الاسناد) عن أبو سعيد الخدرى قال: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّائِحَةَ وَالْمُسْتَمِعَةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لە ژنی شیوەنگێڕ و لەو ژنەش کە گوێی بۆ دەگرێت.

٣١٢٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ). فَذُكِرَ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ, فَقَالَتْ: وَهِلَ - تَعْنِى ابْنَ عُمَرَ -, إِنَّمَا مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى قَبْرٍ فَقَالَ: (إِنَّ صَاحِبَ هَذَا لَيُعَذَّبُ وَأَهْلُهُ يَبْكُونَ عَلَيْهِ). ثُمَّ قَرَأَتْ: (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) قَالَ عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ: عَلَى قَبْرِ يَهُودِيٍّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مردو لەسەر گریان و شیوەن و زاری کەسوکارەکەی کە دەیکەن لەسەری سزاو ئازار دەدرێت). - جەماوەری زانایان دەڵێن: ئەگەر خۆی وەسیەتی کردبێ شیوەن و زاری بۆ بکەن ئەو کاتە سزاو ئازار دەدرێت لەسەری[١]-. ئەوەیان باسکرد بۆ عائیشە وتی: ئیبنو عومەر هەڵەی کردو لەبیری چۆتەوە، راستیەکەی ئەمەیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دای بەلای گۆڕی جولەکەیەکدا - فەرمووی: (خاوەنی ئەم گۆڕە سزاو ئازار دەدرێت لەسەر ئەو گریان و شیوەن و زاریەی کە ئێستا کەسوکارەکەی دەیکەن لەسەری). - لەسەر کوفرەکەی نەك لەسەر ئەو گریان و شیوەن و زاریەی کە کەسوکارەکەی دەیکەن لەسەری[٢]-، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾. سورە الأنعام: ١٦٤.
واتە: وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێ.
لە رێوایەتێکدا راوی وتی: لە ئەبوو موعاویەوە هاتوە کە: دای بەلای گۆڕی جولەکەیەکدا.

(١) - عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي: ٥/ ٣٣, علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).
(٢) - عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي: ٥/ ٣٣, علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).

٣١٣٠ - (صحيح) عن يزيد بن أوس قال: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي مُوسَى وَهُوَ ثَقِيلٌ, فَذَهَبَتِ امْرَأَتُهُ لِتَبْكِي, أَوْ تَهُمَّ بِهِ, فَقَالَ لَهَا أَبوو مُوسَى: أَمَا سَمِعْتِ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: بَلَى, قَالَ: فَسَكَتَتْ, فَلَمَّا مَاتَ أَبو مُوسَى - قَالَ يَزِيدُ :- لَقِيتُ الْمَرْأَةَ فَقُلْتُ لَهَا: مَا قَوْلُ أَبِي مُوسَى لَكِ, أَمَا سَمِعْتِ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ سَكَتِّ؟ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :(لَيْسَ مِنَّا مَنْ حَلَقَ وَمَنْ سَلَقَ وَمَنْ خَرَقَ).

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئەوسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ لای ئەبو موسا لەوکاتەدا زۆر نەخۆش بوو، ژنەکەی رۆشت بگری بۆی، ئەبو موسا پێی وت: ئایا نەتبیستوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە چی فەرموو؟ وتی: بەڵێ بیستومە، راوی وتی: ژنەکەی ئەبو موسا بێدەنگ بوو، کاتێ کە ئەبو موسا مرد - یەزید وتی: - گەیشتم بە ژنەکەی ئەبو موسا پێم وت: وتەکەی ئەبو موسا چی بوو کە پێی وتی: ئایا نەتبیستوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە چی فەرموو، لە پاشدا بێدەنگ بووی؟، ژنەکەی ئەبو موسا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو کەسەی قژی خۆی بتاشێ و بە دەنگی بەرز بگری هات و هاوار بکات لەکاتی بەڵاو موسیبەتداو شیوەن بگێڕێ و پۆشاکی خۆی دادڕێت لە ئێمە نیە واتە لەسەر رێگەو سوننەتی ئێمە نیە).

٣١٣١ - (صحيح) عن أسيد بن أبو أسيد, عَنِ امْرَأَةٍ مِنَ الْمُبَايِعَاتِ, قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَعْرُوفِ الَّذِي أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ لاَ نَعْصِيَهُ فِيهِ: أَنْ لاَ نَخْمِشَ وَجْهًا, وَلاَ نَدْعُوَ وَيْلاً, وَلاَ نَشُقَّ جَيْبًا, وَأَنْ لاَ نَنْشُرَ شَعْرًا.

واتە: لە ئەسیدی کوڕی ئەبو ئەسیدەوە، لە یەکێ لەو ژنانەوە کە بەڵێن و پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵێنی لێ وەرگرتین ئەمە بوو کە سەرپێچی نەکەین لەمانەدا: لەکاتی بەڵاو موسیبەتدا روخساری خۆمان نەڕوشێنین، شین و واوەیلا نەکەین، یەخەی خۆمان نەدڕێنین و، قژمان پەرش و بڵاو نەکەینەوە.

## باسی دروستکردنی خواردن بۆ کەسوکاری مردو.

## ٣٠ - باب صَنْعَةِ الطَّعَامِ لأَهْلِ الْمَيِّتِ.

٣١٣٢ - (حسن) عن عبد الله بن جعفر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا, فَإِنَّهُ قَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ شَغَلَهُمْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خواردنێك دروستکەن بۆ کەسوکاری جەعفەر و بۆیان بنێرن لەبەرئەوەی چونکە شتێکیان بەسەرهاتووە کە بەراستی سەرقاڵی کردوون و دڵگرانن). - ئەمەش لەکاتێکدا فەرمووی کە جەعفەر ڕەزای خوای لێ بێ لە جەنگی (مؤتة)دا شەهید بوو بوو - .

## باسی دەربارەی ئایا شەهید دەشۆردرێ یان نا؟

## ٣١ - باب فِي الشَّهِيدِ يُغَسَّلُ.

٣١٣٣ - (حسن) عن جابر قال: رُمِيَ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فِي صَدْرِهِ أَوْ فِي حَلْقِهِ فَمَاتَ فَأُدْرِجَ فِي ثِيَابِهِ كَمَا هُوَ - قَالَ - وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین، تیرێ دای لە سنگی یان لە گەرووی پیاوێك و بە هۆی ئەو تیرەوە مرد بە پۆشاکەکانی خۆی پێچایانەوەو خستیانە ناوگۆڕەکەیەوە واتە نەشۆردرا - .

٣١٣٤ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلَى أُحُدٍ أَنْ يُنْزَعَ عَنْهُمُ الْحَدِيدُ وَالْجُلُودُ, وَأَنْ يُدْفَنُوا بِدِمَائِهِمْ وَثِيَابِهِمْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بە کوژراوانی جەنگی ئوحود فەرمانی کرد زرێ و پێستەکانیان لێ بکەنەوە - پێستەکانیان وەك فەروو کە خوێناوی نەبووبێ - جا بە خوێن و پۆشاکی خوێناویەوە بە خاکیان بسپێرن.

٣١٣٥ - (حسن) عن أنس بن مالك: أَنَّ شُهَدَاءَ أُحُدٍ لَمْ يُغَسَّلُوا, وَدُفِنُوا بِدِمَائِهِمْ, وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە شەهیدانی جەنگی ئوحود نەشۆردران و بە خوێن و جل و بەرگی خوێناویەوە بە خاکیان سپاردن و نوێژیشیان لەسەر نەکردن.

٣١٣٦ - (حسن) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى حَمْزَةَ وَقَدْ مُثِّلَ بِهِ فَقَالَ: (لَوْلاَ أَنْ تَجِدَ صَفِيَّةُ فِي نَفْسِهَا لَتَرَكْتُهُ حَتَّى تَأْكُلَهُ الْعَافِيَةُ حَتَّى يُحْشَرَ مِنْ بُطُونِهَا). وَقَلَّتِ الثِّيَابُ وَكَثُرَتِ الْقَتْلَى, فَكَانَ الرَّجُلُ وَالرَّجُلاَنِ وَالثَّلاَثَةُ يُكَفَّنُونَ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ - زَادَ قُتَيْبَةُ -: ثُمَّ يُدْفَنُونَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُ: (أَيُّهُمْ أَكْثَرُهُمْ قُرْآنًا). فَيُقَدِّمُهُ إِلَى الْقِبْلَةِ..

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای تەرمی حەمزەدا بینی هەتك کراوە و گوێ و لوتی براوە فەرمووی: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت شتێك لە دلێ صەفیەدا دروست ببێت هەر بەو شێوەیە بەجێم ئەهێلا بۆئەوەی دڕندەو باڵندەکان بیانخواردایە، خوای گەورەش لەدڵی ئەو دڕندەو باڵندانەدا کۆی بکرادایەتەوە). ئەو ڕۆژەدا کوژراوێکی زۆر بوو بەڵام پۆشاك و جل و بەرگ کەم بوو بۆ کفن، بۆیە دوو کەس و سێ کەسی لەیەك پارچەدا کفن دەکرد - بێگومان خۆشیان

جل و بەرگیان پێوە بووە ئەگەر کەمیش بووبێت -، - راوی فەرموودەکە قوتەیبە ئەمەی بۆ زیاد کرد - لەپاشدا لە گۆڕێکدا کۆی دەکردنەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری دەکرد: (کامەیان زیاتر قورئانی لەبەر بوو). ئەوەیان قورئانی زیاتر لەبەر بووایە پێشی دەخست بەرەو قیبلە.

٣١٣٧ - (حسن) عن أنس بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِحَمْزَةَ وَقَدْ مُثِّلَ بِهِ, وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنَ الشُّهَدَاءِ غَيْرِهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە رۆژی جەنگی ئوحوددا دای بەلای تەرمی حەمزەدا بینی هەتك کراوە و گوێ و لوتی بڕاوە، جگە لە حەمزە نوێژی لەسەر هیچ کەس لەو شەهیدانەی تر نەکرد.

٣١٣٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ, وَيَقُولُ: (أَيُّهُمَا أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟). فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ, وَقَالَ: (أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ وَلَمْ يُغَسَّلُوا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کوژراوانی جەنگی ئوحودی دوو دوو پێکەوە کۆدەکردنەوەو دەیخستنە یەك گۆڕەوەو، دەیفەرموو: (کامەیان قورئانی زیاتر لەبەر بوو؟). ئەگەر ئاماژە بکرایە بۆ هەر یەکێکیان ئەوەیانی پێش ئەوانی تر دەخستە ناو گۆڕەکەوە لای قیبلەوەو، دەیفەرموو: (لە رۆژی قیامەتدا من خۆم شایەتیان بۆ دەدەم کە گیانی خۆیان بەخت کرد لە پێناوی خوای پەروەردگاردا). جا فەرمانی کرد نەیانشۆرن و بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن.

٣١٣٩ - (صحيح) عن الليث: بهذ الحديث بمعناه, قال: يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە (ليث)ەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کوژراوانی جەنگی ئوحودی دوو دوو پێکەوە لە گۆڕێکدا کۆدەکردنەوە بێگومان خۆیان پۆشاکیان لەبەردا بووە با کەمیش بووبێت ئەوانیش پارچەیەکی تریان بۆ دەکردن بە کفن.

## باسی دەربارەی داپۆشینی مردو لەکاتی شۆردنی دا.

## ٣٢ - باب فِي سَتْرِ الْمَيِّتِ عِنْدَ غَسْلِهِ.

٣١٤٠ - (ضعيف جدا) عن علي: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُبْرِزْ فَخِذَكَ, وَلاَ تَنْظُرَنَّ إِلَى فَخِذِ حَيٍّ وَلاَ مَيِّتٍ).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕانت دەرمەخەو، سەیری ڕانی زیندو مردویش مەکە).

٣١٤١ - (حسن) عن عباد بن عبد الله بن الزبير قال: سمعت عائشة تقول: لَمَّا أَرَادُوا غَسْلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا نَدْرِي أَنُجَرِّدُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ثِيَابِهِ كَمَا نُجَرِّدُ مَوْتَانَا أَمْ نُغَسِّلُهُ وَعَلَيْهِ ثِيَابُهُ؟ فَلَمَّا اخْتَلَفُوا أَلْقَى اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّوْمَ حَتَّى مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ إِلاَّ وَذَقْنُهُ فِي صَدْرِهِ, ثُمَّ كَلَّمَهُمْ مُكَلِّمٌ مِنْ نَاحِيَةِ الْبَيْتِ لاَ يَدْرُونَ مَنْ هُوَ: أَنِ اغْسِلُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ ثِيَابُهُ, فَقَامُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَغَسَلُوهُ وَعَلَيْهِ قَمِيصُهُ يَصُبُّونَ الْمَاءَ فَوْقَ الْقَمِيصِ, وَيُدَلِّكُونَهُ بِالْقَمِيصِ دُونَ أَيْدِيهِمْ. وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا غَسَّلَهُ إِلاَّ نِسَاؤُهُ.

واتە: لە عەببادی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە عائیشە بوو دەیوت: کاتێ کە ویستیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بشۆن وتیان: سوێند بە (الله) نازانین جل و بەرگەکەی لەبەر داکەنین و روتی بکەینەوە وەك چۆن مردووەکانی تر روت دەکەینەوە یان هەر بە جل و بەرگەکەی خۆیەوە بیشۆین؟ کاتێ کە لەوبارەوە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە خوای پەروەردگار خەوی لێخستن بە جۆرێ هەر هەموویان سەریان بەسەر سنگیاندا شۆڕبووبووەوە، لەپاشدا قسەکەرێ لە گۆشەی ماڵەکەوە بەبێ ئەوەی کە بزانن کێ یە وتی: تەرمی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە جل و بەرگەکەی خۆیەوە بشۆن، ئەوانیش هەستان چون بەلای تەرمەکەی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هەر بە جل و بەرگەکەی خۆیەوە شۆردیان ئاویان دەکرد بە سەر کراسەکەیداو بەسەر کراسەکەوە دەستیان لە لاشەی دەخست، عائیشە وتی: تازە لەدەستم دەرچوو ئەگەر ئەقڵی ئێستام هەبووایە دەبوو کەسی تر نەیشۆردایە جگە لە ژنەکانی.

## باسی چۆنیەتی شۆردنی مردو.

## ٣٣ - باب كَيْفَ غُسْلُ الْمَيِّتِ.

٣١٤٢ - (صحيح) عن أم عطية, قالت: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ, فَقَالَ: (اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا, أَوْ خَمْسًا, أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ, إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ, بِمَاءٍ وَسِدْرٍ, وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا, أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي). فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ فَأَعْطَانَا حَقْوَهُ فَقَالَ: (أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ). قَالَ: عَنْ مَالِكٍ يَعْنِي إِزَارَهُ, وَلَمْ يَقُلْ مُسَدَّدٌ: دَخَلَ عَلَيْنَا.

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە کچەکەی مرد هاتە ژورەوە بۆ لامان، فەرمووی: (بە ئاو و مۆرد بیشۆن سێ جار یان پێنج جار یا زیاتر، لەدوا جاردا کافور یان شتێ لە کافوری تێ بکەن، کاتێ کە لێ بوونەوە ئاگادارم بکەنەوە). کاتێ کە لێ بووینەوە

ئاگادارمان کردەوە، ئەویش کراس(ئیزار)ەکەی خۆی هەڵدا بۆمان فەرمووی: (بیکەن بە ژێر کراس بۆی)، راوی وتی: لە مالیکەوە هاتوە واتە کراس(ئیزار)ەکەی خۆی، موسەددەد نەیوت: هاتە ژوورەوە بۆ لامان.

٣١٤٣ - (صحيح) عن أم عطية, قالت: مَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ.

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: قژمان بۆ داهێناو کردمان بە سێ پەلکەوە.

٣١٤٤ - (صحيح) عن أم عطية, قالت: وَضَفَّرْنَا رَأْسَهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ, ثُمَّ أَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا: مُقَدَّمَ رَأْسِهَا وَقَرْنَيْهَا.

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: قژمان بۆ داهێناو کردمان بە سێ پەلکەوەو، بە پشتیا شۆڕمان کردەوە: پشتی سەری و هەردوو لای سەری.

٣١٤٥ - (صحيح) عن أم عطية, قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُنَّ فِي غُسْلِ ابْنَتِهِ: (ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا).

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی شۆردنی کچەکەیدا پێی فەرموون: (لە ئەندامە راستەکانیەوە و لە ئەندامەکانی دەستنوێژەوە دەست پێ بکەن).

٣١٤٦ - (صحيح) عن أم عطية: بِمَعْنَى حَدِيثِ مَالِكٍ, زَادَ فِي حَدِيثِ حَفْصَةَ, عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ بِنَحْوِ هَذَا, وَزَادَتْ فِيهِ: (أَوْ سَبْعًا, أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّهُ).

واتە: لە (أم عطية)وە بە هەمان مانای فەرموودەکەی مالیك هاتوە، راوی لە فەرموودەکەی حەفصەدا لە (أم عطية)وە بە هەمان شێوە گێراویەتیەوە، ئەمەی بۆ زیاد کردوە: (یان حەوت جار یا زیاتر ئەگەر بە پێویستان زانی).

٣١٤٧ - (صحيح) عن أم عطية: يَغْسِلُ بِالسِّدْرِ مَرَّتَيْنِ, وَالثَّالِثَةَ بِالْمَاءِ وَالْكَافُورِ.

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێرنەوە، کە دوو جار بە مۆرد بیشۆن و، سێیەم جار بە ئاو و کافور.

## باسی سەبارەت بە کفن کردن

## ٣٤ - باب فِي الْكَفَنِ.

٣١٤٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله يحدث: عن النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ خَطَبَ يَوْمًا, فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ قُبِضَ فَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ وَقُبِرَ لَيْلاً, فَزَجَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُقْبَرَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ, إِلاَّ أَنْ يُضْطَرَّ إِنْسَانٌ إِلَى ذَلِكَ, وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحْسِنْ كَفَنَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە، کە ڕۆژێکیان لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەخوێندەوە، باسی یەکێ لە هاوەڵانی کرد کە مردبوو، کفنێکی تێر و تەسەل و پوختی بۆ نەکرابوو، بە شەویش نێژرابوو، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرزەنشتی ئەوەی کرد کە مردو بەشەو بنێژرێت هەتا نوێژی لەسەر نەکرێت، مەگەر لەبەر ناچاری، پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە کفنی برا موسوڵمانەکەی خۆی کرد، با بەجوانی کفنی بکات).

٣١٤٩ - (صحيح) عن عائشة, قالت: أُدْرِجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَوْبٍ حِبَرَةٍ ثُمَّ أُخِّرَ عَنْهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد عابا(حبرة)یەکیان پێوە پێچا - (حبرة)جۆرێك عابای یەمەنی خەت خەتی گران بەهایە -، لەپاشدا لێی کرایەوە.

٣١٥٠ - (صحيح) عن جابر قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (إِذَا تُوُفِّيَ أَحَدُكُمْ فَوَجَدَ شَيْئًا فَلْيُكَفَّنْ فِي ثَوْبٍ حِبَرَةٍ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە مرد کەسوکارەکەی توانایان هەبوو با کفنەکەی لە عەبا(حبره) بۆ بکەن.

٣١٥١ - (صحيح) عن عائشة, قالت: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ بِيضٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سێ پارچە قوماشی سپی یەمەنی دا کفن کرا، نە قەمیسیان تێدابوو، نە عەمامە.

٣١٥٢ - (صحيح) عن عائشة: مِثْلَهُ زَادَ: مِنْ كُرْسُفٍ, قَالَ: فَذُكِرَ لِعَائِشَةَ قَوْلُهُمْ: فِي ثَوْبَيْنِ وَبُرْدِ حِبَرَةٍ, فَقَالَتْ: قَدْ أُتِيَ بِالْبُرْدِ, وَلَكِنَّهُمْ رَدُّوهُ وَلَمْ يُكَفِّنُوهُ فِيهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، لە لۆکە(کرسف)، راوی وتی: وتەی خەڵکیان باس کرد بۆ عائیشە کە دەیانوت لەدوو کراس و عەبایەکی(حبرة)دا کفن کراوە، عائیشە، وتی: عەبایەکیان بۆ هێنا، بەڵام رەتیان کردەوە نەیان کرد بە کفن بۆی.

٣١٥٣ - (ضعيف الاسناد) عن ابن عباس, قال: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ نَجْرَانِيَّةٍ: الْحُلَّةُ ثَوْبَانِ, وَقَمِيصُهُ الَّذِى مَاتَ فِيهِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: قَالَ عُثْمَانُ: فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ حُلَّةٍ حَمْرَاءَ, وَقَمِيصِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سێ پارچە قوماشی نەجرانی دا کفن کرا: (الْحُلَّةُ ثَوْبَانِ)، لەگەڵ ئەو قەمیسەی کە کاتێ وەفاتی کرد لەبەریدا بوو. (الْحُلَّةُ) پێکهاتوە لە دوو پارچە قوماش (رداء و إزار) یەکێکیان دەدرێت بەسەر شاندا هەتا نێو قەد دادەپۆشێت، ئەوی تریشیان دەبەسترێت لە کەمەر لە نێو قەد بەرەو خواری پێ دادەپۆشرێت، پێشی دەڵێن ئیحرام کاتێ کە لە حەج و عومرەدا دەپۆشن. ئەبوو داود دەڵێت: (عُثْمَان) وتی: لە سێ پارچە قوماشدا (حُلَّةٍ حَمْرَاءَ) واتە (رداء و إزار)ێکی سور، لەگەڵ ئەو قەمیسەی کە کاتێ وەفاتی کرد لەبەریدا بوو.

## باسی سەبارەت بە زێدەڕۆیی لە کفن کردندا.

## ٣٥ - باب كَرَاهِيَةِ الْمُغَالاَةِ فِي الْكَفَنِ.

٣١٥٤ - (ضعيف) عن علي بن أبي طالب, قال: لاَ تَغَالِ لِي فِي كَفَنٍ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تَغَالَوْا فِي الْكَفَنِ فَإِنَّهُ يُسْلَبُهُ سَلْبًا سَرِيعًا).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: زیادەڕۆیی مەکەن لەو کفنەدا کە بۆم دەکەن، لەبەرئەوەی بیستومە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (زیادەڕۆیی مەکەن لە کفندا لەبەرئەوەی بە زوویی دەڕزێت).

٣١٥٥ - (صحيح) عن خباب قال: إِنَّ مُصْعَبَ بْنَ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ إِلاَّ نَمِرَةٌ, كُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَ رِجْلاَهُ وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (غَطُّوا بِهَا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ شَيْئًا مِنَ الإِذْخِرِ).

واتە: لە خەبابەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەرۆژی جەنگی ئوحوددا موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا، هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو بێجگە لە (نَمِرَة)بووردەیەکی کورت نەبێت - (نَمِرَة) پۆشاکێکە هێڵی سپی و رەشی تێدایە کاتی خۆی عەرەب لەبەریان دەکرد - کاتێ کە سەریمان پێ دادەپۆشی قاچەکانی بەدەرەوە دەبوون، وە کاتێ کە قاچەکانیمان پێ دادەپۆشی سەری بەدەرەوە دەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەبووردەکە سەری داپۆشن و قاچەکانیشی بە (إِذْخِرِ) داپۆشن - (إِذْخِرِ) گیایەکی بۆن خۆشە - ).

٣١٥٦ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (خَيْرُ الْكَفَنِ الْحُلَّةُ, وَخَيْرُ الأُضْحِيَةِ الْكَبْشُ الأَقْرَنُ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین کفن بریتیە لە (الْحُلَّةُ) کە پێکهاتوە لە دوو پارچە قوماش (رداء و إزار)، چاکترین قوربانیش بەرانی شاخدارە).

## باسی سەبارەت بە کفنی ئافرەتان.

## ٣٦ - باب فِي كَفَنِ الْمَرْأَةِ.

٣١٥٧ - (ضعيف) عن ليلى بنت قانف الثقفية, قالت:كُنْتُ فِيمَنْ غَسَّلَ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ وَفَاتِهَا, فَكَانَ أَوَّلُ مَا أَعْطَانَا

رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْحِقَاءَ, ثُمَّ الدِّرْعَ, ثُمَّ الْخِمَارَ, ثُمَّ الْمِلْحَفَةَ, ثُمَّ أُدْرِجَتْ بَعْدُ فِي الثَّوْبِ الآخِرِ, قَالَتْ: وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ عِنْدَ الْبَابِ مَعَهُ كَفَنُهَا يُنَاوِلُنَاهَا ثَوْبًا ثَوْبًا.

واتە: لە لەیلای كچی قانیفی (ثقفية)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە (أُمَّ كُلْثُوم)ی كچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی كرد خۆم یەكێك بوو لەو ژنانەی كە دەیانشۆرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەردەم دەرگاكەدا دانیشتبوو پارچە پارچە كفنەكەی دەدایە دەستمان، جا یەكەم شتێ كە لەپێشدا دایە دەستمان كراسەكەی بوو، لەپاشدا سەركراسەكەی، ئینجا سەرپۆش، پاشان داپۆشەرێك، لەپاش ئەمانە هەر هەموو كراسێكی ترمان تێوە پێچا.

## باسی سەبارەت بە بۆنخۆشكردنی مردو بە میسك.

## ٣٧ - باب فِي الْمِسْكِ لِلْمَيِّتِ.

٣١٥٨ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَطْيَبُ طِيبِكُمُ الْمِسْكُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین بۆنی خۆشتان میسكە).

## باسی بە پەلە ئامادەکردنی جەنازە بۆ بە خاکسپاردنی وە کەراهیەتی راگرتنی.

## ٣٨ - باب التَّعْجِيلِ بِالْجَنَازَةِ وَكَرَاهِيَةِ حَبْسِهَا.

٣١٥٩ - (ضعيف) عن الحصين بن وحوح: أَنَّ طَلْحَةَ بْنَ الْبَرَاءِ مَرِضَ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ فَقَالَ (إِنِّي لاَ أَرَى طَلْحَةَ إِلاَّ قَدْ حَدَثَ فِيهِ الْمَوْتُ, فَآذِنُونِي بِهِ, وَعَجِّلُوا, فَإِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لِجِيفَةِ مُسْلِمٍ أَنْ تُحْبَسَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَهْلِهِ).

واتە: لە حوصەینی کوڕی وەحوەحەوە دەگێڕنەوە، کە (طَلْحَة)ی کوڕی (بَرَاء) نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات سەردانی کردو فەرمووی: (من وائەزانم (طَلْحَة) ئەمرێت، کاتێ کە مرد ئاگادارم بکەنەوە، خێرا ئامادەی بکەن، لەبەرئەوەی دروست نیە لاشەی موسوڵمان لەناو کەسوکاریا بە مردویی رابگیرێت).

## باسی دەربارەی خۆشۆردن لەدوای شۆردنی مردو.

## ٣٩ - باب فِي الْغُسْلِ مِنْ غَسْلِ الْمَيِّتِ.

٣١٦٠ - (ضعيف) عن عائشة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنَ الْجَنَابَةِ وَيَوْمَ الْجُمُعَةِ وَمِنَ الْحِجَامَةِ وَغُسْلِ الْمَيِّتِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە چوار شت خۆی دەشۆری: لە لەشگرانی، لە رۆژی هەینی دا، لەدوای کەڵەشاخ گرتن، لەدوای شۆردنی مردو.

٣١٦١ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ غَسَّلَ الْمَيِّتَ فَلْيَغْتَسِلْ, وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك مردووی شۆرد، با خۆی بشوات، هەرکەسێکیش تەرمەکەی هەڵ بگرێت، با دەستنوێژ بگرێت).

٣١٦٢ - (صحيح) عن أبو هريرة عن النبي صلى الله عليه و سلم بمعناه. قَالَ أَبو دَاوُدَ: هَذَا مَنْسُوخٌ, سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ وَسُئِلَ عَنِ الْغُسْلِ مِنْ غَسْلِ الْمَيِّتِ؟ فَقَالَ: يُجْزِيهِ الْوُضُوءُ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: أَدْخَلَ أَبوو صَالِحٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ - يَعْنِي إِسْحَاقَ مَوْلَى زَائِدَةَ - قَالَ وَحَدِيثُ مُصْعَبٍ ضَعِيفٌ فِيهِ خِصَالٌ لَيْسَ الْعَمَلُ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەوە هەڵوەشێنراوەتەوە (مەنسوخە)، لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم بیستوە کاتێ کە دەربارەی خۆشۆردنی کەسێ کە مردو بشوات پرسیاری لێ کرا وتی: دەستنوێژ گرتنی بەسە واتە پێویست ناکات خۆی بشوات.

## باسی دەربارەی ماچکردنی مردو.

## ٤٠ - باب فِي تَقْبِيلِ الْمَيِّتِ.

٣١٦٣ - (صحيح) عن عائشة قالت: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ, حَتَّى رَأَيْتُ الدُّمُوعَ تَسِيلُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی (عُثْمَان)ی کوڕی (مَظْعُون)ی ماچ کرد لەکاتێکدا

کە مرد بوو، هەتا فرمێسکەکانیم بینی بەسەر گۆناکانیدا دەهاتنەخوارەوە.

## باسی سەبارەت بە کفن کردنی مردو لە شەودا.

## ٤١ - باب فِي الدَّفْنِ بِاللَّيْلِ.

٣١٦٤ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله, قال: رَأَى نَاسٌ نَارًا فِي الْمَقْبَرَةِ فَأَتَوْهَا, فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْقَبْرِ, وَإِذَا هُوَ يَقُولُ: (نَاوِلُونِي صَاحِبَكُمْ). فَإِذَا هُوَ الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالذِّكْرِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خەڵکی لە گۆڕستان ئاگرێکیان بینی چون بە دەم ئەو ئاگرەوە هەتا بزانن دەنگوباس چی یە، کە چون سەیریان کرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو گۆڕێکدایە، دەیفەرموو: (تەرمی هاوەڵەکەتانم بدەنێ). مردووەکە ئەو پیاوە بوو کە لەناو خەڵکدا بە ناوبانگ بوو بە دەنگی بەرز زیکر و یادی خوای پەروەردگاری دەکرد.

## باسی سەبارەت بە گواستنەوەی مردو لە زەویەکەوە بۆ زەویەکی تر, وە کەراهەتی ئەو کارە.

## ٤٢ - باب فِي الْمَيِّتِ يُحْمَلُ مِنْ أَرْضٍ إِلَى أَرْضٍ, وَكَرَاهَةِ ذَلِكَ.

٣١٦٥ - عن جابر بن عبد الله, قال:كُنَّا حَمَلْنَا الْقَتْلَى يَوْمَ أُحُدٍ لِنَدْفِنَهُمْ, فَجَاءَ مُنَادِي النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَدْفِنُوا الْقَتْلَى فِي مَضَاجِعِهِمْ, فَرَدَدْنَاهُمْ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە تەرمی شەهیدەکانی جەنگی ئوحودمان هەڵگرت بۆ ئەوەی بیانگوێزینەوەو لە جێگەیەکی

تردا بە خاكیان بسپێرین، جاڕدەرەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانتان پێ دەكات بەوەی كە كوژراوەكان لە جێگەی خۆیاندا بنێژن، ئێمەش گەڕاندنمانەوە بۆ جێگەی خۆیان و هەر یەكەو لە جێگەی خۆیدا ناشتمانن واتە لەو جێگەیەدا كە شەهید بوو بوون.

## باسی سەبارەت بە ریزەكانی نوێژی مردو.

## ٤٣ - باب فِي الصُّفُوفِ عَلَى الْجَنَازَةِ.

٣١٦٦ – (ضعيف لكن الموقوف حسن) عن مالك بن هبيرة, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عَلَيْهِ ثَلاَثَةُ صُفُوفٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ أَوْجَبَ). قَالَ: فَكَانَ مَالِكٌ إِذَا اسْتَقَلَّ أَهْلَ الْجَنَازَةِ جَزَّأَهُمْ ثَلاَثَةَ صُفُوفٍ لِلْحَدِيثِ.

واتە: لە مالیكی كوڕی هەبیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ بمرێت و سێ ریز لە موسوڵمانان نوێژی لەسەر بكەن ئیللا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت). راوی وتی: مالیك كاری بەم فەرموودە دەكرد ئەگەر كەسێ بمردایە خەڵكی كەم ئامادەی نوێژی جەنازەكەی بوونایە دەیكردن بە سێ ریزەوە ئەوكاتە نوێژی لەسەر دەكرد.

## باسی سەبارەت بە رۆشتنی ئافرەتان بەشوێن جەنازەدا.

## ٤٤ - باب اتِّبَاعِ النِّسَاءِ الْجَنَائِزَ.

٣١٦٧ – (صحيح) عن أم عطية, قالت: نُهِينَا أَنْ نَتَّبِعَ الْجَنَائِزَ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.

واتە: لە (أم عطية)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لێمان قەدەغەكرابوو شوێن جەنازە بكەوین بۆ گۆڕستان، بەڵام زۆریان لێ نەدەكردین.

# باسی سەبارەت بە فەزڵی نوێژکردن لەسەر جەنازەو بەخاکسپاردنی.

## ٤٥ - باب فَضْلِ الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَائِزِ وَتَشْيِيعِهَا.

٣١٦٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ, وَمَنْ تَبِعَهَا حَتَّى يُفْرَغَ مِنْهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ, أَصْغَرُهُمَا مِثْلُ أُحُدٍ أَوْ أَحَدُهُمَا مِثْلُ أُحُدٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرکەسێ شوێن جەنازەیە بکەوێت و نوێژی لەسەر بکات ئەوە (قیراط)ێك پاداشتی بۆ هەیە، هەرکەسێ شوێن جەنازەیە بکەوێت هەتا دەنێژرێ ئەوە دوو (قیراط) پاداشتی بۆ هەیە، (قیراط) بچوکەکەیان بە قەد کێوی ئوحود دەبێت، یان (قیراط)ێکیان بە قەد کێوی ئوحود دەبێت.

٣١٦٩ - (صحيح) عن عامر بن سعد بن أبي وقاص: أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ إِذْ طَلَعَ خَبَّابٌ صَاحِبُ الْمَقْصُورَةِ, فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَلاَ تَسْمَعُ مَا يَقُولُ أَبو هُرَيْرَةَ؟ إِنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ خَرَجَ مَعَ جَنَازَةٍ مِنْ بَيْتِهَا وَصَلَّى عَلَيْهَا). فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ سُفْيَانَ فَأَرْسَلَ ابْنُ عُمَرَ إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَتْ صَدَقَ أَبوو هُرَيْرَةَ.

واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێڕنەوە، کە لە خزمەت ئیبنو عومەری کوڕی (خَطَّاب)دا بووە ڕەزای خوای لێ بێ، کاتێ کە خەبابی (صَاحِبُ الْمَقْصُورَةِ) دەرکەوت، وتی: ئەی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی پێشەوا عومەر ئایا نەتبیستوە ئەبو هورەیرە دەڵێ چی؟ لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستوە فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لەگەڵ جەنازەیە لەماڵ

دەرچێت و نوێژی لەسەر بكات ...) جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەكەی پێشوی سوفیانی گێڕایەوە، ئیبنو عومەر ناردی بۆلای خاتو عائیشە هەتا بزانیٚ وەهایە، عائیشە وتی: بەڵیٚ وایە ئەبو هورەیرە راست دەكات.

٣١٧٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: سمعت النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم يقول: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بۆ خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانیٚ بمرێت چل پیاو نوێژی لەسەر بكەن هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەدابیٚ، ئەوە خوای گەورە نوێژی ئەو چل كەسە دەكاتە شەفاعەت بۆی و لە قیامەتدا سەرفراز دەبێت).

## باسی سەبارەت بە شوێنكەوتنی مردو بە ئاگرەوە.

## ٤٦ - باب فِي النَّارِ يُتْبَعُ بِهَا الْمَيِّتُ.

٣١٧١ - (ضعيف) عن أبي هريرة: عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قال: (لاَ تُتْبَعُ الْجَنَازَةُ بِصَوْتٍ وَلاَ نَارٍ). زَادَ هَارُونُ: (وَلاَ يُمْشَى بَيْنَ يَدَيْهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە دەنگ و بە ئاگرەوە دوای جەنازە مەكەون). هارون ئەمەی بۆ زیاد كرد: (لەبەردەمی جەنازەوە مەڕۆن).

## باسی هەستان لەبەر جەنازە.

## ٤٧ - باب الْقِيَامِ لِلْجَنَازَةِ.

٣١٧٢ - (صحيح) عن عامر بن ربيعة, عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قال: (إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ).

واتە: لە عامیری کوڕی ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر جەنازەیەکتان دی هەستن لەبەری هەتا تێ ئەپەڕێت یان دادەنرێت).

٣١٧٣ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري, قال: قال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم: (إِذَا تَبِعْتُمُ الْجَنَازَةَ فَلاَ تَجْلِسُوا حَتَّى تُوضَعَ). قَالَ أَبو دَاوُدَ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ الثَّوْرِيُّ عَنْ سُهَيْلٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ فِيهِ حَتَّى تُوضَعَ بِالأَرْضِ وَرَوَاهُ أَبو مُعَاوِيَةَ عَنْ سُهَيْلٍ قَالَ حَتَّى تُوضَعَ فِي اللَّحْدِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ وَسُفْيَانُ أَحْفَظُ مِنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر شوێن جەنازەیە کەوتن دامەنیشن هەتا لەسەر زەوی دادەنرێت یان هەتا دەیخەنە ناو گۆڕەوە).

٣١٧٤ - (صحيح) عن جابر قال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ مَرَّتْ بِنَا جَنَازَةٌ, فَقَامَ لَهَا, فَلَمَّا ذَهَبْنَا لِنَحْمِلَ إِذَا هِيَ جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ, فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا هِيَ جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ. فَقَالَ: (إِنَّ الْمَوْتَ فَزَعٌ فَإِذَا رَأَيْتُمْ جَنَازَةً فَقُومُوا).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا

بووین صلی الله علیه وسلم، جەنازەیە بەلاماندا تێ پەڕی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەری هەستا، کاتێ کە ویستمان بڕۆین هەڵی بگرین سەیردەکەین جەنازەی جولەکەیەکە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆ ئەمە جەنازەی جولەکەیە، فەرمووی: (مردن ترسناك و بە سامە، ئەگەر جەنازەتان دی لەبەری هەستن).

٣١٧٥ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ فِي الْجَنَائِزِ, ثُمَّ قَعَدَ بَعْدُ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرەتا لەبەر جەنازە هەڵئەسا، لەپاشدا دادەنیشت.

٣١٧٦ - (حسن) عن عبادة بن الصامت قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُومُ فِي الْجَنَازَةِ حَتَّى تُوضَعَ فِي اللَّحْدِ, فَمَرَّ بِهِ حَبْرٌ مِنَ الْيَهُودِ, فَقَالَ: هَكَذَا نَفْعَلُ. فَجَلَسَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (اجْلِسُوا خَالِفُوهُمْ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەر جەنازەیە هەستا هەتا خرایە ناو گۆڕەوە، یەکێ لە زاناکانی جولەکە بەلایدا تێ پەڕی وتی: ئێمەش بەو شێوەیە دەکەین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکسەر دانیشت و فەرمووی: (دانیشن بە پێچەوانەی ئەوانەوە بجوڵێنەوە).

## باسی سواربوون لەکاتی بەڕێکردنی جەنازەدا.

## ٤٨ - باب الرُّكُوبِ فِي الْجَنَازَةِ.

٣١٧٧ - (صحيح) عن ثوبان: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ وَهُوَ مَعَ الْجَنَازَةِ فَأَبَى أَنْ يَرْكَبَهَا, فَلَمَّا انْصَرَفَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ فَرَكِبَ فَقِيلَ لَهُ, فَقَالَ: (إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَمْشِي فَلَمْ أَكُنْ لأَرْكَبَ وَهُمْ يَمْشُونَ, فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبْتُ).

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ جەنازەیەکدا دەچو بۆ گۆڕستان، وڵاخێکیان بۆ هێنا بۆئەوەی سواری ببێت، بەڵام ئەو رازی نەبوو سواری ببێ، کاتێ کە گەڕایەوە وڵاخێکیان بۆ هێنا، سواری بوو، لەوبارەوە قسەیان لەگەڵ کرد، فەرمووی: (ئەوکاتە مەلائیکەکان لەگەڵ جەنازەکەدا بەپێ دەڕۆیشتن نەدەکرا من سوار بم و ئەوان بەپێ بڕۆن، بەڵام ئێستا ئەوان رۆیشتون، لەبەرئەوە منیش سواربووم).

٣١٧٨ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ابْنِ الدَّحْدَاحِ وَنَحْنُ شُهُودٌ, ثُمَّ أُتِيَ بِفَرَسٍ فَعُقِلَ حَتَّى رَكِبَهُ, فَجَعَلَ يَتَوَقَّصُ بِهِ, وَنَحْنُ نَسْعَى حَوْلَهُ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی کرد لەسەر جەنازەی ئیبنو دەحداح ئێمەش لە خزمەتیدا ئامادەبووین، لەپاشدا ئەسپێکیان بۆ هێنا بەستیانەوە هەتا سواری بوو، بە سواری ئەسپەکە رێی دەکردو هەنگاوەکانی نزیك بوون لەیەکتر، ئێمەش لەدەوری بە خێرایی رێمان دەکرد.

## باسی ڕێکردن لەپێش جەنازەوە.

## ٤٩ - باب الْمَشْيِ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

٣١٧٩ - (صحيح) عن سالم, عن أبيه رضي الله عنه أنه قال:: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەبوو بەکر و عومەرم دیوە لەپێش جەنازەوە ڕۆشتون.

٣١٨٠ - (صحيح) عن المغيرة بن شعبة: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الرَّاكِبُ يَسِيرُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ, وَالْمَاشِي يَمْشِي خَلْفَهَا وَأَمَامَهَا وَعَنْ يَمِينِهَا وَعَنْ يَسَارِهَا قَرِيبًا مِنْهَا, وَالسِّقْطُ يُصَلَّى عَلَيْهِ, وَيُدْعَى لِوَالِدَيْهِ بِالْمَغْفِرَةِ وَالرَّحْمَةِ).

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی سوارە لەدوای جەنازەوە ڕێ بکات، ئەوەی بە پێ ڕێ دەکات با لەدوایەوە یان لە پێشیەوە یا لە لای ڕاستیەوە یان لە لای چەپیەوە لە نزیکیەوە ڕێ بکات واتە: لە هەر شوێنێکەوە ویستی لێیەتی، منداڵێ بە مردویی لەدایك بێت نوێژی لەسەر دەکرێت و داوای لێخۆشبوون و بەزەیی لەخوای پەروەردگار دەکرێت بۆ باوك و دایکی).

## باسی پەلەکردن لە بەرێکردنی جەنازەدا.

## ٥٠ - باب الإِسْرَاعِ بِالْجَنَازَةِ.

٣١٨١ - (صحيح) عن أبو هريرة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ, وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پەلەبکەن لە بەرێکردنی جەنازەدا، چونکە ئەگەر چاك بێت ئەوا چاکەیەکەو بەرەوپیری دەبەن، ئەگەر ئەوەش نەبێت ئەوە خراپەیەکە لەکۆڵی خۆتانی دەکەنەوە).

٣١٨٢ - (صحيح لكن قوله (عثمان بن أبي العاص) شاذ) عن عيينة بن عبد الرحمن عن أبيه: أَنَّهُ كَانَ فِي جَنَازَةِ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ وَكُنَّا نَمْشِي مَشْيًا خَفِيفًا فَلَحِقَنَا أَبو بَكْرَةَ فَرَفَعَ سَوْطَهُ فَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَرْمُلُ رَمَلاً.

واتە: لە عویەینەی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ جەنازەی (عُثْمَان) کوڕی ئەبوو عاصدا لەسەرخۆ ڕێمان دەکرد، ئەبو بەکرەمان پێگەیشت قامچیەکەی بەرزکردەوەو وتی: بۆخۆم لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم جەنازەیەکمان بەرێ دەکرد بە پەلە دەڕۆیشتین و هەنگاوەکانمان نزیك بوو لەیەك).

٣١٨٣ - (صحيح) عن عيينة بِهَذَا الْحَدِيثِ, قَالاَ: فِي جَنَازَةِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ, وَقَالَ: فَحَمَلَ عَلَيْهِمْ بَغْلَتَهُ وَأَهْوَى بِالسَّوْطِ.

واتە: لە عویەینەوە فەرمودەی پێشو هاتوە، هەردوو شێخەکەی ئەبو داود وتیان: ئێمە لەگەڵ جەنازەی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەدا لەسەرخۆ رێمان دەکرد، راوی وتی: ئەبو بەکرە بەسواری ئێسترەکەی گەیشت پێیان، قامچیەکەی درێژ کرد بۆیان دەیویست بە پەلە بڕۆن).

٣١٨٤ - (ضعيف) عن ابن مسعود قال: سَأَلْنَا نَبِيَّنَا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمَشْيِ مَعَ الْجَنَازَةِ, فَقَالَ (مَا دُونَ الْخَبَبِ, إِنْ يَكُنْ خَيْرًا تَعَجَّلْ إِلَيْهِ وَإِنْ يَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَبُعْدًا لأَهْلِ النَّارِ, وَالْجَنَازَةُ مَتْبووعَةٌ وَلاَ تُتْبَعُ, لَيْسَ مَعَهَا مَنْ تَقَدَّمَهَا). قَالَ أَبو دَاوُدَ وَهُوَ: ضَعِيفٌ هُوَ يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ وَهُوَ يَحْيَى الْجَابِرُ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَهَذَا كُوفِيٌّ وَأَبو مَاجِدَةَ بَصْرِيٌّ. قَالَ أَبو دَاوُدَ أَبو مَاجِدَةَ هَذَا لاَ يُعْرَفُ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی رۆشتن لەگەڵ جەنازەدا لە پێغەمبەرەکەمان صلى الله عليه وسلم پرسی، فەرمووی: (بە پەلە جەنازە بەرێ بکەن، ئەگەر مردوەکە کردەوەی چاك بێت ئەوە با بگات بە خێر و چاکەو پاداشتی خۆی، ئەگەر ئەوەش نەبێت دوری لە ئەهلی ئاگر دوعای لەناوچونی بۆ کردن، دەبێ خەڵك شوێنی جەنازە بکەون نابێ پێشی بکەون، ئەوەی پێشی بکەوێت ئەوە لەگەڵ جەنازەکەدا نیەو پاداشتی بۆ نانوسرێت).

## باسی پێشەوا نوێژ لەسەر کەسێك ناکات خۆی بکوژێت.

## ٥١ - باب الإِمَامِ لاَ يُصَلِّي عَلَى مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ.

٣١٨٥ - (صحيح) عن جابر بن سمرة قال: مَرِضَ رَجُلٌ فَصِيحَ عَلَيْهِ, فَجَاءَ جَارُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ: إِنَّهُ قَدْ مَاتَ. قَالَ: (وَمَا يُدْرِيكَ؟). قَالَ: أَنَا رَأَيْتُهُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ).

قَالَ: فَرَجَعَ فَصِيحَ عَلَيْهِ, فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ مَاتَ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ). فَرَجَعَ فَصِيحَ عَلَيْهِ فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبِرْهُ. فَقَالَ الرَّجُلُ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ. قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ الرَّجُلُ فَرَآهُ قَدْ نَحَرَ نَفْسَهُ بِمِشْقَصٍ مَعَهُ, فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ, فَقَالَ: (مَا يُدْرِيكَ؟). قَالَ: رَأَيْتُهُ يَنْحَرُ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ مَعَهُ. قَالَ: (أَنْتَ رَأَيْتَهُ). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ (إِذًا لاَ أُصَلِّي عَلَيْهِ).

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێك نەخۆشکەوت و ناڕەحەت بوو، کەسوکاری هات و هاواریان کرد لەسەری، پیاوێکی دراوسێی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەو پیاوە مرد، فەرمووی: (بەچیدا دەزانی کە مردوە؟). وتی: خۆم بینیم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر نەمردوە). جابر وتی: پیاوەکە گەڕایەوەو جارێکی تر کەسوکارەکەی هات و هاواریان کرد لەسەری، پیاوەکە دیسان گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەو پیاوە مرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر نەمردوە). پیاوەکە دیسان گەڕایەوە، کەسوکاری هات و هاواریان کرد لەسەری، خێزانەکەی پێی وت: بڕۆرەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی پێ بدە، پیاوەکە وتی دەك نەعلەتی خوای لەسەر بێت، جابر وتی: پیاوەکە چوەسەری بینی بە سەری تیرێك یان بە تیرێ خۆی سەربڕیوە، ئینجا چوە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی پێ دا کە مردوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەچیدا دەزانی کە مردوە؟). وتی: بینیم بە سەری تیرێ یان بەو تیرەی کە پێی بوو خۆی سەربڕی، فەرمووی: (تۆ خۆت بینیت؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (کەواتە منیش نوێژی لەسەر ناکەم).

## باسی نوێژکردن لەسەر کەسێك لە تۆڵەدا بکوژرێت.

## ٥٢ - باب الصَّلاَةِ عَلَى مَنْ قَتَلَتْهُ الْحُدُودُ.

٣١٨٦ - (حسن صحيح) عن أبو برزة الأسلمي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُصَلِّ عَلَى مَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ, وَلَمْ يَنْهَ عَنِ الصَّلاَةِ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی لەسەر ماعزی کوڕی مالیك نەکردو، ڕێنگریشی نەکرد نوێژی لەسەر بکرێت.
- ماعزی کوڕی مالیك زینای کردبوو خۆی دانی نا بە تاوانەکەیدا بەردباران کرا -.

## باسی دەربارەی نوێژکردن لەسەر منداڵ.

## ٥٣ - باب فِي الصَّلاَةِ عَلَى الطِّفْلِ.

٣١٨٧ - (حسن الإسناد) عن عائشة قالت: مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ شَهْرًا, فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مرد تەمەنی هەژدە مانگ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی لەسەر نەکرد.

٣١٨٨ - (ضعيف منكر) عن البهي, قال: لَمَّا مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, صَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَقَاعِدِ.

واته: له بههييهوه دهگێرنهوه، كه وتويهتی: كاتێ كه ئيبراهيمی كوڕی پێغهمبهر صلی الله عليه وسلم مرد تهمهنی ههژده مانگ بوو، پێغهمبهری خوا صلی الله عليه وسلم له (مقاعد) نوێژی لهسهر كرد. - (مقاعد) شوێنێك بووه له نزك مزگهوتهوه - .

(ضعيف منكر) عن عطاء: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى عَلَى ابْنِهِ إِبْرَاهِيمَ وَهُوَ ابْنُ سَبْعِينَ لَيْلَةً.

واته: له (عطاء)هوه دهگێرنهوه، كه وتويهتی: پێغهمبهر صلی الله عليه وسلم نوێژی كرد لهسهر ئيبراهيمی كوڕی لهكاتێكدا كه تهمهنی حهفتا شهو بوو.

## باسی نوێژکردن لەسەر جەنازە لە مزگەوتدا.

## ٥٤ - باب الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ فِي الْمَسْجِدِ.

٣١٨٩ - (صحيح) عن عائشة قالت: وَاللَّهِ مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ الْبَيْضَاءِ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ.

واته: له عائيشهوه رهزای خوای لێ بێ دهگێرنهوه، كه وتويهتی: سوێند به (الله) پێغهمبهری خوا صلی الله عليه وسلم لهناو مزگهوتدا نوێژی كرد لهسهر سوههيلی كوڕی (بيضاء).

٣١٩٠ - (صحيح) عن عائشة قالت: وَاللَّهِ لَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ابْنَىْ بَيْضَاءَ فِي الْمَسْجِدِ سُهَيْلٍ وَأَخِيهِ.

واته: له عائيشهوه رهزای خوای لێ بێ دهگێرنهوه، كه وتويهتی: سوێند به (الله) پێغهمبهری خوا صلی الله عليه وسلم لهناو مزگهوتدا نوێژی كرد لهسهر سوههيل و براكهی كه ههردووكيان كوڕی (بيضاء) بوون.

٣١٩١ - ( حسن لكن بلفظ: (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) ) عن أبي هريرة, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك لە مزگەوتدا نوێژ لەسەر جەنازەیەك بکات هیچی لەسەر نیە).

## باسی بە خاکسپاردن
## لەکاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابووندا.

## ٥٥ - باب الدَّفْنِ عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَعِنْدَ غُرُوبِهَا.

٣١٩٢ - (صحيح) عن عقبة بن عامر قال: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ, أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ, وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ, وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ أَوْ كَمَا قَالَ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: سێ کات هەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی لێ دەکردین کە نوێژی تێدا بکەین، یان مردووی تێدا بنێژین: کاتێك کە خۆر دەردەچێت بەرەبەیان هەتا خۆر بەرزدەبێتەوە، یان کاتێك کە وشتر هەڵدەسێت - لەگەرمیدا - هەتا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات، یا کاتێك کە خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچێت هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

## باسی کاتێ کە جەنازەی پیاوان و ئافرەتان ئامادەبوو، کامیان پێش دەخرێت؟

### ٥٦ - باب إِذَا حَضَرَ جَنَائِزُ رِجَالٍ وَنِسَاءٍ، مَنْ يُقَدِّمُ؟

٣١٩٣ - (صحيح) عمار مولى الحارث بن نوفل: أَنَّهُ شَهِدَ جَنَازَةَ أُمِّ كُلْثُومٍ وَابْنِهَا، فَجُعِلَ الْغُلَامُ مِمَّا يَلِي الإِمَامَ فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، وَفِي الْقَوْمِ ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ وَأَبو قَتَادَةَ وَأَبو هُرَيْرَةَ، فَقَالُوا: هَذِهِ السُّنَّةُ.

واتە: لە عەممارى نۆکەرى (حارث)ى کوڕى نەوفەلەوە هاتوە، کە ئامادەی جەنازەی (أُمِّ كُلْثُوم) و کوڕەکەی بوو، جەنازەی کوڕەکەیان لەبەردەم پێشنوێژدا داناو جەنازەی دایکەکەشی لە پاڵیا لەرووی قیبلەوە دانا، منیش ئەو شتەم ئینکاری کردو پەسەندم نەکرد، لەناو خەڵکەکەدا ئیبنو عەباس و ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو قەتادەو ئەبو هورەیرە هەبوون، لەو بارەوە پرسیارم لێ کردن، وتیان: ئەوە سوننەتە.

## باسی پێشنوێژ لە کوێی مردودا رادەوەستێ کاتێ کە نوێژی لەسەر دەکات؟

### ٥٧ - باب أَيْنَ يَقُومُ الإِمَامُ مِنَ الْمَيِّتِ إِذَا صَلَّى عَلَيْهِ.

٣١٩٤ - (صحيح إلا قوله: فحدثوني أنه أنما...) فإنه مجرد رأي مجهولين عن نافع أبي غالب قال: كُنْتُ فِي سِكَّةِ الْمِرْبَدِ فَمَرَّتْ جَنَازَةٌ مَعَهَا نَاسٌ كَثِيرٌ، قَالُوا: جَنَازَةُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَيْرٍ، فَتَبِعْتُهَا، فَإِذَا أَنَا بِرَجُلٍ عَلَيْهِ كِسَاءٌ رَقِيقٌ عَلَى بُرَيْذِينَتِهِ، وَعَلَى رَأْسِهِ خِرْقَةٌ تَقِيهِ مِنَ الشَّمْسِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا الدِّهْقَانُ؟ قَالُوا: هَذَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ. فَلَمَّا وُضِعَتِ الْجَنَازَةُ قَامَ أَنَسٌ فَصَلَّى عَلَيْهَا وَأَنَا خَلْفَهُ لاَ

يَحُولُ بَيْنِى وَبَيْنَهُ شَىْءٌ فَقَامَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ لَمْ يُطِلْ وَلَمْ يُسْرِعْ ثُمَّ ذَهَبَ يَقْعُدُ فَقَالُوا يَا أَبَا حَمْزَةَ الْمَرْأَةُ الأَنْصَارِيَّةُ فَقَرَّبُوهَا وَعَلَيْهَا نَعْشٌ أَخْضَرُ فَقَامَ عِنْدَ عَجِيزَتِهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا نَحْوَ صَلاَتِهِ عَلَى الرَّجُلِ ثُمَّ جَلَسَ فَقَالَ الْعَلاَءُ بْنُ زِيَادٍ يَا أَبَا حَمْزَةَ هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى عَلَى الْجَنَازَةِ كَصَلاَتِكَ يُكَبِّرُ عَلَيْهَا أَرْبَعًا وَيَقُومُ عِنْدَ رَأْسِ الرَّجُلِ وَعَجِيزَةِ الْمَرْأَةِ قَالَ نَعَمْ. قَالَ يَا أَبَا حَمْزَةَ غَزَوْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نَعَمْ غَزَوْتُ مَعَهُ حُنَيْنًا فَخَرَجَ الْمُشْرِكُونَ فَحَمَلُوا عَلَيْنَا حَتَّى رَأَيْنَا خَيْلَنَا وَرَاءَ ظُهُورِنَا وَفِى الْقَوْمِ رَجُلٌ يَحْمِلُ عَلَيْنَا فَيَدُقُّنَا وَيَحْطِمُنَا فَهَزَمَهُمُ اللَّهُ وَجَعَلَ يُجَاءُ بِهِمْ فَيُبَايِعُونَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ عَلَىَّ نَذْرًا إِنْ جَاءَ اللَّهُ بِالرَّجُلِ الَّذِى كَانَ مُنْذُ الْيَوْمِ يَحْطِمُنَا لأَضْرِبَنَّ عُنُقَهُ. فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجِىءَ بِالرَّجُلِ فَلَمَّا رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُبْتُ إِلَى اللَّهِ. فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُبَايِعُهُ لِيَفِىَ الآخَرُ بِنَذْرِهِ. قَالَ فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَتَصَدَّى لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَأْمُرَهُ بِقَتْلِهِ وَجَعَلَ يَهَابُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَقْتُلَهُ فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ لاَ يَصْنَعُ شَيْئًا بَايَعَهُ فَقَالَ الرَّجُلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ نَذْرِى. فَقَالَ (إِنِّى لَمْ أُمْسِكْ عَنْهُ مُنْذُ الْيَوْمِ إِلاَّ لِتُوفِىَ بِنَذْرِكَ). فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أَوْمَضْتَ إِلَىَّ فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهُ لَيْسَ لِنَبِىٍّ أَنْ يُومِضَ). قَالَ أَبوو غَالِبٍ فَسَأَلْتُ عَنْ صَنِيعِ أَنَسٍ فِى قِيَامِهِ عَلَى الْمَرْأَةِ عِنْدَ عَجِيزَتِهَا فَحَدَّثُونِى أَنَّهُ إِنَّمَا كَانَ لأَنَّهُ لَمْ تَكُنِ النُّعُوشُ فَكَانَ الإِمَامُ يَقُومُ حِيَالَ عَجِيزَتِهَا يَسْتُرُهَا مِنَ الْقَوْمِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ قَوْلُ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). نَسَخَ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ الْوَفَاءَ بِالنَّذْرِ فِى قَتْلِهِ بِقَوْلِهِ: إِنِّى قَدْ تُبْتُ.

واتە: لە نافیعی ئەبوو غالیبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە (سكة)رێگەی (المربد) بووم کە شوێنێکە لە بەصرە، جەنازەیە تێپەڕی خەڵکێکی زۆری لەگەڵ

بوو، خەڵکەکە وتیان: ئەوە جەنازەی (عبد الله)ی کوڕی عومەیرە، منیش شوێن جەنازەکەی کەوتم، گەیشتم بە پیاوێ پۆشاکێکی تەنك و نەرمی لەبەردا بوو بە سواری ئەسپێکی غەیرە عەرەبیەوە، پارچە قوماشێکی بە سەرەوە بوو بۆ پاراستنی لە گەرمای خۆر، وتم: ئەم سەرۆکی ناوچەیە کێ یە؟ وتیان: ئەوە ئەنەسی کوڕی مالیکە، کاتێ کە جەنازەکەیان دانا، ئەنەسی کوڕی مالیك هەستا نوێژی لەسەر کرد منیش لەدوایەوە بووم هیچ شتێك نێوانی من و ئەودا نەبوو، هەستا لەلای سەری مردووەکەوە راوەستاو چوار (الله أکبر)ی کرد نە درێژەی دایە و نە پەلەشی کرد، لەپاشدا رۆشت دانیشت، وتیان: ئەی ئەبا حەمزە نازناوی ئەنەس بوو، ئەوە جەنازەی ئافرەتێکی ئەنصاری یە نوێژی لەسەر بکە، نزیکیان کردەوە لە ئەنەس، لە دارە مەیتێکی سەوزدا بوو، لەئاست ناوەڕاستیدا وەستا وەك چۆن نوێژی مردوی لەسەر پیاو دەکرد بەو شێوەیە نوێژی مردوی لەسەر کرد، چوار (الله أکبر)ی کرد، لەپاشدا رۆشت دانیشت. عەلائی کوڕی زیاد وتی: ئەی ئەبا حەمزە، ئایا پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم بەو شێوەیە نوێژی لەسەر جەنازە دەکرد کە تۆ کردت؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، عەلائی کوڕی زیاد وتی: ئەی ئەبا حەمزە، ئایا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم غەزات کردوە؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، لە جەنگی حونەیندا بەشداریم کرد لە خزمەتیدا، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بۆمان دەرچون لەسەرەتاوە شکاندینیان لەناویاندا پیاوێك هەبوو لێی دەداین و دەیشکاندین، لەپاشدا خوای گەورە تێکی شکاندن و سوپای موسوڵمانانی سەرخست بە سەریاندا، ئەو پیاوەیان هێنا بۆئەوەی بەڵێن و پەیمان بدات و موسوڵمان ببێت، یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: (نذر) بێ لەسەرم ئەگەر ئەو پیاوە خوای گەورە هێنایە بەردەستم بدەم لەگەردنی و بیکوژم لەبەرئەوەی ئازاری موسوڵمانانی داوەو ئەمرۆ بووە هۆی تێك شکاندنمان لەسەرەتاوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو، پیاوەکەیان هێنا بۆلای، کاتێ کە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! دەگەڕێمەوە بۆلای خوای پەروەردگار و تۆبە دەکەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی نەدایە بەیعەتی لێ وەربگرێت بۆ ئەوەی هاوەڵەکەی (نذر)ەکەی جێبەجێ بکات. راوی وتی: پیاوەکە خۆی

نیشانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دا بۆئەوەی فەرمانی پێ بكات بە كوشتنی، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو پیاوەی بینی (نذر)ەكەی كرد هیچی نەكرد و (نذر)ەكەی جێبەجێی نەكرد، هەر چاوەڕێی ئەوە بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی بدات یان ئاماژەی بۆ بكات بە كوشتنی، ئیتر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەیعەتی لێ وەرگرت، پیاوەكە وتی: (نذر)ەكەی من فەوتا، فەرمووی: (من لەسەرەتاوە بۆیە بەیعەتم لێ وەرنەگرت بۆ ئەوەی تۆ (نذر)ەكەت جێبەجێی بكەیت)، هاوەڵەكە وتی: ئەی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئاماژەیەكت بۆ نەكردم یان چاوت لێ دانەگرتم بۆ ئەوەی بیكوژم، فەرمووی: (ئاماژە بۆ كردن و چاو داگرتن بۆ پێغەمبەر نیە).

٣١٩٥ - (صحيح) عن سمرة بن جندب قال: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا, فَقَامَ عَلَيْهَا لِلصَّلاَةِ وَسَطَهَا.

واتە: لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم نوێژم كرد لەسەر ئافرەتێ كە بەهۆی منداڵ بوونەوە مرد بوو، لەو نوێژەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ئاست ناوەڕاستی دا وەستابوو.

## باسی (الله أكبر)كردن لەسەر جەنازە.

## ٥٨ - باب التَّكْبِيرِ عَلَى الْجَنَازَةِ.

٣١٩٦ - (صحيح) عن الشعبي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِقَبْرٍ رَطْبٍ, فَصَفُّوا عَلَيْهِ وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا. فَقُلْتُ لِلشَّعْبِيِّ: مَنْ حَدَّثَكَ؟ قَالَ: الثِّقَةُ مَنْ شَهِدَهُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ.

واتە: لە شەعبییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای گۆڕێکدا گڵی سەرگۆڕەکە هێشتا تەڕ بوو واتە مردووەکە تازە بەخاک سپێردرا بوو، ریزیان بەست و چوار (الله أكبر)ی لەسەر کرد واتە نوێژی مردوی لەسەر کرد، بە شەعبیم وت: کێ ئەمەی بۆ گێڕایتەوە؟ وتی: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ کە خۆی ئامادەی ئەو نوێژکردنە بووەو جێگەی متمانەیەو باوەڕپێکراوە.

٣١٩٧ - (صحيح) عن ابن أبي ليلى قال: كَانَ زَيْدٌ - يَعْنِي ابْنَ أَرْقَمَ - يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا, وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ خَمْسًا, فَسَأَلْتُهُ, فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَبِّرُهَا. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَأَنَا لِحَدِيثِ ابْنِ الْمُثَنَّى أَتْقَنُ.

واتە: لە ئیبنو ئەبی لەیلاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: زەید – واتە کوڕی ئەرقەم - چوار (الله أكبر)ی دەکرد لەسەر جەنازەکانمان، جارێ پێنج (الله أكبر)ی لەسەر جەنازەیە کرد، منیش لەوبارەوە لێم پرسی، لە وەڵامدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو شێوەیە دەیکردن. ئەبو داود دەڵێت: من فەرموودەکەی پێشوی (ابْنِ الْمُثَنَّى)م لەبەرە کە چوار (الله أكبر)ە.

## باسی ئەوەی لەسەر جەنازە دەخوێنرێت.

## ٥٩ - باب مَا يُقْرَأُ عَلَى الْجَنَازَةِ.

٣١٩٨ - (صحيح) عن طلحة بن عبد الله بن عوف قال: صَلَّيْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ عَلَى جَنَازَةٍ, فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ, فَقَالَ: إِنَّهَا مِنَ السُّنَّةِ.

واتە: لە (طلحة)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ نوێژمان کرد لەسەر جەنازەیە، سورەتی فاتیحەی خوێندو وتی: بێگومان ئەمە لە سوننەتە.

## باسی پاڕانەوە بۆ مردو.

## ٦٠ - باب الدُّعَاءِ لِلْمَيِّتِ.

٣١٩٩ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر نوێژتان لەسەر مردو کرد، بە ئیخلاصەوە بۆی بپاڕێنەوە).

٣٢٠٠ - (ضعيف الإسناد) علي بن شماخ قال: شَهِدْتُ مَرْوَانَ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى الْجَنَازَةِ؟ قَالَ: أَمَعَ الَّذِي قُلْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ كَلَامٌ كَانَ بَيْنَهُمَا قَبْلَ ذَلِكَ. قَالَ أَبو هُرَيْرَةَ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبُّهَا، وَأَنْتَ خَلَقْتَهَا، وَأَنْتَ هَدَيْتَهَا لِلإِسْلَامِ، وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوحَهَا، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّهَا وَعَلَانِيَتِهَا، جِئْنَاكَ شُفَعَاءَ فَاغْفِرْ لَهُ).

واتە: لە عەلی کوڕی شەمماخەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم ئامادەبووم مەروان لە ئەبو هورەیرەی پرسی وتی: دەربارەی نوێژکردن لەسەر جەنازە چۆنت بیستوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، وتی: لەگەڵ ئەوەی پێشتر وتت ئاماژە بوو بۆ ئەو قسەیەی کە پێشتر لە نێوانیاندا بوو، وتی: بەڵێ، ئەبو هورەیرە وتی: (خودایە تۆ پەروەردگاری ئەویت، تۆ دروستت کردوە، خۆت هیدایەتت داوە بۆ ئیسلام، هەر خۆشت رۆحت کێشاوە، تۆ زانای بە نهێنی و ئاشکراکانی، هاتوین تکای بۆ دەکەین لێی خۆشبە).

٣٢٠١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا،

وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا, اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِيمَانِ, وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِسْلاَمِ, اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ, وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر جەنازەیە نوێژی كردو فەرمووی: (خودایە لە زیندو و مردو و گەورە و بچوك و نێر و مێ و ئامادەبوو ئامادە نەبوومان ببوورە، خوایە ئەوەمانت بە زیندوی هێشتۆتەوە ئەوە لەسەر باوەڕ بیهێڵیتەوە، ئەوەشمان دەمرێنی لەسەر ئیسلام بیمرێنە، خوایە لە پاداشتی ئەم مردووە بێ بەشمان مەكە، وە لەدوای ئەوەش گومڕامان مەكە).

٣٢٠٢ - (صحيح) عن واثلة بن الأسقع قال: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ, فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنَّ فُلاَنَ بْنَ فُلاَنٍ فِي ذِمَّتِكَ فَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ). قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: (فِي ذِمَّتِكَ, وَحَبْلِ جِوَارِكَ, فَقِهِ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ النَّارِ, وَأَنْتَ أَهْلُ الْوَفَاءِ وَالْحَمْدِ, اللَّهُمَّ فَاغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ).

واتە: لە (واثلة)ی كوڕی ئەسقەعەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر جەنازی پیاوێك لە موسوڵمانان نوێژی بۆ كردین، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (خودایە فلانی كوڕی فلان لە (ذمة)ئەستۆی تۆدایە، بیپارێزە لە بەڵاو نەهامەتیەكانی گۆڕ). (عَبْدُ الرَّحْمَن) وتی: (خودایە لە (ذمة)ئەستۆی تۆدایە، لە ئەمانی تۆدایە، بیپارێزە لە بەڵاو نەهامەتیەكانی گۆڕ، لە سزا و ئازاری ئاگر، تۆ ئەهلی وەفاو بە ئەمەكی خاوەنی بەڵێنی خۆتی و ستایش هەر بۆ تۆیە، خودایە لێی خۆشبە بەزەییت بێتەوە پێیدا، بێگومان تۆ لێبووردەی میهرەبانی).

## باسی نوێژکردن لەسەر مردوی ناوگۆڕ.

### ٦١ - باب الصَّلاَةِ عَلَى الْقَبْرِ.

٣٢٠٣ - عن أبو هريرة: أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ أَوْ رَجُلاً كَانَ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ, فَفَقَدَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَ عَنْهُ: فَقِيلَ: مَاتَ, فَقَالَ: (أَلاَّ آذَنْتُمُونِي بِهِ). قَالَ: (دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ). فَدَلُّوهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ..

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێکی یان پیاوێ مزگەوتی گسگ دەداو پاکی دەکردەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ماوەیە نەیبینی هەواڵی پرسی، وترا: مردوە، وتی: (بۆچی ئاگادارتان نەکردم)، جا فەرمووی: (گۆڕەکەیم نیشان بدەن)، گۆڕەکەیان نیشان دا ئەویش نوێژی مردوی لەسەر کرد.

## باسی نوێژکردن لەسەر موسوڵمانێ کە لە وڵاتی هاوبەش بۆ خوا دانەراندا بمرێت.

### ٦٢ - باب فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْمُسْلِمِ يَمُوتُ فِي بِلاَدِ الشِّرْكِ.

٣٢٠٤ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ, وَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى, فَصَفَّ بِهِمْ وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی مردنی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە مردبوو، خەڵکەکەی هێنایە دەرەوە بۆ نوێژگەکەو ڕیزی کردن و چوار (الله أکبر)ی کرد.

٣٢٠٥ - (ضعيف الإسناد) عن أبو بردة، عن أبيه قال: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَنْطَلِقَ إِلَى أَرْضِ النَّجَاشِيِّ, فَذَكَرَ حَدِيثَهُ, قَالَ النَّجَاشِيُّ: أَشْهَدُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَأَنَّهُ الَّذِى بَشَّرَ بِهِ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ, وَلَوْلاَ مَا أَنَا فِيهِ مِنَ الْمُلْكِ لأَتَيْتُهُ حَتَّى أَحْمِلَ نَعْلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو بووردەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێکردین بڕۆین بۆ وڵاتی نەجاشی، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، نەجاشی وتی: شایەتی دەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، ئەو پێغەمبەرەیە کە عیسای کوڕی مەریەم موژدەی هاتنی داوە، ئەگەر لەبەر ئەم موڵك و پاشایەتیەم نەبووایە ئەچوم بۆلای خزمەتم دەکردو نەعلەکانیم بۆ هەڵدەگرت.

## باسی کۆکردنەوەی چەند مردویەك لەگۆڕێکدا و دانانی نیشانە بۆ ناسینەوەی گۆڕ.

## ٦٣ - باب فِي جَمْعِ الْمَوْتَى فِي قَبْرٍ, وَالْقَبْرُ يُعَلَّمُ.

٣٢٠٦ - (حسن) عن المطلب أنه قال: لَمَّا مَاتَ عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ أُخْرِجَ بِجَنَازَتِهِ فَدُفِنَ أَمَرَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً أَنْ يَأْتِيَهُ بِحَجَرٍ, فَلَمْ يَسْتَطِعْ حَمْلَهُ, فَقَامَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَسَرَ عَنْ ذِرَاعَيْهِ, - قَالَ كَثِيرٌ: قَالَ الْمُطَّلِبُ: قَالَ الَّذِى يُخْبِرُنِى ذَلِكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ:كَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ ذِرَاعَىْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ حَسَرَ عَنْهُمَا -, ثُمَّ حَمَلَهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَأْسِهِ وَقَالَ: (أَتَعَلَّمُ بِهَا قَبْرَ أَخِى وَأَدْفِنُ إِلَيْهِ مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِى).

واتە: لە (مُطَّلِب)ەوە هاتوە، کە وتویەتی: کاتێ کە (عثمان) کوڕی (مظعون)

وەفاتی كردو نێژرا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی كرد بە پیاوێ بەردێكی گەورەی بۆ بێنێ، پیاوەكە نەیتوانی بەردەكە هەڵبگرێت و بۆی بهێنێت، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی رۆیشت بۆ هێنانی بەردەكە هەردوو قۆڵی بۆ هەڵكرد، (كثیر) وتی: (مُطَّلِب) وتی: ئەو كەسەی كە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ئەمەی بۆ گێڕامەوە، وتی: وەكو ئێستا تەماشای سپێتی هەردوو باڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بكەم لەكاتێكدا كە قۆڵەكانی بۆ هەڵكردوە، لەپاشدا بەردەكەی هەڵگرت و لەلای سەری گۆڕەكەوە داینا، فەرمووی: (بەم بەردەدا گۆڕی براكەم دەناسمەوە و هەركەسێك لە خزمانیشم وەفاتی كرد لەلایدا دەینێژم).

## باسی لەكاتی هەڵكەندنی گۆڕدا ئەگەر ئێسك هەبوو، گۆڕهەڵكەن لەو شوێنە دوردەكەوێتەوە یان نا؟

## ٦٤ - باب فِي الْحَفَّارِ يَجِدُ الْعَظْمَ هَلْ يَتَنَكَّبُ ذَلِكَ الْمَكَانَ.

٣٢٠٧ - (صحيح) عن عائيشة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شكاندنی ئێسكی مردو وەك ئەوە وایە بە زیندویتی بیشكێنی). - كەواتە دەبێ گۆڕەكە لە جێگایەكی تردا هەڵكەنرێت - .

# باسی سەبارەت بە هەڵکەندنی گۆڕ لەسەر شێوەی (اللحد).

## ٦٥ - باب فِي اللَّحْدِ.

٣٢٠٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اللَّحْدُ لَنَا وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( (اللحد) بۆ ئێمەیەو، (الشق)یش بۆ غەیری ئێمەیە). - (لحد) ئەو هەڵکەندنەیە لە تەنیشتی گۆڕەکەوە لای قیبلەوە دەکرێت، بە خشت یان بلۆك یا بە بەرد هەڵئەچنرێت، بەڵام(شق)چاڵێکە لەناوەڕاستی گۆڕەکەدا ئەملاو لای بە خشت یان بلۆك یا بە بەرد هەڵئەچنرێت و مردووەکەی تێ دەخرێت پاشان سەری بۆ دەکرێت بە بەرد یا بە شتی تر - .

# باسی چەند کەس دەچنە ناو گۆڕەوە.

## ٦٦ - باب كَمْ يَدْخُلُ الْقَبْرَ.

٣٢٠٩ - (صحيح) عن عامر قال: غَسَّلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيٌّ وَالْفَضْلُ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ, وَهُمْ أَدْخَلُوهُ قَبْرَهُ. قَالَ: وَحَدَّثَنِي مُرَحَّبٌ أَوِ ابْنُ أَبِي مُرَحَّبٍ: أَنَّهُمْ أَدْخَلُوا مَعَهُمْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ, فَلَمَّا فَرَغَ عَلِيٌّ قَالَ: إِنَّمَا يَلِي الرَّجُلَ أَهْلُهُ.

واتە: لە عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: عەلی و (فضل) و ئوسامەی کوڕی زەید جەنازەی پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم شۆرد، هەر ئەوانیش دابەزینە ناو گۆڕەکەیەوەو دایانهێڵایە ناویەوە، عامیر وتی: مورەححەب یان ئیبنو

ئەبو مورەححەب بۆی گێڕامەوە: (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفیشیان لەگەڵ بوو، کاتێ کە عەلی لێ بووەوە وتی: پیاو دەبێ کەسوکاری خۆی لەپێشترن کە سەرەوکاری بکەن.

٣٢١٠ - (صحيح) عن أبو مرحب: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ نَزَلَ فِي قَبْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِمْ أَرْبَعَةً.

واتە: لە ئەبو مورەححەبەوە دەگێرنەوە، کە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف دابەزیە ناو گۆڕەکەی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، راوی وتی: وەکو ئێستا تەماشایان بکەم چوار کەس بوون - کە بریتی بوون لە عەلی و (فضل) و ئوسامەی کوڕی زەید و (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف - .

## باسی مردو چۆن دەخرێتە ناو گۆڕەوە.

## ٦٧ - باب كيف يدخل الميت قبره.

٣٢١١ - (صحيح) عن أبو اسحاق قال: أَوْصَى الْحَارِثُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ فَصَلَّى عَلَيْهِ, ثُمَّ أَدْخَلَهُ الْقَبْرَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرِ, وَقَالَ: هَذَا مِنَ السُّنَّةِ.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (حارث) وەسیەتی کرد کە (عبد الله)ی کوڕی یەزید نوێژی لەسەر بکات، ئەویش نوێژی لەسەر کرد، لەپاشدا لەلای پێینی (جێی دووپێی) گۆڕەکەوە دایهێڵایە ناو گۆڕەکەوە، (عبد الله)ی کوڕی یەزید وتی: ئەمە سوننەتە.

## باسی دانیشتن لەلای گۆڕ.

## ٦٨ - باب جلوس عند القبر.

٣٢١٢ - (صحيح) عن البراء بن عازب قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمْ يُلْحَدْ بَعْدُ, فَجَلَسَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ, وَجَلَسْنَا مَعَهُ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ جەنازەی پاوێکی ئەنصاریدا دەرچوین بۆ گۆڕستان بۆ ناشتنی، کاتێ کە گەیشتین گۆڕەکە بەتەواوەتی هەڵنەکەنرا بوو، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشت بەرەو رووی قیبلەو، ئێمەش لە خزمەتیدا دانیشتین.

## باسی دەربارەی پاڕانەوە بۆ مردو لەکاتی خستنە ناو گۆڕەکەی.

## ٦٩ - باب فِي الدُّعَاءِ لِلْمَيِّتِ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ.

٣٢١٣ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا وَضَعَ الْمَيِّتَ فِي الْقَبْرِ, قَالَ: (بِسْمِ اللَّهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ مردوی دەخستە ناو گۆڕەوە، دەیفەرموو: (بەناوی خواوەو لەسەر سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم).

## باسی پیاوێ بمرێت و خزمی نزیکی هاوبەش بۆ خوا دانەری هەبێت.

## ٧٠ - باب الرَّجُلِ يَمُوتُ لَهُ قَرَابَةٌ مُشْرِكٍ.

٣٢١٤ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: قلت للنبي صلى الله عليه وآله وسلم: إِنَّ عَمَّكَ الشَّيْخَ الضَّالَّ قَدْ مَاتَ, قَالَ: (اذْهَبْ فَوَارِ أَبَاكَ, ثُمَّ لاَ تُحْدِثَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَأْتِيَنِى). فَذَهَبْتُ فَوَارَيْتُهُ وَجِئْتُهُ, فَأَمَرَنِى فَاغْتَسَلْتُ وَدَعَا لِى.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم وت: مامە گومڕاکەت مرد، فەرمووی: (بڕۆ باوکت بکە بەژێر گڵەوە، لەپاشدا هیچ قسەم لەگەڵ مەکە هەتا دێیتەوە بۆ لام). منیش ڕۆشتم کردم بە ژێر گڵەوەو هاتمەوە بۆ خزمەتی، فەرمانی پێ کردم خۆم شۆری و بۆم پاڕایەوە.

## باسی سەبارەت بە قوڵکردنی گۆڕ.

## ٧١ - باب فِى تَعْمِيقِ الْقَبْرِ.

٣٢١٥ - (صحيح) عن هشام بن عامر قال: جَاءَتِ الأَنْصَارُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ, فَقَالُوا: أَصَابَنَا قَرْحٌ وَجَهْدٌ فَكَيْفَ تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا وَاجْعَلُوا الرَّجُلَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِى الْقَبْرِ). قِيلَ: فَأَيُّهُمْ يُقَدَّمُ؟ قَالَ: (أَكْثَرُهُمْ قُرْآنًا). قَالَ أُصِيبَ أَبِى يَوْمَئِذٍ عَامِرٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ, أَوْ قَالَ وَاحِدٌ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عامیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: یاریدەدەران لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا هاتن سکاڵایان هێنایە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەو هەموو کوژراو و زامدارانە، وتیان: فەرمانت بە چی یە؟جا ئەویش

فەرمووی: (چاڵ بکەنن و فراوانی بکەن و دوو دوو سێ سێ بیاننێژن لە گۆڕێکدا، وترا: کامەیان پێش بخەین؟ فەرمووی: ئەوەیان کە زیاتر قورئانی لەبەرە. وتی: ئەوکاتە باوکم لەگەڵ دوو کەس یان یەك کەس خرانە ناو گۆڕێکەوە.

٣٢١٦ - (صحيح) عن حميد بن هلال بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ, زَادَ فِيهِ: (وَأَعْمِقُوا).

واتە: لە حومەیدی کوڕی هیلالەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (قوڵی بکەن).

٣٢١٧ - (صحيح) عن سعد بن هشام بن عامر, بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامیرەوە فەرموودەی پێشو هاتوە.

## باسی سەبارەت بە ڕێککردنی گۆڕ.

## ٧٢ - باب فِي تَسْوِيَةِ الْقَبْرِ.

٣٢١٨ - (صحيح) عن أبو هياج الأسدي قال: بَعَثَنِي عَلِيٌّ, قَالَ لِي: أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَنْ لاَ أَدَعَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلاَّ سَوَّيْتُهُ, وَلاَ تِمْثَالاً إِلاَّ طَمَسْتُهُ.

واتە: لە ئەبو هەییاجی ئەسەدیەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ ناردمی، پێی وتم: ئایا ڕەوانەت نەکەم بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم منی بۆ ڕەوانە کرد؟ کە واز مەهێنە لە هیچ گۆڕێکی بەرز هەتا ڕێکی نەکەیت و، واز مەهێنە لە هیچ پەیکەرێك هەتا لەناوی دەبەیت.

٣٢١٩ - (صحيح) عن ابو علي الهمداني قال: كُنَّا مَعَ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ بِرُودِسَ مِنْ أَرْضِ الرُّومِ, فَتُوُفِّيَ صَاحِبٌ لَنَا, فَأَمَرَ فَضَالَةُ بِقَبْرِهِ فَسُوِّيَ, ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُ بِتَسْوِيَتِهَا.

واتە: لە ئەبو عەلی هەمەدامییەوە هاتوە، کە وتویەتی: ئێمە لە رودیس کە دورگەیەکە لە وڵاتی رۆم لەگەڵ (فضالة)ی کوڕی عوبەید بووین، هاوڕێیەکمان مرد، (فضالة) فەرمانی کرد گۆڕەکەی رێك بکەین لەگەڵ زەوی، لەپاشدا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو فەرمانی کرد بە رێککرنی گۆڕ.

٣٢٢٠ - (ضعيف) عن القاسم قال: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ, فَقُلْتُ: يَا أُمَّهْ اكْشِفِي لِي عَنْ قَبْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَاحِبَيْهِ رضى الله عنهما, فَكَشَفَتْ لِي عَنْ ثَلاَثَةِ قُبُورٍ لاَ مُشْرِفَةٍ وَلاَ لاَطِئَةٍ, مَبْطُوحَةٍ بِبَطْحَاءِ الْعَرْصَةِ الْحَمْرَاءِ, قَالَ أَبُو عَلِيٍّ: يُقَالُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُقَدَّمٌ, وَأَبُو بَكْرٍ عِنْدَ رَأْسِهِ, وَعُمَرُ عِنْدَ رِجْلَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە قاسیمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆلای خاتو عائیشەی دایکی باوەڕداران پێم وت: ئەی دایە گۆڕی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هەردوو هاوەڵەکەیم نیشان بدە، ئەویش سێ گۆڕی نیشان دام، نە بەرز بوون نە رێکی زەوی بوون بەڵکو کەمێك لە زەوی بەرزتر بوون، گڵی سوریان بەسەرەوە بوو. ئەبوو عەلی وتی: دەوترێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەلای پێشەوە بوو، ئەبوو بەکر لەلای سەریەوە بوو، عومەریش لەلای پێکانی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم بوو.

## باسی داوای لێ خۆشبوون کردن بۆ مردو لەدوای لێبوونەوە لەشاردنەوەی.

## ٧٣ - باب الاِسْتِغْفَارِ عِنْدَ الْقَبْرِ لِلْمَيِّتِ فِي وَقْتِ الاِنْصِرَافِ.

٣٢٢١ - (صحيح) عن عثمان بن عفان قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ, فَقَالَ: (اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ, فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ).

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی عەفانەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ لە شاردنەوەی مردوو لێ دەبووەوە لەسەری دەوەستاو دەیفەرموو: (داوای لێ خۆشبوون بۆ براکەتان بکەن و داوای دامەزراوی بۆ بکەن، چونکە هەر ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت).

## باسی کەراهەتی سەربڕین لەسەر گۆڕ.

## ٧٤ - باب كَرَاهِيَةِ الذَّبْحِ عِنْدَ الْقَبْرِ.

٣٢٢٢ - (صحيح) عن أنس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ عَقْرَ فِي الإِسْلاَمِ). قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: كَانُوا يَعْقِرُونَ عِنْدَ الْقَبْرِ بَقَرَةً أَوْ شَاةً.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو جۆرە سەربڕینەی کە پێی دەوترێت (عقر) لەئیسلامدا نەماوە). (عَبْدُ الرَّزَّاق) وتی: لەسەردەمی نەفامی دا لەلای گۆڕدا مانگایە یان شەکێکیان سەردەبڕی.

## باسی نوێژکردن لەسەر گۆڕی مردو لەپاش ماوەیە.

## ٧٥ - باب الْمَيِّتِ يُصَلَّى عَلَى قَبْرِهِ بَعْدَ حِينٍ.

٣٢٢٣ - (صحيح) عن عقبة بن عامر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ, ثُمَّ انْصَرَفَ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رۆژێ رۆشتە دەرەوە نوێژی مردوی لەسەر شەهیدەکانی جەنگی ئوحود کرد، لەپاشدا گەڕایەوە.

٣٢٢٤ - (صحيح) عن يزيد بن أبي حبيب بِهَذَا الْحَدِيثِ, قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى عَلَى قَتْلَى أُحُدٍ بَعْدَ ثَمَانِ سِنِينَ كَالْمُوَدِّعِ لِلأَحْيَاءِ وَالأَمْوَاتِ.

واتە: لە یەبوو حەبیبەوە، فەرموودەی پێشو هاتوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای هەشت ساڵ نوێژی مردوی لەسەر شەهیدەکانی جەنگی ئوحود کرد، وەکو ماڵاوایی لە مردوان و زیندوان.

## باسی دەربارەی دروستکردنی بینا لەسەر گۆڕ.

## ٧٦ - باب فِي الْبِنَاءِ عَلَى الْقَبْرِ.

٣٢٢٥ - (صحيح) عن جابر قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُقْعَدَ عَلَى الْقَبْرِ, وَأَنْ يُقَصَّصَ, وَيُبْنَى عَلَيْهِ.

واتە: لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: بیستوومە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتنی لەسەر گۆڕ قەدەغەکردوە، هەروەها گەچکاری کردنی و خانو لەسەر دروستکرنیشی.

٣٢٢٦ - (صحيح) عن جابر، بِهَذَا الْحَدِيثِ, قَالَ أَبو دَاوُدَ: قَالَ عُثْمَانُ: أَوْ يُزَادَ عَلَيْهِ, وَزَادَ سُلَيْمَانُ بْنُ مُوسَى: أَوْ أَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهِ, وَلَمْ يَذْكُرْ مُسَدَّدٌ فِي حَدِيثِهِ, أَوْ يُزَادَ عَلَيْهِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ خَفِيَ عَلَيَّ مِنْ حَدِيثِ مُسَدَّدٍ حَرْفُ وَأَنْ.

واتە: لە جابرەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشو هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: (عُثْمَانُ) وتی: یان جگە لەگەڵ هیچ شتێکی تری بەسەرەوە نەبێت بەرزی بکاتەوە. سولەیمانی کوڕی موسا ئەمەی بۆ زیاد کرد، (یان لەسەری بنوسرێت) واتە نوسینی لەسەر گۆڕ قەدەغەکردوە، موسەددەد لە فەرموودەکەیدا باسی نەکرد، یان یان جگە لەگەڵ هیچ شتێکی تری بەسەرەوە نەبێت بەرزی بکاتەوە. ئەبوو داود دەڵێت: لە فەرموودەکەی موسەددەد دا (وَأَنْ)ی پێش (یبنی علیە)م لەبەر نەکردوە.

٣٢٢٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ اتَّخَذُوا قُبوورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە جولەکەکان بکوژێت کە گۆڕەکانی پەیامبەرانیان دەکرد بە مزگەوت).

## باسی خراپی دانیشتن لەسەر گۆڕ.

## ٧٧ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الْقُعُودِ عَلَى الْقَبْرِ.

٣٢٢٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتَحْرِقَ ثِيَابَهُ حَتَّى تَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ, خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە لەسەر پشکۆیەك دابنیشێت جل و بەرگەکەی بسوتێنێ و بگاتە پێستی، چاکترە بۆی لەوەی لەسەر گۆڕێك دابنیشێ).

٣٢٢٩ - (صحيح) عن أبو مرثد الغنوي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبوورِ وَلاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا).

واتە: لە ئەبو (مرثد)ی غەنەوییەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەرەو گۆڕ نوێژ نەکەن و لەسەریشی دانەنیشن).

## باسی رێکردن بە نەعلەوە بەناو گۆڕەکاندا.

## ٧٨ - باب الْمَشْيِ فِي النَّعْلِ بَيْنَ الْقُبورِ.

٣٢٣٠ - (حسن) عن بشير مولى رسول الله صلى الله عليه وسلم - وَكَانَ اسْمُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ زَحْمُ بْنُ مَعْبَدٍ, فَهَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (مَا اسْمُكَ؟). قَالَ: زَحْمٌ. قَالَ: (بَلْ أَنْتَ بَشِيرٌ) – قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أُمَاشِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِقُبورِ الْمُشْرِكِينَ, فَقَالَ: (لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلاَءِ خَيْرًا كَثِيرًا). ثَلاَثًا, ثُمَّ مَرَّ بِقُبورِ الْمُسْلِمِينَ, فَقَالَ: (لَقَدْ أَدْرَكَ هَؤُلاَءِ خَيْرًا كَثِيرًا). وَحَانَتْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَظْرَةٌ, فَإِذَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي الْقُبوورِ عَلَيْهِ نَعْلاَنِ فَقَالَ: (يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ, وَيْحَكَ! أَلْقِ سِبْتِيَّتَيْكَ). فَنَظَرَ الرَّجُلُ, فَلَمَّا عَرَفَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلَعَهُمَا فَرَمَى بِهِمَا.

واتە: لە بەشیری خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم کە لەسەردەمی نەفامیدا ناوی زەحمی کوڕی مەعبەد بوو کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (ناوت چی یە؟)، وتی: زەحم،

فەرمووی: (نا بەڵکو تۆ بەشیری واتە تۆ ناوت بەشیرە). بەشیر وتی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم رێم دەکرد دای بەلای گۆری بێ باوەڕو هاوبەش پەیداکەراندا، سێ جار فەرمووی: (ئا ئەمانە خێر و چاکەیەکی زۆریان لەدەست چو)، لەپاشدا دای بەلای گۆڕی موسوڵماناندا، فەرمووی: (ئا ئەمانە خێر و چاکەیەکی زۆریان دەستکەوتوە)، لەوکاتەدا کە رێی دەکرد چاوی کەوت بە پیاوێ بەناو گۆڕەکاندا بە نەعلەکانیەوە رێی دەکرد، فەرمووی: (ئەی ئەو کەسەی کە نەعلی (سبتیت) لەپێدایە نەعلەکانت دابنێ)، کابرا کە سەیری کرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناسیەوە، یەکسەر نەعلەکانی داکەندو فرێی دان.

٣٢٣١ - (صحيح) عن أنس, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ بەندە دایدەنێن لەناو گۆڕدا، هاوڕێکانی بەرەودوا دەگەڕێنەوە گوێی لە چرپەو دەنگی نەعلەکانیانە).

## باسی دەربارەی گواستنەوەی مردو لەشوێنی خۆی لەبەر روداوێ.

## ٧٩ - باب فِي تَحْوِيلِ الْمَيِّتِ مِنْ مَوْضِعِهِ لِلأَمْرِ يَحْدُثُ.

٣٢٣٤ - (صحيح الإسناد) عن جابر قال: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ, فَكَانَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ حَاجَةٌ, فَأَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ, فَمَا أَنْكَرْتُ مِنْهُ شَيْئًا إِلاَّ شُعَيْرَاتٍ كُنَّ فِي لِحْيَتِهِ مِمَّا يَلِي الأَرْضَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکیان لەگەڵ باوکم ناشت، لە دەروونمدا شتێ دروست بوو بۆ دەرهێنانی باوکم لە گۆڕەکەی، جا لەدوای شەش

مانگ دەرمهێنا هیچ نەگۆڕا بوو وەك خۆی بوو تەنها چەن تاڵە مویەکی ریشی نەبێ گۆڕا بوون بەهۆی نوسانیان بە زەویەوە.

## باسی دەربارەی باسکردنی مردو بە چاکە.

## ٨٠ - باب فِي الثَّنَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ.

٣٢٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: مَرُّوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا, فَقَالَ: (وَجَبَتْ). ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا, فَقَالَ: (وَجَبَتْ). ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ شُهَدَاءُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جەنازەیەکیان بەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم برد خەڵکەکە بە باشی باسیان کرد، فەرمووی: (پێویست بوو). - واتە مادەم بە باشی باسیان کرد بەهەشتی بۆ پێویست بوو - لەپاشدا جەنازەیەکی تریان بەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم برد خەڵکەکە بە خراپی باسیان کرد، فەرمووی: (پێویست بوو). - واتە مادەم بە خراپە باسیان کرد ئاگری دۆزەخی بۆ پێویست بوو - لەپاشدا فەرمووی: (هەندێکتان شایەتن بەسەر هەندێکی ترتانەوە).

## باسی سەبارەت بە سەردانی گۆڕستان.

## ٨١ - باب فِي زِيَارَةِ الْقُبورِ.

٣٢٣٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْرَ أُمِّهِ فَبَكَى, وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, (اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي تَعَالَى عَلَى أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا, فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي, فَاسْتَأْذَنْتُ أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا, فَأُذِنَ لِي, فَزُورُوا الْقُبورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ بِالْمَوْتِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە سەر گۆڕی دایکی و دەستی کرد بە گریان، ئەوانەی کە لەدەوری بوون گریان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (داوام کرد لە خوای گەورەو پەروەردگارم کە مۆڵەتم بدات داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم بەڵام مۆڵەتی نەدام، هەروەها داوام لێ کرد کە مۆڵەتم بدات سەردانی گۆڕەکەی بکەم مۆڵەتی پێدام، سەردانی گۆڕستان بکەن لەبەرئەوەی مردنتان یاد دەخاتەوە).

٣٢٣٥ - (صحيح) عن ابن بريدة, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبوورِ, فَزُورُوهَا, فَإِنَّ فِي زِيَارَتِهَا تَذْكِرَةً).

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغەکردبوون، سەردانی گۆڕستان بکەن، بەڕاستی سەردانی گۆڕستان بیرخەرەوەیە واتە مردن و قیامەتتان بیردەخاتەوە).

## باسی سەبارەت بە سەردانی ئافرەتان بۆ گۆڕستان.

## ٨٢ - باب فِي زِيَارَةِ النِّسَاءِ الْقُبوورَ.

٣٢٣٦ - (ضعيف) عن ابن عباس, لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَائِرَاتِ الْقُبوورِ, وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَالسُّرُجَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتانەی کە زۆر سەردانی گۆڕستان دەکەن، لەو کەسانەش کە مزگەوتی لەسەر دروست دەکەن، لەوانەش کە چرای لەسەر دادەگرسێنن.

## باسی لەکاتی سەردانی گۆڕستان یان دان بەلایدا چی دەوترێت.

## ٨٣ - باب مَا يَقُولُ إِذَا زَارَ الْقُبوورَ أَوْ مَرَّ بِهَا.

٣٢٣٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ إِلَى الْمَقْبَرَةِ فَقَالَ (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ, وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچو بۆ گۆڕستان، فەرمووی: (سەلامتان لێ بێ ئەی خەڵکی بڕواداری ئەم مەنزڵگایە، (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئێمەش بە ئێوە دەگەین).

## باسی ئەگەر کەسێ لە ئیحرامدا مرد چی لێ بکرێت؟

## ٨٤ - باب الْمُحْرِمِ يَمُوتُ كَيْفَ يُصْنَعُ بِهِ.

٣٢٣٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَجُلٍ وَقَصَتْهُ رَاحِلَتُهُ, فَمَاتَ وَهُوَ مُحْرِمٌ, فَقَالَ: (كَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ, وَاغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ, وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ, فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُلَبِّى). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ خَمْسُ سُنَنٍ: (كَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ). أَيْ يُكَفَّنُ الْمَيِّتُ فِي ثَوْبَيْنِ, (وَاغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ). أَيْ إِنَّ فِي الْغَسَلاَتِ كُلِّهَا سِدْرًا, (وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ). وَلاَ تُقَرِّبووهُ طِيبًا, وَكَانَ الْكَفَنُ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە ئیحرامدا بوو لەسەر وشترەکەی کەوتەخوارەوە ملی شکاو مرد، هێنایان بۆ

خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (ئەو دوو پۆشاکەی خۆی بۆ بکەن بە کفن واتە ئیحرامەکەی، بە ئاو و مۆرد بیشۆن، سەری دامەپۆشن، لەبەرئەوەی خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا کاتێ کە زیندوی دەکاتەوە (لبيك، لبيك) دەڵێتەوە). ئەبوو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو دەیوت: لەم فەرموودەدا پێنج سوننەت هەیە: (ئەو دوو پۆشاکەی بۆ بکەن بە کفن واتە ئیحرامەکەی)، واتە مردو بە دوو پۆشاك کفن دەکرێت، (بە ئاو و مۆرد بیشۆن)، (سەری دامەپۆشن)، بۆنی خۆشی نزیك مەکەنەوە، کفن لە ئەسڵی ماڵ دەکرێت بۆ مردوکە لەدوای ئەوە میراتگرەکانی میراتی لێ دەگرن.

٣٢٣٩ - (صحيح) عن ابن عباس نحوه قال: (وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: قَالَ سُلَيْمَانُ: قَالَ أَيُّوبُ: (ثَوْبَيْهِ). وَقَالَ عَمْرٌو: (ثَوْبَيْنِ). وَقَالَ ابْنُ عُبَيْدٍ: قَالَ أَيُّوبُ: (فِي ثَوْبَيْنِ). وَقَالَ عَمْرٌو: (فِي ثَوْبَيْهِ). زَادَ سُلَيْمَانُ وَحْدَهُ: (وَلاَ تُحَنِّطُوهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (ئەو دوو پۆشاکەی بۆ بکەن بە کفن)، ئەیوب وتی: (ثَوْبَيْهِ). عەمر وتی: (ثَوْبَيْنِ). ئیبنو عوبەید وتی: ئەیوب وتی: (فِي ثَوْبَيْنِ). عەمر وتی: (فِي ثَوْبَيْهِ). سولەیمان ئەمەی بۆ زیاد کرد: (وَلاَ تُحَنِّطُوهُ) واتە: بۆنی خۆشی لێ مەدەن.

٣٢٤٠ - (صحيح) عن ابن عباس نحوه, بِمَعْنَى سُلَيْمَانَ: (فِي ثَوْبَيْنِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموودەی پێشو هاتوە بە هەمان مانای فەرموودەکەی سولەیمان: (فِي ثَوْبَيْنِ) واتە لەدوو پۆشاکدا.

٣٢٤١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: وَقَصَتْ بِرَجُلٍ مُحْرِمٍ نَاقَتُهُ فَقَتَلَتْهُ فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (اغْسِلُوهُ, وَكَفِّنُوهُ, وَلاَ تُغَطُّوا رَأْسَهُ, وَلاَ تُقَرِّبُوهُ طِيبًا, فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يُهِلُّ).

واته: له ئیبنو عەباسەوه رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگیٚرنەوه، که وتویەتی: پیاویٚ له ئیحرامدا بوو لەسەر وشترەکەی کەوتەخوارەوه ملی شکاو مرد، هیٚنایان بۆ خزمەت پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیشۆن و، کفنی بکەن و، سەری دامەپۆشن و، بۆنی خۆشی نزیك مەکەنەوه، لەبەرئەوەی کاتیٚ که زیندو کرایەوه: (لبیك، لبیك) دەڵیٚتەوه).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی سوێندخواردنەکان و (نذر)کردنەکان.

# ١٦ - أول كتاب الأيمان والنذور.

## باسی سەبارەت بە سزای توندی سوێندخواردنی درۆ.

## ١ - باب التَّغْلِيظِ فِي اليمين الْفَاجِرَةِ.

٣٢٤٢ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ مَصْبورَةٍ كَاذِبًا, فَلْيَتَبوأْ بوَجْهِهِ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی سوێندی مەحکەمە بەدرۆ بخوات با جێگەی خۆی بگرێت لەناو ئاگری دۆزەخدا لەسەر رووی دەخرێتە ناویەوە).

## باسی ئەوکەسەی سوێندی درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی تر ببچڕێت بۆ خۆی.

## ٢ - باب فِيمَنْ حلَفَ يَمِينًا لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالاً لأَحَدٍ.

٣٢٤٣ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ). فَقَالَ الأَشْعَثُ: فِيَّ وَاللَّهِ كَانَ ذَلِكَ, كَانَ بَيْنِى وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ

أَرْضٌ, فَجَحَدَنِي, فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟). قُلْتُ: لاَ. قَالَ لِلْيَهُودِيِّ: (احْلِفْ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِذًا يَحْلِفُ وَيَذْهَبُ بِمَالِي, فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً) إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واته: له (عبدلله) - ی كوڕی مەسعود- ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەدرۆ سوێند بخوات بۆ ئەوەی ماڵی كەسێكی تر ببچڕێت بۆ خۆی كاتێ كە دەگات بە دیداری خوای پەروەردگار لێی توڕەیەو سزای دەدات). (أَشْعَث) وتی: سوێند بە (الله) ئەمە لەمن رویداوە، پارچەیە زەویم هەبوو لە نێوان من و پیاوێكی جولەكەدا بوو، كێشە كەوتە نێوانمانەوە لەسەری جولەكەكە ئینكاری دەكردم و نكوڵی لێ كرد زەویەكەی بە هی خۆی دەزانی، منیش سكاڵام بەرزكردەوە بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جولەكەكەم بردە خزمەتی، پێی فەرمووم: (بەڵگەت هەیە؟). وتم: نەخێر، بە جولەكەكەی فەرموو: (سوێند بخۆ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كەواتە سوێند دەخوات و ماڵەكەی من دەبات بۆ خۆی، خوای پەروەردگار لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَـٰنِهِمۡ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٧﴾ ﴾ سورە آل عمران: ٧٧.

واتە: بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو و سوێندەكانی خۆیان بەنرخێكی كەم، ئەوانە بێبەشن لە (بەهرەی خوا) لەرۆژی دوایی دا و، خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناكات و، تەماشایان ناكات لەرۆژی قیامەتدا، وە لە گوناهیان خۆش نابێت، وە بۆ ئەوان هەیە سزای بە ئازار.

٣٢٤٤ - (صحيح) عن الأشعث بن قيس: أَنَّ رَجُلاً مِنْ كِنْدَةَ وَرَجُلاً مِنْ حَضْرَمَوْتَ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَرْضٍ مِنَ الْيَمَنِ, فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا

رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ أَرْضِي اغْتَصَبَنِيهَا أَبو هَذَا, وَهِيَ فِي يَدِهِ. قَالَ: (هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟). قَالَ: لاَ, وَلَكِنْ أُحَلِّفُهُ: وَاللَّهِ مَا يَعْلَمُ أَنَّهَا أَرْضِي اغْتَصَبَنِيهَا أَبووهُ, فَتَهَيَّأَ الْكِنْدِيُّ لِلْيَمِينِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَقْتَطِعُ أَحَدٌ مَالاً بِيَمِينٍ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ أَجْذَمُ). فَقَالَ الْكِنْدِيُّ: هِيَ أَرْضُهُ.

واتە: لە (أَشْعَث)ی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە هۆزی کیندە و پیاوێکی خەڵکی (حضرموت) لەخاکی یەمەن لەسەر پارچە زەوی یە کێشەو هەرا کەوتە نێوانیانەوە، سکاڵایاند گەیاندە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پیاوە (حَضْرَمِيّ)ەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوکی ئەمە زەویەکەی لێ داگیرکردوم و ئێستە بەدەست ئەمەوەیە، فەرمووی: (بەڵگەت هەیە؟). وتی: نەخێر، بەڵام سوێندی بۆ دەخۆم، کە نازانێ زەوی منەو باوکی داگیری کردوە لێم، پیاوە کیندیەکە خۆی ئامادەکرد بۆ سوێند خواردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەسێ ماڵێ بە سوێندی درۆ بپچڕێت بۆ خۆی، کاتێ کە دەگات بە دیداری خوای پەروەردگار دوابڕاوەو هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیەو بە زمانیش ناتوانێ بەرگری لەخۆی بکات). پیاوە کیندیەکە وتی:دەی کەواتە زەوییەکە هی ئەوە.

٣٢٤٥ - (صحيح) عن علقمة بن وائل بن حجر الحضرمي, عن أبيه قال: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ وَرَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا غَلَبَنِي عَلَى أَرْضٍ كَانَتْ لأَبِي, فَقَالَ الْكِنْدِيُّ: هِيَ أَرْضِي فِي يَدِي أَزْرَعُهَا لَيْسَ لَهُ فِيهَا حَقٌّ, قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْحَضْرَمِيِّ: (أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَلَكَ يَمِينُهُ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ فَاجِرٌ لاَ يُبَالِي مَا حَلَفَ عَلَيْهِ لَيْسَ يَتَوَرَّعُ مِنْ شَيْءٍ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ لَكَ مِنْهُ إِلاَّ ذَاكَ). فَانْطَلَقَ لِيَحْلِفَ لَهُ, فَلَمَّا أَدْبَرَ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا لَئِنْ حَلَفَ عَلَى مَالٍ لِيَأْكُلَهُ ظَالِمًا لَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ عَنْهُ مُعْرِضٌ).

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلی کوڕی حوجری (حَضْرَمِيّ)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە خەڵکی (حضرموت) و پیاوێ لە هۆزی کیندە لەسەر کێشەی زەوی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پیاوە (حَضْرَمِيّ)ەکە وتی: ئەم پیاوە زەوییەکی لێ داگیرکردووم بە زوڵم و ستەم کە هی باوکمە بۆی بەجێهێشتوم، پیاوە کیندیەکە وتی: موڵکی منەو بەدەست خۆمەوەیەو کشتوکاڵی تێدا دەکەم، ئەم پیاوە هیچ مافێکی بەو زەوییەوە نیە، وائیل وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە پیاوە (حَضْرَمِيّ)ەکەی فەرموو: (بەڵگەت هەیە؟). وتی: نەخێر، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە پیاوە کیندیەکەی فەرموو: (کەواتە سوێند خواردن لەسەر تۆیە دەبێ سوێندی بۆ بخۆی). پیاوە (حَضْرَمِيّ)ەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم پیاوە پیاوێکی خراپکارە گوێ ناداتێ سوێندی لەسەر دەخوات خۆی لە هیچ شتێکی حەرام ناپارێزێ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەر ئەوەندەی لەسەرە کە سوێند بخوات). جا پیاوە کیندیەکە هەستا ڕۆیشت بۆ ئەوەی سوێند بخوات، کاتێ کە پشتی هەڵکرد بڕوات بۆ سوێندخواردن، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر سوێندی درۆ بخوات لەسەر ماڵێ بۆ ئەوەی بیخوات بە زوڵم و ستەم کاتێ کە دەگات بە خوای گەورە خوای گەورە لێی توڕەیەو سزای توندی دەدات).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی بەرزراگرتنی سوێندخواردن لەسەر منبەرەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي تَعْظِيمِ الْيَمِينِ عِنْدَ مِنْبَرِ النَّبِيِّ.

٣٢٤٦ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَحْلِفُ أَحَدٌ عِنْدَ مِنْبَرِى هَذَا عَلَى يَمِينٍ آثِمَةٍ وَلَوْ عَلَى سِوَاكٍ أَخْضَرَ إِلاَّ تَبوأَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ). أَوْ: (وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ).

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ لەلای ئەم مینبەرەی مندا سوێندی درۆ لەسەر شتێ بخوات، ئەگەرچی لەسەر سیواكێكی تەڕیش بێت ئەوە جێگەی خۆی لە ئاگری دۆزەخدا دادەمەزرێنێ). یان: (ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی مسۆگەر دەكات).

## باسی سوێندخواردن بە غەیری خوا یان بە بتەكان.

## ٤ - باب اليمين بغير الله (أو الْحَلِفِ بِالأَنْدَادِ).

٣٢٤٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَاللاَّتِ, فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ, فَلْيَتَصَدَّقْ) يعني: بِشَيْءٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێكتان سوێندی خوارد لە سوێندەكەیدا وتی: سوێند بە لات، ئەوە با بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) واتە: هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە جگە لە (الله)، هەركەسێ بە هاوڕێكەی بڵێ: وەرە با قومار بكەین ئەوە با چاكە بكات). واتە شتێ بكات بەخێر لە كەفارەتی ئەو سوێنەدا.

٣٢٤٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ, وَلاَ بِأُمَّهَاتِكُمْ, وَلاَ بِالأَنْدَادِ, وَلاَ تَحْلِفُوا إِلاَّ بِاللَّهِ, وَلاَ تَحْلِفُوا بِاللَّهِ إِلاَّ وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە باوكتان و بە دایكتان و بە بتەكان سوێند مەخۆن، بە خوای گەورە نەبێ سوێند مەخۆن، هەتا قسەكانتان ڕاست نەبێ بە خوای گەورەش سوێند مەخۆن).

٣٢٤٩ - (صحيح) عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَدْرَكَهُ وَهُوَ فِي رَكْبٍ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ, فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ, فَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ, أَوْ لِيَسْكُتْ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم پێ گەیشت لەگەڵ کاروانێکدا بوو عومەر بە باوکی سوێندی خوارد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە رێگری لێ کردون سوێند بە باوکتان بخۆن، ئەوەی دەیەوێت سوێند بخوات با بە خوای گەورە سوێند بخوات، یان بێدەنگ بێت).

٣٢٥٠ - (صحيح) عن عمر رضى الله عنه قال: سَمِعَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, نَحْوَ مَعْنَاهُ إِلَى (بِآبَائِكُمْ). زَادَ: قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَذَا ذَاكِرًا وَلاَ آثِرًا.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ ئەبوو دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گوێی لێم بوو، فەرموودەکەی وەك فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا گێڕایەوە هەتا گەیشتە (بِآبَائِكُمْ). بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێشەوا عومەر وتی: سوێند بە (الله) لەوکاتەوە ئەوەم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیستوە نە خۆم سوێندم پێیان خواردوە و نە لەدەمی کەسیی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە.

٣٢٥١- (صحيح) عن سعد بن عبيدة, قال: سَمِعَ ابْنُ عُمَرَ رَجُلاً يَحْلِفُ: لاَ وَالْكَعْبَةِ, فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ).

واتە: لە سەعدی کوڕی عوبەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ گوێی لە پیاوێ بوو بە کەعبە سوێندی دەخواد بەم شێوەیە: (لاَ

وَالْكَعْبَةِ)، ئیبنو عومەر پێی وت: بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (هەرکەس سوێند بخوات بە غەیری خوای گەورە ئەوە هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار داوە).

٣٢٥٢ - (شاذ) عن طلحة بن عبيد الله, يعني في قصة الأعرابي, قال النبي صلى الله عليه وسلم: (أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ دَخَلَ الْجَنَّةَ, وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ).

واتە: لە (طلحة)ی کوڕی (عبید الله)وە، واتە لە بەسەرهاتی عەرەبە دەشتەکیەکەدا، هاتوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ((وَأَبِيهِ) ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە، ((وَأَبِيهِ) ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە).

## باسی خراپی سوێندخواردن بە ئەمانەت.

## ٥- باب كَرَاهِيَةِ الْحَلِفِ بِالأَمَانَةِ.

٣٢٥٣ - (صحيح) عن ابن بريدة عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَلَفَ بِالأَمَانَةِ فَلَيْسَ مِنَّا).

واتە: لە ئیبنو بوورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس سوێند بخوات بە ئەمانەت لەسەر سوننەت و ڕێبازی من نیە).

# باسی (معاریض) لە سوێندخواردندا.

## ٦ - باب الْمَعَارِيضِ فِي الْيَمِينِ.

٣٢٥٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ عَلَيْهَا صَاحِبُكَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێندی تۆ بەگوێرەی سوێندی هاوڕێکەتە کە سوێندت دەدات بە گوێرەی ئەو سوێندە بڕوات پێ دەکات). - (معاریض) بریتیە لەوەی سوێندخۆر شتێکی ئەوێت و جگە لەویش شتێکی تری دەوێت - .

٣٢٥٥ - (صحيح) عن سويد بن حنظلة قال: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ, فَأَخَذَهُ عَدُوٌّ لَهُ, فَتَحَرَّجَ الْقَوْمُ أَنْ يَحْلِفُوا, وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي, فَخَلَّى سَبِيلَهُ, فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي, قَالَ (صَدَقْتَ الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ).

واتە: لە سوەیدی کوڕی (حنظلة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دەرچوین کە بڕۆین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وائیلی کوڕی حوجریشمان لەگەڵدا بوو، دوژمنێکی خۆی توشی بوو، وتی: وائیل، وتی: من وائیل نیم، کابرا وتی: ئەگەر ئەو نیە دەی ئێوە سوێن بخۆن کە ئەو نیە، ئەوانیش لایان قورس و گران بوو سوێند بخۆن، بەڵام من سوێندم خوارد کە ئەمە برای منە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (راست دەکات موسوڵمان برای موسوڵمانە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی سوێندخواردن بە میللەتێ غەیری میللەتی ئیسلام و بڵێ من لە ئیسلام بەریم.

## ٧ - باب مَا جَاءَ فِي الْحَلِفِ بِالْبَرَاءَةِ وَبِمِلَّةٍ غَيْرِ الإِسْلاَمِ.

٣٢٥٦- (صحيح) عن ثابت بن الضحاك, أنه بايع رسول الله صلى الله عليه وسلم تحت الشجرة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ مِلَّةِ الإِسْلاَمِ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ, وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, وَلَيْسَ عَلَى رَجُلٍ نَذْرٌ فِيمَا لاَ يَمْلِكُهُ).

واتە: لە (ثابت)ی کوڕی (ضحاك)ەوە کە یەکێك بوو لەوانەی لەژێر درەختی (رضوان)دا پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ سوێند بخوات بە میللەتێ غەیری میللەتی ئیسلام وەك ئەوەی بڵێ ئەگەر ئەو کارەم کرد لەجێی جولەکە یان گاور بم درۆبکات لەپاشدا ئەو کارە بکات ئەوە وەك ئەوە وایە کە دەیڵێ واتە پێی کافر دەبێت، هەرکەسێ بەشتێ خۆی بکوژێت لەرۆژی قیامەتدا بەو شتە سزا دەدرێتەوە، شتێکیش لەماڵی پیاوێ نەبێ (نذر)ی لەسەر دانامەزرێت) - وەك ئەوەی بڵێ ئەگەر چاك بوومەوە لەم نەخۆشیەم بەندەی فلانە کەس ئازاد بێت -.

٣٢٥٧- (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ, فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ, وَإِنْ كَانَ صَادِقًا فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الإِسْلاَمِ سَالِمًا).

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی بوورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ سوێند بخوات لەسەر شتێ بڵێ لەدینی ئیسلام بەشم براێ ئەمە وایەو واش نەبێت واتە

درۆبکات ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایە، واتە بەش براوە، ئەگەر قسەکەشی راست بێت بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ سەر دینی ئیسلام).

## باسی پیاوێ سوێند بخوات کە (إدام) غەیری نان نەخوات وەك رۆن و زەیت و سرکە ئەگەر خورمای خوارد بەنانەوە پێی گوناهبار دەبێت یان نا.

## ٨- باب الرَّجُلِ يَحْلِفُ أَنْ لاَ يَتَأَدَّمَ.

٣٢٥٨- (صحيح) عن يوسف بن عبد الله بن سلام قال: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَضَعَ تَمْرَةً عَلَى كِسْرَةٍ فَقَالَ : (هَذِهِ إِدَامُ هَذِهِ).

واتە: لە یوسوفی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی سەلامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی خورمایەکی لەسەر پارچە نانێك دانا فەرمووی: (ئەمە (إِدَام)ی ئەمەیە) - رونی کردەوە کە خورما لەگەڵ نان (إِدَام)ە.

٣٢٥٩ - (صحيح) عن يوسف بن عبد الله بن سلام، قال: رَأَيْتُ رسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ مِثْلَهُ.

واتە: لە یوسوفی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی سەلامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی، جا یوسوف فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرمودەی پێشو.

## باسی (استثناء) لە سوێندخواردندا.

## ٩ - باب الاِسْتِثْنَاءِ فِي الْيَمِينِ.

٣٢٦٠ - (صحيح) عن ابن عمر: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ, فَقَدِ اسْتَثْنَى).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەسەر شتێ سوێند بخوات بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّه) واتە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت، ئەگەر ئەو شتەش نەکات سوێندی ناکەوێت). - وەك ئەوەی کەسێ سوێند بخوات بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّه) ئەو کارە دەکەم، لەپاشدا کارەکە نەکات مادەم (إِنْ شَاءَ اللَّه) بکات ئەوە (استثناء)ی کردوەو سوێندەکەی ناکەوێت - .

٣٢٦١ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى, فَإِنْ شَاءَ رَجَعَ, وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ, غَيْرَ حِنْثٍ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەسەر شتێ سوێند بخوات (استثناء) بکات، واتە بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّه)، ئەگەر ویستی کارەکە بکات، یان ئەگەر ویستی نەیکات، ئەوە پێی گوناهبار نابێت).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی سوێندخواردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

## ١٠ - باب مَا جَاءَ فِي يَمِينِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كَانَتْ.

٣٢٦٢ - (صحيح) عن ابن عمر قال: أَكْثَرُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْلِفُ بِهَذِهِ الْيَمِينِ: (لاَ, وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە زۆرترین سوێندخواردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە بوو دەیفەرموو: (لاَ, وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ). واتە: نەء بەوەی کە دڵەکان ئەم دیو ئەم دیو دەکات.

٣٢٦٣ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اجْتَهَدَ فِي الْيَمِينِ قَالَ: (وَالَّذِى نَفْسُ أَبِي الْقَاسِمِ بِيَدِهِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوێندی زۆر بخواردایە دەیفەرموو: (وَالَّذِى نَفْسُ أَبِي الْقَاسِمِ بِيَدِهِ) واتە: بەوەی کە نەفسی باوکی قاسمی لە دەستدایە.

٣٢٦٤ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا حَلَفَ يَقُولُ: (لاَ, وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سوێندخواردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر سوێندی بخواردایە ئەمە بوو دەیفەرموو: (لاَ, وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ). واتە: نا، خودایە داوای لێ بوردنت لێ دەکەم.

٣٢٦٥ - (ضعيف) عن عاصم بن لقيط: أَنَّ لَقِيطَ بْنَ عَامِرٍ خَرَجَ وَافِدًا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ لَقِيطٌ: فَقَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ حَدِيثًا فِيهِ : فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (لَعَمْرُ إِلَهِكَ).

واتە: لە عاصیمی کوڕی (لقیط)ەوە، دەگێڕنەوە، کە (لقیط)ی کوڕی عامیر بە نوێنەرایەتی دەرچو بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (لقیط) وتی: گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا فەرمودەیەکی گێڕایەوە تێیدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لَعَمْرُ إِلَهِكَ). واتە: بە بەردەوامی و مانەوەی خوای پەروەردگار سوێندی خوارد.

## باسی سوێند خستن ئەگەر کەفارەتدان ئەگەر خێرتر بوو.

## ١١ - باب الحنث قبل إذا كان خيرا.

٣٢٦٦ - (صحيح) عن أبو بردة, عن أبيه: أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (إِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي, وَأَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ, أَوْ قَالَ: (إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ, وَكَفَّرْتُ يَمِينِي).

واتە: لە ئەبو بووردەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) من بۆ خۆم (إِنْ شَاءَ اللَّه) لەسەر هەرشتێ سوێند بخۆم بە بارێکی تردا بە باشتری بزانم سوێندەکەم دەخەم و کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم).

٣٢٦٧ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن سمرة قال: قال لي النبي صلى الله عليه و سلم: (يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَأْتِ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ, وَكَفِّرْ يَمِينَكَ). قَالَ أَبو دَاوُدَ : سَمِعْتُ أَحْمَدَ يُرَخِّصُ فِيهَا الْكَفَّارَةَ قَبْلَ الْحِنْثِ.

واتە: لە (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورە ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ بۆت دەرکەوت بارەکەی تری راست ترە، ئەوەیان بکە کە خێر ترەو، کەفارەتی سوێندەکەت بدە). ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو روخسەتی دا بە کەفارەتدان لەپێش سوێند خستن دا.

٣٢٦٨ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن سمرة نحوه قال: (فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ, ثُمَّ ائْتِ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ). قَالَ أَبو دَاوُدَ : أَحَادِيثُ أَبِى مُوسَى الأَشْعَرِىِّ وَعَدِىِّ بْنِ حَاتِمٍ وَأَبِى هُرَيْرَةَ فِى هَذَا الْحَدِيثِ رُوِىَ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِى بَعْضِ الرِّوَايَةِ الْحِنْثُ قَبْلَ الْكَفَّارَةِ وَفِى بَعْضِ الرِّوَايَةِ الْكَفَّارَةُ قَبْلَ الْحِنْثِ.

واتە: لە (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، وتی: (کەفارەتی سوێندەکەت بدە، لەپاشدا ئەوەی خێر ترە ئەنجامی بدە). ئەبو داود دەڵێت: فەرمودەکەی ئەبو موسای ئەشعەری و عەدی کوڕی حاتیم و ئەبو هورەیرە لەم فەرمودەدا، لە هەریەکێ لەوانەوە هاتوە، لەهەندێ ریوایەتدا بە سوێند خستن لەپێش کەفارەتداندا هاتوە، لەهەندێ ریوایەتی تردا بە کەفارەتدان لەپێش سوێند خستن دا هاتوە.

## باسی دەربارەی ئایا قەسەم بەبێ (الله) بە سوێندخواردن حسابە یان نا؟

## ١٢ - باب فِى الْقَسَمِ؛ هَلْ يَكُونُ يَمِينًا.

٣٢٦٩ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ أَقْسَمَ عَلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تُقْسِمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە ئەبو بەکر قەسەمی خوارد لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش فەرمووی: (قەسەم مەخۆ).

٣٢٧٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: كَانَ أَبو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : إِنِّ أَرَى اللَّيْلَةَ, فَذَكَرَ رُؤْيَا فَعَبَّرَهَا أَبوو بَكْرٍ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا). فَقَالَ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ لَتُحَدِّثَنِّى مَا الَّذِى أَخْطَأْتُ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (لاَ تُقْسِمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو هورەیرە گێڕایەوە کە پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: من ئەمشەو خەوم دیوە، خەوەکەی گێڕایەوە، ئەبو بەکر خەوەکەی بۆ لێکدایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەندێکیت پێکاو هەندێکیت نەپێکا). وتی: قەسەم لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوکم بە قوربانت بێ ئەوەم پێ بفەرموو کە نەم پێکا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (قەسەم مەخۆ).

٣٢٧١ - (ضعيف) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا الْحَدِيثِ, لَمْ يَذْكُرِ الْقَسَمَ, زَادَ فِيهِ: وَلَمْ يُخْبِرْهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، فەرمودەی پێشو هاتوە، بەڵام باسی (قَسَم) نەهاتوە، لە فەرمودەکەدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی ئەوەی نەدا بە ئەبو بەکر کە نەیپێکا.

## باسی دەربارەی سویندخواردنی درۆ بە ئەنقەست حوکمی چی یە؟

## ١٣ - باب فِي الحلف كاذبا متعمدا.

٣٢٧٢ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَسَأَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الطَّالِبَ الْبَيِّنَةَ, فَلَمْ تَكُنْ لَهُ بَيِّنَةٌ, فَاسْتَحْلَفَ الْمَطْلُوبَ, فَحَلَفَ بِاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَلَى قَدْ فَعَلْتَ, وَلَكِنْ قَدْ غُفِرَ لَكَ بِإِخْلاَصِ قَوْلِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: يُرَادُ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَنَّهُ لَمْ يَأْمُرْهُ بِالْكَفَّارَةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە دوو پیاو سکاڵای کێشەیەکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای بەڵگەی لە (مدعی) شکاتکەر کرد، شکات لێکراو سوێندی خوارد، وتی: بەو (الله)یەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی بە هەق نیە - ئەو کارەم نەکردوە -، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (بەڵێ بەڵکو کردوتە، بەڵام بەهۆی نیازپاکی سوێندەکەتەوە خوای گەورە لێت خۆشبوو). ئەبو داود دەڵێت: مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە فەرمانی پێ نەکرد بەوەی کە کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

## باسی کەفارەتی سوێند چەند مەن(صاع)ە.

## ١٤ - باب كَمِ الصَّاعُ فِي الْكَفَّارَةِ.

٣٢٧٣ - (ضعيف الإسناد) عن حرملة قال: فَوَهَبَتْ لَنَا أُمُّ حَبِيبٍ صَاعًا - حَدَّثَتْنَا عَنِ ابْنِ أَخِى صَفِيَّةَ, عَنْ صَفِيَّةَ, أَنَّهُ صَاعُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَنَسٌ: فَجَرَّبْتُهُ, أَوْ قَالَ: فَحَزَرْتُهُ, فَوَجَدْتُهُ مُدَّيْنِ وَنِصْفًا بِمُدِّ هِشَامٍ.

واتە: لە حەرمەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئوممو حەبیب مەن(صاع)ێکی بە دیاری بۆ هێنام، لە کوڕی برای صەفیەوە، لە صەفیەوە بۆی گێڕامەوە، کە مەن(صاع)ی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم. ئەنەس وتی: تاقیم کردەوە، یان وتی: تەخمینم کرد بینیم دوو مشت(مد)و نیوە بە مشت(مد)ی هیشام.

٣٢٧٤ - (صحيح مقطوع) عن محمد بن محمد بن خلاد أبوو عمر قال: كَانَ عِنْدَنَا مَكُّوكٌ يُقَالُ لَهُ: مَكُّوكُ خَالِدٍ وَكَانَ كَيْلَجَتَيْنِ بِكَيْلَجَةِ هَارُونَ, قَالَ مُحَمَّدٌ: صَاعُ خَالِدٍ صَاعُ هِشَامٍ, يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ الْمَلِكِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی خەلادەوە ئەبوو عومەر دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێوانە (مَكُّوك)کێکمان هەبوو پێیان دەوت: (مَكُّوك)ی خالید، بە ئەندازەی دوو (كَيْلَجَة)ی هارون دەبوو، - (مَكُّوك) پێوانەیە، (كَيْلَجَة) ئەندازەی پێوانەیەکە - موحەممەد وتی: مەن(صاع)ی خالید مەن(صاع)ی هیشامە، واتە هیشامی کوڕی (عبد الملك).

٣٢٧٥ - (صحيح مقطوع) عن أمية بن خالد قال: لَمَّا وُلِّيَ خَالِدٌ الْقَسْرِيُّ أَضْعَفَ الصَّاعَ فَصَارَ الصَّاعُ سِتَّةَ عَشَرَ رَطْلاً. قَالَ أَبو دَاوُدَ : مُحَمَّدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ خَلاَّدٍ قَتَلَهُ الزِّنْجُ صَبْرًا فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا - وَمَدَّ أَبو دَاوُدَ يَدَهُ, وَجَعَلَ بُطُونَ كَفَّيْهِ إِلَى الأَرْضِ, قَالَ : وَرَأَيْتُهُ فِي النَّوْمِ, فَقُلْتُ: مَا فَعَلَ اللَّهُ بِكَ؟ قَالَ: أَدْخَلَنِي الْجَنَّةَ. فَقُلْتُ: فَلَمْ يَضُرَّكَ الْوَقْفُ.

واتە: لە ئومەییەی کوڕی خالیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خالید کرا بە کاربەدەست مەن(صاع) زیادی کرد، بۆیە مەن(صاع)ی بە شانزە رەتڵ دانا، ئەبو داود دەڵێت: موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی خەلاد زنجی یە کوشتی - نە بە هەڵە کوشتی نە لە جیهاددا کوشتی نە لە تۆڵەدا -، ئەبو داود دەستی راکێشا ئاماژەی کرد، بەری دەستەکانی کردە زەوی و وتی: لەخەودا موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی خەلادم دی: وتم: خوای پەروەردگار

چیٚ لیٚ کردی؟ وتی: خستمیە بەهەشتەوە، وتم: ئەی وەستان زیانی پیٚ نەگەیاندی - لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت وەستاندویانە بۆئەوەی بیکوژن یان زیندانیان کردبێت - .

## باسی دەربارەی ئازادکردنی کەنیزەکی باوەڕدار لەکەفارەتدا.

## ١٥ - باب فِي الرَّقَبَةِ الْمُؤْمِنَةِ.

٣٢٧٦ - (صحيح) عن معاوية بن الحكم السلمي قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, جَارِيَةٌ لِي صَكَكْتُهَا صَكَّةً. فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: أَفَلاَ أُعْتِقُهَا, قَالَ: (ائْتِنِي بِهَا). قَالَ: فَجِئْتُ بِهَا قَالَ: (أَيْنَ اللَّهُ). قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: (مَنْ أَنَا). قَالَتْ : أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ : (أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ).

واتە: لە مەعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەنیزەکێکم هەیە جارێ زلەیەکم پێدا کێشا، ئینجا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش ئەو کارەی زۆر لەسەر گەورە کردم، بۆیە وتم: ئایا ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: (بیهێنە بۆ لام). بۆم هێنا، پێی فەرموو: (خوا لە کوێیە؟). وتی: لە ئاسماندایە، فەرمووی: (من کێم؟) وتی: تۆ پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (دەی ئازادی بکە چونکە باوەڕدارە).

٣٢٧٧ - (حسن صحيح) عن الشريد: أَنَّ أُمَّهُ أَوْصَتْهُ أَنْ يُعْتِقَ عَنْهَا رَقَبَةً مُؤْمِنَةً, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ أُمِّي أَوْصَتْ أَنْ أُعْتِقَ عَنْهَا رَقَبَةً مُؤْمِنَةً وَعِنْدِي جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ نُوبِيَّةٌ, فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە شەریدەوە دەگێرنەوە، کە دایکی وەسیەتی بۆ کرد کەنیزەکێکی باوەڕداری بۆ ئازاد بکات، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دایکم وەسیەتی بۆ کردوم کەنیزەکێکی باوەڕداری بۆ ئازاد بکەم بەڵام من کەنیزەکێکی رەشی نوبییەم هەیە، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەی پێشو.

٣٢٧٨ - (صحيح) عن أبوو هريرة: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَارِيَةٍ سَوْدَاءَ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيَّ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً. فَقَالَ لَهَا: (أَيْنَ اللَّهُ). فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ بِأُصْبُعِهَا. فَقَالَ لَهَا: (فَمَنْ أَنَا). فَأَشَارَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِلَى السَّمَاءِ يَعْنِى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ: (أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ کەنزەکێکی رەشی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرمە کەنیزەکێکی باوەڕدار ئازاد بکەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (خوا لە کوێیە؟). بە پەنجەی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان، پێی فەرموو: (ئەی من کێم؟) ئاماژەی کرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بۆ ئاسمان واتە تۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئازادی بکە چونکە باوەڕدارە).

## باسی قەدەغەکردنی نەزرکردن.

## ١٦ - باب النَّهْىِ عَنِ النَّذْرِ.

٣٢٧٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنِ النَّذْرِ وَيَقُولُ: (إنه لاَ يَرُدُّ شَيْئًا, وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ). قَالَ مُسَدَّدٌ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (النَّذْرُ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری دەکرد لە نەزرکردن، فەرمووی: (نەزرکردن هیچ شتێ ناگێڕێتەوە، بەڵکو لەپیاوی ڕژدو چروکی پێ دەردەهێنرێت). موسەددەد وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەزرکردن هیچ شتێ ناگێڕێتەوە).

٣٢٨٠ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ الْقَدَرَ بِشَيْءٍ لَمْ أَكُنْ قَدَّرْتُهُ لَهُ, وَلَكِنْ يُلْقِيهِ النَّذْرُ الْقَدَرَ قَدَّرْتُهُ, يُسْتَخْرَجُ مِنَ الْبَخِيلِ, يُؤْتَى عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُؤْتَى مِنْ قَبْلُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو شتەی کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر نەدابێ بۆ ئادەمیزاد، بە نەزرکردن بۆی نابێت، بەڵام جاری وا دەبێت نەزرەکە لەگەڵ بڕیارەکە یەك دەگرێ و شتەکە ڕوودەدات ئادەمیزاد وا دەزانێت بەهۆی نەزرەکەی ئەوەوە ڕویداوە، ئەو نەزرە لەپیاوی چروك دەردەچێت، پیاوی چروك بەهۆی نەزرەکەوە دەیبەخشێت هەرچەندە پێشی ناخۆشە، لەپێش نەزرەکەدا نەیدەبەخشی).

## باسی ئەوەی کە هاتوە دەربارەی نەزرکردن لەسەر گوناهکردن.

## ١٧ - باب مَا جَاءَ فِي النَّذْرِ فِي الْمَعْصِيَةِ.

٣٢٨١ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ, وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلاَ يَعْصِهِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ نەزری کرد گوێڕایەڵی

خوای گەورە بکات ئەوە با گوێڕایەڵی بکات، هەرکەسێ نەزری کرد گوناهو سەرپێچی خوای گەورە بکات ئەوە با گوناهو سەرپێچی نەکات).

٣٢٨٢ - (صحيح) عن ابن عباس قال: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فِي الشَّمْسِ, فَسَأَلَ عَنْهُ؟ قَالُوا: هَذَا أَبوو إِسْرَائِيلَ, نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ, وَلاَ يَسْتَظِلَّ, وَلاَ يَتَكَلَّمَ, وَيَصُومَ. قَالَ: (مُرُوهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا، پیاوێکی دی لەبەر هەتاو بە پێوە ڕاوەستابوو، لەبارەیەوە پرسی؟ وتیان: ئەوە ئەبوو ئیسرائیلە نەزری کردوە بە پێوە لەبەر هەتاو ڕاوەستێ و، دانەنیشێت و، نەچێتە بەر سێبەر و، قسەنەکات و، بە ڕۆژووش بێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەلایەن منەوە فەرمانی پێ بکەن با قسە بکات و، بچێتە بەر سێبەر و، دابنیشێت، بەڵام ڕۆژووەکەی تەواو بکات).

## باسی ئەوەی پێی وایە کەفارەتی لەسەرە ئەگەر نەزرەکەی لە گوناهو سەرپێچی دا بوو.

## ١٨ - باب مَنْ رَأَى عَلَيْهِ كَفَّارَةً إِذَا كَانَ فِي مَعْصِيَةٍ.

٣٢٨٣ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها قالت: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ( نەزرکردن نیە لە گوناهو سەرپێچی دا، کەفارەتەکەی کەفارەتی سوێندخواردنە).

٣٢٨٤ - عن الزهري, عن ابن شهاب, بِمَعْنَاهُ وَإِسْنَادِهِ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ شَبووِيَةَ يَقُولُ: قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ - يَعْنِي فِي هَذَا الْحَدِيثِ - حَدَّثَ أَبو سَلَمَةَ فَدَلَّ ذَلِكَ عَلَى أَنَّ الزُّهْرِيَّ لَمْ يَسْمَعْهُ مِنْ أَبِي سَلَمَةَ, وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ: وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ مَا حَدَّثَنَا أَيُّوبُ - يَعْنِي ابْنَ سُلَيْمَانَ - قَالَ أَبو دَاوُدَ سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ : أَفْسَدُوا عَلَيْنَا هَذَا الْحَدِيثَ, قِيلَ لَهُ : وَصَحَّ إِفْسَادُهُ عِنْدَكَ, وَهَلْ رَوَاهُ غَيْرُ ابْنِ أَبِي أُوَيْسٍ؟ قَالَ أَيُّوبُ: كَانَ أَمْثَلَ مِنْهُ. يَعْنِي أَيُّوبَ بْنَ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ, وَقَدْ رَوَاهُ أَيُّوبُ.

واتە: لە زوهریەوە، لە ئیبنو شیهابەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: گوێم لێ بوو ئەحمەدی کوڕی شەببوویە دەیوت: ئیبنو موبارەك دەیوت - واتە لەم فەرموودەدا - ئەبوو سەلەمە گێڕایەوە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زوهری لە ئەبو سەلەمەی نەبیستوە، ئەحمەدی کوڕی موحەممەد دەڵێت: (تدلیس)ی زوهری لەم فەرموودەدا ئەمەیە کە ئەیوب - واتە ئیبنو سولەیمانمان بۆی گێڕاوینەتەوە، ئەبو داود دەڵێت: گوێم لێ بوو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەیوت: ئەم فەرمودەیان لێ شێواندین واتە فەرموودەکەی زوهری لە ئەبو سەلەمەوە لە روی سەنەدەوە، پێی وترا: ئایا راستیەکەی لای تۆیە لە روی سەنەدەوە؟ ئایا جگە لە ئیبنو ئەبو ئومیس کەسی تر گێڕاویەتیەوە، لەوەڵامدا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی: ئەیوب وەك ئیبنو ئەبو ئومیس وایە جێگەی متمانەیە، واتە ئەیوبی کوڕی سولەیمان، بەراستی ئەیوب فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە.

٣٢٨٥ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها قالت: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ) [١] .

واتە: عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( نەزرکردن نیە لە گوناهو سەرپێچی دا، کەفارەتەکەی کەفارەتی سوێندخواردنە ).

(١) لە رێگەیەکی ترەوە ئەبو داود ریوایەتی کردوە بۆیە دووبارە بۆتەوە .

٣٢٨٦ - (ضعيف) عن عقبة بن عامر: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أُخْتٍ لَهُ نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ حَافِيَةً غَيْرَ مُخْتَمِرَةٍ, فَقَالَ : (مُرُوهَا فَلْتَخْتَمِرْ وَلْتَرْكَبْ, وَلْتَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە دەربارەی خوشکەکەی کە نەزری کردبوو بەسەری روتی و بە پێی پەتی حەج بکات لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ئەویش فەرمووی: (لەلایەن منەوە فەرمانی پێ بکەن با سەری داپۆشێ و بەسواری وڵاخ حەج بکات، سێ رۆژ بەرۆژوو بێت نەکەفارەتی نەزرەکەیدا).

٣٢٨٧ - عن عبيد الله بن زحر مولى لبني ضمرة, وكان أيما رجل: أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الرُّعَيْنِيَّ أَخْبَرَهُ بِإِسْنَادِ يَحْيَى وَمَعْنَاهُ.

واتە: لە (عبید الله)ی کوڕی زەحرەوە - بەندەی بەنی (ضمرة) کە پیاوێکی چاك بووە، دەگێرنەوە، کە لە ئەبوو سەعیدی روعەینیەوە بە هەمان سەنەدو مانا فەرموودەکەی یەحیا هاتوە.

٣٢٨٨ - (صحيح) عن عقبة بن عامر الجهني قال: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ فَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَاسْتَفْتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خوشکم نەزری کردبوو بە پێی پەتی بڕوات بۆ ماڵی خوا، فەرمانی پێکردم پرسیاری بۆ بکەم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە، منیش بۆم پرسی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بە پیادەو بە سواریش با بڕوا).

٣٢٨٩ - عن ابن عباس: أَنَّ أُخْتَ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ إِلَى الْبَيْتِ, فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَرْكَبَ وَتُهْدِيَ هَدْيًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: كە خوشكێكی عوقبەی كوڕی عامیر نەزری كرد بە پێ بڕوات بۆ ماڵی خوا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێكرد بەوەی كە سواری وڵاخ ببێت و ئاژەڵێ سەرببڕێت.

٣٢٩٠ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا بَلَغَهُ أَنَّ أُخْتَ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ مَاشِيَةً قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ نَذْرِهَا مُرْهَا فَلْتَرْكَبْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی پێ گەیشت خوشكێكی عوقبەی كوڕی عامیر نەزری كردوە بە پێ بڕوات بۆ حەج، فەرمووی: (خوای گەورە دەوڵەمەندەو پێویستی بە نەزری ئەو نیە، لەلایەن منەوە فەرمانی پێ بكەن با بەسواری وڵاخ ببێت و حەجەكەی بكات).

٣٢٩١ - (صحيح بما قبله) عن عكرمة: أَنَّ أُخْتَ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ, بِمَعْنَى هِشَامٍ, وَلَمْ يَذْكُرِ الْهَدْيَ, وَقَالَ فِيهِ: (مُرْ أُخْتَكَ فَلْتَرْكَبْ).

واتە: لە عیكریمەوە دەگێڕنەوە، كە خوشكێكی عوقبەی كوڕی عامیر، فەرموودەكەی گێڕایەوە وەك فەرموودەكەی هیشام، بەڵام باسی ئاژەڵێ سەرببڕێت(هدی ) نەكرد، لە فەرموودەكەیدا وتی: ( فەرمان بكە بە خوشكەكەت با سواری وڵاخ ببێت).

٣٢٩٢ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ أُخْتِي نَذَرَتْ - يَعْنِي أَنْ تَحُجَّ مَاشِيَةً - فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَصْنَعُ بِشَقَاءِ أُخْتِكَ شَيْئًا, فَلْتَحُجَّ رَاكِبَةً, وَلْتُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خوشکم نەزری کردوە لەسەرخۆی بە پێ بڕوات بۆ حەج، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە بەو زەحمەتەی خوشکی تۆ هیچ شتێك ناکات، با بەسواری وڵاخ حەجەکەی بکات و، کەفارەتی سوێندەکەی بدات).

٣٢٩٣ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ أُخْتَ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ مَاشِيَةً وَأَنَّهَا لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ مَشْيِ أُخْتِكَ, فَلْتَرْكَبْ, وَلْتُهْدِ بَدَنَةً).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە خوشکێکی عوقبەی کوڕی عامیر نەزری کردوە بە پێ بڕوات بۆ ماڵی خوا، کەچی ئێستا ناتوانێ بەپێ بڕوات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندەو پێویستی بە ڕۆشتنی خوشکەکەت نیە، با سواری وڵاخ ببێت و وشترێ سەرببڕێت).

٣٢٩٤ - (صحيح) عن عقبة بن عامر الجهني, أنه قال للنبي صلى الله عليه و سلم: إِنَّ أُخْتِي نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ إِلَى الْبَيْتِ. فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَصْنَعُ بِمَشْيِ أُخْتِكَ إِلَى الْبَيْتِ شَيْئًا).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی بە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: خوشكم نەزری كردوە بە پێ بڕوات بۆ ماڵی خوا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە بە رۆشتنی خوشكەكەی تۆ بۆ ماڵی خوا هیچ شتێك ناكات).

٣٢٩٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ, فَسَأَلَ عَنْهُ, فَقَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ, فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ). وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێكی بینی دوو كوڕی چوببوونە ژێرباڵی لەنێوانیاندا رێی دەكرد. لەبارەیەوە پرسی، وتیان: نەزری كردوە بە پێ بڕوات بۆ ماڵی خوا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندە پێویستی بەو نیە سزای نەفسی خۆی دەدات). فەرمانی پێ كرد سواری وڵاخ ببێت.

٣٢٩٦ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِإِنْسَانٍ يَقُودُهُ بِخِزَامَةٍ فِي أَنْفِهِ, فَقَطَعَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ, وَأَمَرَهُ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای كەسێكدا تەوافی ماڵی خوای دەكرد بە پەتێ كە وەك رەشمە وابوو كەسێكی تری رادەكێشا تەوافی پێ دەكرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە دەستی خۆی پەتەكەی بڕی و فەرمانی پێ كرد كە دەستی بگرێ و تەوافی پێ بكات.

# باسی کەسێ نەزر بکات لە (بیت المقدس) نوێژ بکات.

## ١٩ - باب مَنْ نَذَرَ أَنْ يُصَلِّيَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ.

٣٢٩٧ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ رَجُلاً قَامَ يَوْمَ الْفَتْحِ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ لِلَّهِ إِنْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكَ مَكَّةَ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ رَكْعَتَيْنِ, قَالَ : (صَلِّ هَا هُنَا), ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ, فَقَالَ: (صَلِّ هَا هُنَا), ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ, فَقَالَ: (شَأْنَكَ إِذًا).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من نەزرم کردوە لەسەرخۆم ئەگەر خوای گەورە مەککەی بۆ ڕزگارکردی لە (بیت المقدس) دوو رکات نوێژ بکەم، فەرمووی: (لێرە ئەو نوێژە بکە)، لەپاشدا پیاوەکە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، فەرمووی: (لێرە ئەو نوێژە بکە)، ئینجا پیاوەکە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، فەرمووی: (ئیتر کەیفی خۆتە حەز دەکەی بڕۆ).

٣٢٩٨ - (ضعيف الإسناد) عن عمر بن عبد الرحمن بن عوف, عن رجال من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم, بهذا الخبر, زاد: فقال النبي صلى الله عليه وسلم: (وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا بِالْحَقِّ لَوْ صَلَّيْتَ هَا هُنَا لأَجْزَأَ عَنْكَ صَلاَةً فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ).

واتە: لە عومەری کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفەوە، لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ئەم هەواڵە هاتوە، بەڵام ڕاوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: سوێند بە (الله) کە موحەممەدی بە هەق ڕەوانەکردوە ئەگەر لێرە ئەو نوێژەت بکردایە دەکەوتە بریتی ئەو نوێژەی (بیت المقدس) واتە: بەقەد ئەو خێری دەبوو.

## باسی دەربارەی گێڕانەوەی نەزری مردوو.

## ٢٠ - باب فِي قَضَاءِ النَّذْرِ عَنِ الْمَيِّتِ.

٣٢٩٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عباس: أن سعد بن عبادة استفتى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ لَمْ تَقْضِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اقْضِهِ عَنْهَا).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە سەعدی کوڕی عوبادە لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم پرسی وتی: دایکم مردوە نەزری لەسەرە جێبەجێی نەکردوە، فەرمووی: (دەی تۆ لەجیاتی ئەو نەزرەکەی بۆ جێبەجێ بکە).

٣٣٠٠ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ امْرَأَةً رَكِبَتِ الْبَحْرَ فَنَذَرَتْ: إِنْ نَجَّاهَا اللَّهُ أَنْ تَصُومَ شَهْرًا, فَنَجَّاهَا اللَّهُ, فَلَمْ تَصُمْ حَتَّى مَاتَتْ, فَجَاءَتِ ابْنَتُهَا - أَوْ أُخْتُهَا - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا أَنْ تَصُومَ عَنْهَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ سواری پاپۆڕ دەبێ نەزر دەکات ئەگەر خوای گەورە ڕزگاری بکات یەك مانگی بەڕۆژوو بێت، خوای گەورە ڕزگاری کرد بەڵام ڕۆژووەکەی نەگرت هەتا مرد، کوڕەکەی - یان خوشکەکەی - هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەو مەبەستە فەرمانی پێ کرد ڕۆژووەکەی بۆ بگرێتەوە.

٣٣٠١ - (صحيح) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه بريدة: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: كُنْتُ تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِوَلِيدَةٍ, وَإِنَّهَا مَاتَتْ وَتَرَكَتْ تِلْكَ الْوَلِيدَةَ, قَالَ: (قَدْ وَجَبَ أَجْرُكِ وَرَجَعَتْ إِلَيْكِ فِي الْمِيرَاثِ). قَالَتْ : وَإِنَّهَا مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ. فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ عَمْرٍو.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بووڕەیدەوە، لە باوکیەوە بووڕەیدە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: کارەکەرێکی منداڵم لە زەکاتدا بەخشی بە دایکم، ئێستا دایکم مردووە کارەکەرەکەی لەپاش بەجێماوە، فەرمووی: (تۆ پاداشتی خۆتت بۆ حەڵاڵ بووە، بە میراتیش دەیگێڕینەوە بۆت). وتی: دایکم مردووە مانگێ ڕۆژوو قەرزارە. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی عەمر واتە فەرموودەی پێشو.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە هەرکەسێ مردو ڕۆژوو قەرزار بوو با سەرپەرشتیارەکەی یان خزمێکی نزیکی بۆ بگرێتەوە.

### ٢١ - باب مَا جَاءَ فِيمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ.

٣٣٠٢ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ عَلَى أُمِّهَا صَوْمُ شَهْرٍ, أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ فَقَالَ: (لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ, أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟). قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ : (فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: دایکم مردوە ڕۆژووی مانگێکی ڕەمەزان قەرزارە ئایا لەبری ئەو ڕۆژووەکە بگرمەوە؟ فەرمووی: (ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بووایە بۆت نەدایەوە؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (دەی قەرزی خوای گەورە لەپێشتر و شایەنترە بدرێتەوە).

٣٣٠٣ - (صحيح) عن عائشة, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ مردو رۆژوو قەرزار بوو با سەرپەرشتیارەکەی یان خزمێکی نزیکی رۆژووەکەی بۆ بگرێتەوە).

## باسی ئەوەی فەرمانی پێ کراوە بە جێبەجێ کردنی نەزر.

## ٢٢ - باب مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْوَفَاءِ بِالنَّذْرِ.

٣٣٠٤ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ, قَالَ : (أَوْفِي بِنَذْرِكِ). قَالَتْ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَذْبَحَ بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا - مَكَانٌ كَانَ يَذْبَحُ فِيهِ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ - قَالَ: (لِصَنَمٍ؟), قَالَتْ: لاَ, قَالَ: (لِوَثَنٍ؟), قَالَتْ: لاَ. قَالَ: (أَوْفِي بِنَذْرِكِ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەزرم کردوە لە خزمەتتدا دەف لێ بدەم، فەرمووی: (نەزرەکەت جێبەجێ بکە)، وتی: نەزرم کردوە لە فلانە شوێندا ئاژەڵێ سەرببڕم — شوێنێ بوو خەڵکانی سەردەمی نەفامی ئاژەڵیان تێدا سەردەبڕی -، فەرمووی: (بۆ بت)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (بۆ بت)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی نەزرەکەت جێبەجێ بکە).

٣٣٠٥ - (صحيح) عن ثابت بن الضحاك قال: نَذَرَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَنْحَرَ إِبِلاً بِبوانَةَ, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ إِبِلاً بِبوانَةَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ

كَانَ فِيهَا وَثَنٌ مِنْ أَوْثَانِ الْجَاهِلِيَّةِ يُعْبَدُ؟). قَالُوا: لاَ. قَالَ: (هَلْ كَانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِهِمْ؟). قَالُوا: لاَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَوْفِ بِنَذْرِكَ, فَإِنَّهُ لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ, وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ).

واتە: لە (ثابت)ی كوڕی (ضحاك)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم پیاوێ نەزری كردبوو لە بووانە وشترێ سەرببڕێت، هات بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: من نەزرم كردوە لە بووانە وشترێ سەرببڕم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا بتێ لە بتەكانی سەردەمی نەفامی تێدا نیە بپەرسترێت؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (ئایا جەژن و ئاهەنگێ لە جەژن و ئاهەنگەكانیان لێ نەدەگێڕا؟). وتیان: نەخێر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی نەزرەكەت جێبەجێ بكە، بێگومان نەزر لەسەر سەرپێچی خوای گەورە دانەمەزرێ، شتێكیش كەماڵی ئادەمیزاد خۆی نەبێت نەزری لەسەر دانەمەزرێت).

٣٣٠٦ - (صحيح) عن ميمونة بنت كردم قالت: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي فِي حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَسَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَعَلْتُ أُبِدُّهُ بَصَرِي, فَدَنَا إِلَيْهِ أَبِي وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ مَعَهُ دِرَّةٌ كَدِرَّةِ الْكُتَّابِ, فَسَمِعْتُ الأَعْرَابَ وَالنَّاسَ يَقُولُونَ: الطَّبْطَبِيَّةَ. الطَّبْطَبِيَّةَ. فَدَنَا إِلَيْهِ أَبِي, فَأَخَذَ بِقَدَمِهِ - قَالَتْ: فَأَقَرَّ لَهُ, وَوَقَفَ (عليه) فَاسْتَمَعَ مِنْهُ - فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي نَذَرْتُ إِنْ وُلِدَ لِي وَلَدٌ ذَكَرٌ أَنْ أَنْحَرَ عَلَى رَأْسِ بوانَةَ فِي عَقَبَةٍ مِنَ الثَّنَايَا عِدَّةً مِنَ الْغَنَمِ - قَالَ: لاَ أَعْلَمُ إِلاَّ أَنَّهَا قَالَتْ خَمْسِينَ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ بِهَا مِنَ (هذه) الأَوْثَانِ شَيْءٌ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَأَوْفِ بِمَا نَذَرْتَ بِهِ لِلَّهِ), قَالَتْ: فَجَمَعَهَا فَجَعَلَ يَذْبَحُهَا فَانْفَلَتَتْ مِنْهَا شَاةٌ, فَطَلَبَهَا وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَوْفِ عَنِّي نَذْرِي. فَظَفِرَهَا فَذَبَحَهَا.

واتە: لە مەیمونەی کچی کەردەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوو بۆ حەجی ماڵاوایی، منیش لەگەڵ باوکم لەخزمەتیدا دەرچوین بۆ حەج، پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی، گوێم لێ بوو خەڵکەکە دەیانوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەیان بۆ کرد، چاوم بۆ گێرا، باوکم لێی نزیك بوویەوە بەسەر وشترێکەوە بوو داردەستێکی پێ بوو وەك ئەوەی کە مامۆستای منداڵان پێیەتی، ئەویش راوەستاو گوێی بۆ گرت، گوێم لە خەڵك و عەرەبە دەشتەکیەکان بوو دەیانوت: (الطَّبْطَبِيَّةَ، الطَّبْطَبِيَّةَ). وایان لێکداوەتەوە کە مەبەست لە دەنگی رۆشتن و جوڵانە، مەیمونە وتی: باوکم لێی نزیك بوویەوە، باوەڕی پێ هێنا بوو، قاچی گرت، ئەویش راوەستاو گوێی بۆ گرت، مەیمونە وتی: باوکم وتی: من نەزرم کردوە ئەگەر کوڕێکم بوو لە بووانە لە قەدپاڵی شاخێکدا چەند سەر مەڕێك سەربیرم، وتی: نازانم ئەوەندە نەبێ کە وتی: پەنجا سەر مەڕ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا هیچ بتێ لەم بتانەی تێدایە؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی نەزرەکەت جێبەجێ بکە، بۆ خوای گەورە)، وتی: کۆیکردنەوە بۆ ئەوەی سەریان ببڕێت مەڕێك لە مەڕەکان هەڵهات لەدەستی و تار بوو ئەویش شوێنی کەوت دەیوت: خودایە یامەتیم بدە با نەزرەکەم جێبەجێ بکەم، فرسەتی لێ هێنا گرتی و ئەویشی سەربڕی.

٣٣٠٧ - (صحيح) عن ميمونة بنت كردم بن سفيان, عن أبيها, نَحْوَهُ, مُخْتَصَرٌ مِنْهُ شَيْءٌ, قَالَ: (هَلْ بِهَا وَثَنٌ أَوْ عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِ الْجَاهِلِيَّةِ). قَالَ: لاَ. قُلْتُ: إِنَّ أُمِّي هَذِهِ عَلَيْهَا نَذْرٌ, وَمَشْيٌ, أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ وَرُبَّمَا قَالَ ابْنُ بَشَّارٍ: أَنَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ : (نَعَمْ).

واتە: لە مەیمونەی کچی کەردەمی کوڕی سوفیانەوە، لە باوکیەوە، فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، فەرمووی: (ئایا بتی تێدا نیە یان جەژن و ئاهەنگێ لە جەژن و ئاهەنگەکانیان لێ نەدەگێرا؟). وتی: نەخێر، وتم: دایکم نەزر و رۆشتنی بۆ پەرستش لەسەرە، ئایا بۆی جێبەجێ بکەم، فەرمووی: (بەڵێ).

## باسی سەبارەت بە نەزرێ کە هی ئادەمیزاد خۆی نەبێت.

## ٢٣ - باب فِي النَّذْرِ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ.

٣٣٠٨ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: كَانَتِ الْعَضْبَاءُ لِرَجُلٍ مِنْ بَنِى عَقِيلٍ وَكَانَتْ مِنْ سَوَابِقِ الْحَاجِّ, قَالَ: فَأُسِرَ, فَأَتَى النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي وَثَاقٍ, وَالنَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حِمَارٍ, عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ, فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ عَلاَمَ تَأْخُذُنِي وَتَأْخُذُ سَابِقَةَ الْحَاجِّ؟ قَالَ: (نَأْخُذُكَ بِجَرِيرَةِ حُلَفَائِكَ (من) ثَقِيفٍ). قَالَ: وَكَانَ ثَقِيفٌ قَدْ أَسَرُوا رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَقَدْ قَالَ فِيمَا قَالَ: وَأَنَا مُسْلِمٌ أَوْ قَالَ: وَقَدْ أَسْلَمْتُ. فَلَمَّا مَضَى النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ أَبو دَاوُدَ: فَهِمْتُ هَذَا مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ عِيسَى - نَادَاهُ يَا مُحَمَّدُ يَا مُحَمَّدُ. قَالَ: وَكَانَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَحِيمًا رَفِيقًا فَرَجَعَ إِلَيْهِ قَالَ: (مَا شَأْنُكَ). قَالَ: إِنِّى مُسْلِمٌ. قَالَ: (لَوْ قُلْتَهَا وَأَنْتَ تَمْلِكُ أَمْرَكَ أَفْلَحْتَ كُلَّ الْفَلاَحِ). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى حَدِيثِ سُلَيْمَانَ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّى جَائِعٌ فَأَطْعِمْنِى إِنِّى ظَمْآنٌ فَاسْقِنِى. قَالَ فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذِهِ حَاجَتُكَ). أَوْ قَالَ: (هَذِهِ حَاجَتُهُ). قَالَ: فَفُودِىَ الرَّجُلُ بَعْدُ بِالرَّجُلَيْنِ. قَالَ: وَحَبَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعَضْبَاءَ لِرَحْلِهِ - قَالَ - فَأَغَارَ الْمُشْرِكُونَ عَلَى سَرْحِ الْمَدِينَةِ فَذَهَبُوا بِالْعَضْبَاءِ - قَالَ - فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهَا وَأَسَرُوا امْرَأَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ - قَالَ - فَكَانُوا إِذَا كَانَ اللَّيْلُ يُرِيحُونَ إِبِلَهُمْ فِي أَفْنِيَتِهِمْ - قَالَ - فَنُوِّمُوا لَيْلَةً وَقَامَتِ الْمَرْأَةُ فَجَعَلَتْ لاَ تَضَعُ يَدَهَا عَلَى بَعِيرٍ إِلاَّ رَغَا حَتَّى أَتَتْ عَلَى الْعَضْبَاءِ - قَالَ - فَأَتَتْ عَلَى نَاقَةٍ ذَلُولٍ مُجَرَّسَةٍ - قَالَ - فَرَكِبَتْهَا ثُمَّ جَعَلَتْ لِلَّهِ عَلَيْهَا إِنْ نَجَّاهَا اللَّهُ لَتَنْحَرَنَّهَا - قَالَ - فَلَمَّا قَدِمَتِ الْمَدِينَةَ عُرِفَتِ النَّاقَةُ نَاقَةُ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُخْبِرَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَجِىءَ بِهَا وَأُخْبِرَ بِنَذْرِهَا فَقَالَ: (بِئْسَمَا جَزَيْتِيهَا).

أَوْ: (جَزَتْهَا). (إِنِ اللَّهُ أَنْجَاهَا عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّهَا, لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ, وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: وَالْمَرْأَةُ هَذِهِ امْرَأَةُ أَبِي ذَرٍّ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عضباء) وشتری پیاوێکی هۆزی بەنی عەقیل بوو، وشترێکی تیژڕەو بوو پێشەنگی کاروانی حاجیان بوو - لەوایدا بوو بە هی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم -، راوی وتی: موسوڵمانەکان ئەو پیاوەیان بەدیل گرت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سواری گوێدرێژێ چو بۆلای پیاوە دیلەکە بە کۆت و زنجیرەوە بوو وتی: ئەی موحەممەد، بۆچی من و ئەو وشترەتان گرتوە کە پێشەنگی کاروانی حاجیان بوو؟ فەرمووی: (تۆ بە تاوانی هۆزی (ثقیف)ی هاوپەیمانتان گیراوی) - بێگومان هۆزی (ثقیف) هاوپەیمانی هۆزی بەنی عەقیل بوون هەروەها هاوپەیمانیش بوون لەگەڵ موسوڵماناندا - بەڵام هۆزی (ثقیف) پەیمانەکەیان شکاندو دوو لە هاوەڵانی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم بە دیل گرتبوو، بۆیە موسوڵمانانیش ئەو پیاوەی هۆزی بەنی عەقیلیان بەدیل گرت، پیاوەکەی هۆزی بەنی عەقیل کە دیل کرابوو وتی: من موسوڵمانم، یان وتی: من موسوڵمان بووم، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەمێ رۆیشت بانگی کردەوە وتی: ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد! راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر بەسۆز و میهرەبان و لەسەرخۆ بوو، گەڕایەوە بۆلای، فەرمووی: (چیت دەوێت؟) وتی: من موسوڵمانم، فەرمووی: (ئەگەر پێش ئەوەی دیل بکرێیت بتوتایە بە تەواوی رزگارت دەبوو)، وتی: ئەی موحەممەد برسیمە خواردنم بدەرێ، تینومە ئاوم بدەرێ، راوی وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە پێویستی تۆیەو مافی خۆتە)، یان فەرمووی: (ئەوە پیویستیێتی)، راوی وتی: پیاوەکەیان گۆڕییەوە بەو دوو پیاوەی کە هۆزی بەنی (ثقیف) دیلیان کردبوون، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (عضباء)ی گل دایەوە بۆ خۆی، رۆژێ هاوبەش بۆ خوا دانەران هێرشیان کردە سەر شاری مەدینە (عضباء)یان بە تاڵانی برد بۆ خۆیان، کاتێ کە رۆشتن ئافرەتێکی موسوڵمانیان بە دیلی لەگەڵ خۆیان برد، ئەوانە عادەتیان وەها بوو لەبەردەم ماڵەکانیاندا مەڕو ماڵاتیان دەکردە پەچەوەو وشترەکانیان یخ دەدا، شەوێ ژنەکە خۆی لە کۆتەکەی رزگار کردو چو

بۆناو وشترەکان هەتا سواری وشترێ ببێ و خۆی رزگار بکات، دەستی بۆ هەر وشترێ دەبرد دەیبۆڕاند ئەویش وازی لێ دەهێنا هەتا گەیشتە لای (عضباء)، وشترێکی هێور و نەرمونیان بوو، - ئیبنو عیسا وتی: ئەو نەیبۆڕاند -، راوی وتی: ئافرەتەکە سواری (عضباء) دەبێ و، نەزر دەکات بۆ خوای گەورە ئەگەر خوا رزگاری بکات (عضباء) سەرببڕێت، راوی وتی: کاتێ کە گەیشتەوە مەدینە زانیان وشترەکەی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم، هەواڵیان دا بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ناردی بۆی، بۆیان هێنا، باسی نەزرەکەیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (پاداشتێکی خراپی دەداتەوە خوای گەورە لەسەر پشتی (عضباء) رزگاری کردوە کەچی ئەو سەری دەبڕێت! نەزر لەسەر سەرپێچی خوای گەورە دانامەزرێ، شتێکیش کەماڵی ئادەمیزاد خۆی نەبێت نەزری لەسەر دانامەزرێت).

## باسی دەربارەی ئەوکەسەی نەزر دەکا ماڵەکەی بکا بەخێر.

## ٢٤ - باب فِيمَنْ نَذَرَ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِمَالِهِ.

٣٣٠٩ - (صحيح) عن كعب بن مالك قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ, فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ). قَالَ: فَقُلْتُ: إِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِيَ الَّذِي بِخَيْبَرَ.

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەشێ لە تەوبەکەم ئەوەبێ هەرچی ماڵم هەیە لێی دەربچم و بیکەم بە خێر بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر هەندێ لەماڵەکەت بهێڵیتەوە بۆ خۆت ئەوە چاکترە بۆت). وتی: وتم: ئەو پشکەم کە لەخەیبەرە دەیهێڵمەوە بۆخۆم.

٣٣١٠ - (صحيح) عن عبد الله بن كعب بن مالك, عن أبيه, أنه قال لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تِيبَ عَلَيْهِ: إِنِّي أَنْخَلِعُ مِنْ مَالِي. فَذَكَرَ نَحْوَهُ إِلَى (خَيْرٌ لَكَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە. کاتێ کە تەوبەکەی کەعب قبووڵ بوو، بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم وت: هەرچی ماڵم هەیە لێی دەردەچم و دەیکەم بە خێر، جا راوی بەهەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە هەتا گەیشتە: (خَيْرٌ لَكَ).

٣٣١١ - (صحيح الإسناد) عن كعب بن مالك أنه قال للنبي صلى الله عليه وسلم قال: أَوْ أَبو لُبَابَةَ, أَوْ مَنْ شَاءَ اللَّهُ: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي الَّتِي أَصَبْتُ فِيهَا الذَّنْبَ وَأَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ صَدَقَةً. قَالَ:(يُجْزِئُ عَنْكَ الثُّلُثُ).

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە، یان لە ئەبو لوبابەوە، یان لە کەسێکی ترەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەشێك لە تەوبەکەم ئەوەیە لەناو ماڵ و لەناو خزمانی خۆم کۆچ بکەم بە هۆی ئەو تاوانەوە کە توشی بووم لەوێ، وە هەرچی ماڵم هەیە لێی دەربچم و بیکەم بە خێر، فەرمووی: (سێ یەکی ببەخشە ئەوەندە بەسە).

٣٣١٢ - (ضعيف الإسناد) عن الزهري قال, أخبرني كعب بن مالك قال: كَانَ أَبو لُبَابَةَ, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ, وَالْقِصَّةُ لأَبِي لُبَابَةَ.

واتە: لە زوهریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کەعبی کوڕی مالیك بۆی گێڕامەوە وتی: ئەبو لوبابە، بەسەرهاتەکە هی ئەبو لوبابەیە.

٣٣١٣ - (حسن صحيح) عن كعب بن مالك قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي إِلَى اللَّهِ أَنْ أَخْرُجَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ صَدَقَةً, قَالَ: (لاَ). قُلْتُ: فَنِصْفَهُ. قَالَ:(لاَ). قُلْتُ: فَثُلُثَهُ. قَالَ:(نَعَمْ). قُلْتُ: فَإِنِّي سَأُمْسِكُ سَهْمِي مِنْ خَيْبَرَ.

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەشێ لە تەوبەکەم ئەوەبێ هەرچی ماڵم هەیە لێی دەربچم و بیکەم بە خێر بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نا)، وتم: دەی نیوەی ماڵەکەم دەکەم بەخێر، فەرمووی: (نا)، وتم: دەی سێ یەکی ماڵەکەم دەکەم بەخێر، فەرمووی: (بەڵێ باشە). وتم: ئەو پشکەم کە لەخەیبەرە دەیهێڵمەوە بۆخۆم.

## باسی کەسێ لەسەردەمی نەفامیدا نەزر بکات لەپاشدا بگات بە ئیسلام و موسوڵمان ببێت.

## ٢٥ - باب مَنْ نَذَرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ ثُمَّ أَدْرَكَ الإِسْلاَمَ.

٣٣١٤ - (صحيح) عن عمر رضي الله عنهما أنه قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ لَيْلَةً. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَوْفِ بِنَذْرِكَ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من لەسەردەمی نەفامی دا نەزرم کردوە شەوێ لەمزگەوتی حەرامدا بمێنمەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (نەزرەکەت جێبەجێ بکە).

## باسی کەسێ نەزرێ بکات و دیاری نەکات.

## ٢٦ - باب مَنْ نَذَرَ نَذْرًا لَمْ يُسَمِّهِ.

٣٣١٥ - (صحيح) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەفارەتی نەزر وەك کەفارەتی سوێند وایە).

٣٣١٦ - (صحيح) عن عقبة بن عامر, عن النبي صلى الله عليه وسلم, مِثْلَهُ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

## باسی سوێندی بەدەمداهاتن(لەغو) [1]

## ٢٧- باب لَغْوِ الْيَمِينِ.

٣٢١٦ – م (صحيح) عن عطاء: فِي اللَّغْوِ فِي الْيَمِينِ, قال: قال عائيشة قالت: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (هُوَ كَلَامُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ: كَلاَّ وَاللَّهِ, وَبَلَى وَاللَّهِ).

واتە: لە (عطاء)ەوە دەربارەی سوێندخواردنی بەدەمداهاتن هاتوە، کە وتویەتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بریتیە لە قسەی پیاوێ کە بە دەمیدا دێت لەماڵەوە کە دەڵێت نە (وَاللَّهِ)بە خوا، وا نیە، بەڵێ (وَاللَّهِ)بە خوا وایە، ئەرێ بە خوا).

(١) لە (سنن أبي داود)دا بە ژمارە: (٣٢٥٤) هاتوە.

## باسی دەربارەی ئەوکەسەی سوێند دەخوات لەسەر نانخواردن کە نەیخوات.

## ٢٨- باب فِيمَنْ حَلَفَ عَلَى الطَّعَامِ لاَ يَأْكُلُهُ.

٣٣١٧ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي بكر قال: نَزَلَ بِنَا أَضْيَافٌ لَنَا قَالَ: وَكَانَ أَبو بَكْرٍ يَتَحَدَّثُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ, فَقَالَ: لاَ أَرْجِعَنَّ إِلَيْكَ حَتَّى تَفْرَغَ مِنْ ضِيَافَةِ هَؤُلاَءِ وَمِنْ قِرَاهُمْ, فَأَتَاهُمْ بِقِرَاهُمْ, فَقَالُوا: لاَ نَطْعَمُهُ حَتَّى يَأْتِيَ أَبو بَكْرٍ, فَجَاءَ, فَقَالَ: مَا فَعَلَ أَضْيَافُكُمْ, أَفَرَغْتُمْ مِنْ قِرَاهُمْ, قَالُوا: لاَ. قُلْتُ:قَدْ أَتَيْتُهُمْ بِقِرَاهُمْ فَأَبوا وَقَالُوا:وَاللَّهِ لاَ نَطْعَمُهُ حَتَّى يَجِيءَ فَقَالُوا:صَدَقَ قَدْ أَتَانَا بِهِ فَأَبَيْنَا حَتَّى تَجِيءَ قَالَ: فَمَا مَنَعَكُمْ قَالُوا:مَكَانُكَ. قَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُهُ اللَّيْلَةَ قَالَ فَقَالُوا:وَنَحْنُ وَاللَّهِ لاَ نَطْعَمُهُ حَتَّى تَطْعَمَهُ. قَالَ: مَا رَأَيْتُ فِي الشَّرِّ كَاللَّيْلَةِ قَطُّ - قَالَ - قَرِّبوا طَعَامَكُمْ. قَالَ: فَقُرِّبَ طَعَامُهُمْ فَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ, فَطَعِمَ وَطَعِمُوا. فَأُخْبِرْتُ أَنَّهُ أَصْبَحَ فَغَدَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِى صَنَعَ وَصَنَعُوا, قَالَ: (بَلْ أَنْتَ أَبَرُّهُمْ, وَأَصْدَقُهُمْ).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی پێشەوا ئەبوو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: میوانمان هات، وتی: ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ شەو لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم مابووەوە بۆئەوەی قسەی لەگەڵ بکات، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: نایەمەوە بۆ ماڵەوە هەتا میوانداریەکە تەواو دەبێت لەبەرئەوە چاوەڕێی من مەکە، (عبد الرحمن)ی کوڕی میوانداری کردن، کاتی نان خواردن میوانەکان وتیان: خواردنەکە ناخۆیین هەتا پێشەوا ئەبوو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ نەیەتەوە، ئەویش هاتەوە، وتی: میوانەکانت چیان کرد، لەنان خواردن بوونەوە، وتیان: نەخێر، وتم: خوانم بۆ ئامادەکردن و میوانداریم کردن بەڵام ئەوان نەهاتنە پێشەوەو نانەکەیان نەخوارد، وتیان: سوێند بە (الله) خواردنەکە ناخۆین هەتا پێشەوا ئەبوو بەکر ڕەزای خوای

لێ بێ نەیەتەوە، وتیان: ڕاست دەکات نانی بۆ هێناین بەڵام ئێمە نەمانخوارد هەتا تۆ نەیەیتەوە، ئەبو بەکر وتی: چی وای لێ کردن نانەکە نەخۆن؟ وتیان: لەبەر ڕێزی پلەو پایەی تۆ، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: سوێند بە (الله) ئەو نانە ناخۆم ئەم شەو، (عبد الرحمن) وتی: میوانەکانیش وتیان: سوێند بە (الله) ئێمەش ئەو نانە ناخۆین هەتا پێشەوا ئەبو بەکر نەیخوات، هەرگیز خراپەی وەك ئەم شەوم نەدیوە، پێشەوا ئەبوو بەکر وتی: خواردنەکەتانم لێ نزیك بکەنەوە، خواردنەکەیان لێ نزیك کردەوە، وتی: (بسم الله) بەناوی خواوە جا دەستی کرد بە خواردن، ئەوانیش لە خواردنەکەیان خوارد. بۆ بەیانی چوە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی خۆی و میوانەکانی بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: (بەڵکو تۆ چاکتر و ڕاستگۆترینیانی چونکە سوێندەکەی خۆتت خست).

٣٣١٨ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي بكر قال: بِهَذَا الْحَدِيثِ نَحْوَهُ, زَادَ عَنْ سَالِمٍ فِي حَدِيثِهِ قَالَ: وَلَمْ يَبْلُغْنِي كَفَّارَةٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی پێشەوا ئەبوو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموودەی ئێشو هاتوە بە هەمان شێوە، لە سالمەوە لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: کەفارەتم پێ نەگەیشتوە.

## باسی سوێندخواردن لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

## ٢٩ - باب الْيَمِينِ فِي قَطِيعَةِ الرَّحِمِ.

٣٣١٩ - (ضعيف الإسناد) عن سعيد بن المسيب: أَنَّ أَخَوَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ بَيْنَهُمَا مِيرَاثٌ, فَسَأَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ الْقِسْمَةَ, فَقَالَ: إِنْ عُدْتَ تَسْأَلُنِي عَنِ الْقِسْمَةِ فَكُلُّ مَالٍ لِي فِي رِتَاجِ الْكَعْبَةِ, فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنَّ الْكَعْبَةَ غَنِيَّةٌ عَنْ مَالِكَ,

كَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَكَلِّمْ أَخَاكَ, سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَمِينَ عَلَيْكَ, وَلاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةِ الرَّبِّ, وَفِي قَطِيعَةِ الرَّحِمِ, وَفِيمَا لاَ تَمْلِكُ).

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێرنەوە، کە دوو برا لە ئەنصارەکان میراتێکیان لە نێواندا هەبوو، یەکێکیان بەوی تریانی وت: با بەشی بکەین، ئەویش وتی: جارێکی تر داوای ماڵ بەشکردنم لێ بکەی هەرچی ماڵم هەیە نەزری کەعبە بێ، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ پێی وت: کەعبە دەوڵەمەندەو پێویستی بە ماڵی تۆ نیە، کەفارەتی سوێندەکەت بدەو قسە لەگەڵ براکەتدا، بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (سوێندت ناکەوێ، نەزر لەسەر گوناهو سەرپێچی خوای پەروەردگار و، نەزر لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و، نەزری شتێ کە هی تۆ نەبێ دانامەزرێن).

٣٣٢٠ - (حسن) عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نَذْرَ إِلاَّ فِيمَا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ, وَلاَ يَمِينَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە، دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەزرکردن دانامەزرێت مەگەر لەپێناوی خوای گەورەدا، سوێندخواردن نیە لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی).

٣٣٢١ - (حسن الا قوله: (ومن حلف... )؛ فهو منكر) عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نَذْرَ وَلاَ يَمِينَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ, وَلاَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ, وَلاَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ, وَمَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَدَعْهَا, وَلْيَأْتِ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ, فَإِنَّ تَرْكَهَا كَفَّارَتُهَا). قَالَ أَبو دَاوُدَ: الأَحَادِيثُ كُلُّهَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ). إِلاَّ فِيمَا لاَ يُعْبَأُ بِهِ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لەباوكیەوە، لە باپیریەوە، دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سوێندخواردن و نەزركردن دانامەزرێن لەسەر شتێك كە موڵكی ئادەمیزاد خۆی نەبێ، هەروەها لە گوناهو سەرپێچی خوای گەورەو لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتیشدا، هەركەسێ لەسەر شتێ سوێندی خوارد بە بارێكی تردا بە باشتری زانی واز لەسوێندەكەی بهێنێ و كارە چاكەكە بكات، وازی لێ هێنانەكەی كەفارەتەكەیەتی). ئەبوو داود دەڵێت: سەرجەم ئەو فەرموودە صەحیحانەی كە لەپێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ریوایەت كراون: (كەفارەتی سوێندەكەی بدات) دەسەلمێنن، مەگەر ئەوانەی كە ئیعتیباریان پێ ناكرێت.

## باسی (استثناء) لەسوێندخواردندا لەدوای بێ دەنگ بوون.

## ٣٠- باب الِاسْتِثْنَاءِ فِي الْيَمِينِ بَعْدَ السُّكُوتِ.

٣٣٢٢ - (صحيح) عن عكرمة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا, وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا, وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا). ثُمَّ قَالَ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ). قال أبو داود: عن شريك, ثُمَّ لَمْ يَغْزُهُمْ.

واتە: لە عیكریمەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەكەم، (سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەكەم، (سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەكەم). لەپاشدا فەرمووی: (إن شاء الله). ئەبو داود دەڵێت: لە شورەیكەوە هاتوە: لەپاشدا غەزای نەكردن.

٣٣٢٣ - (ضعيف) عن عكرمة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا). ثُمَّ قَالَ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ). ثُمَّ قَالَ: (وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا, إِنْ شَاءَ

اللَّهُ). ثُمَّ قَالَ: (وَاللَّهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا). ثُمَّ سَكَتَ, ثُمَّ قَالَ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ). قال أبو داود: عن شريك, ثُمَّ لَمْ يَغْزُهُمْ.

واته: لە عیکریمەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەکەم)، لەپاشدا فەرمووی: (إن شاء الله). ئینجا فەرمووی: (سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەکەم، (إن شاء الله). لەپاشدا فەرمووی: (سوێند بە (الله) غەزای قورەیش دەکەم، ئینجا بێدەنگ بوو، لەپاشدا فەرمووی: (إن شاء الله). ئەبو داود دەڵێت: لە شورەیکەوە هاتوە: لەپاشدا غەزای نەکردن.

## باسی کەسێ نەزرێ بکات نەتوانێ جێبەجێی بکات.

## ٣١ - باب مَنْ نَذَرَ نَذْرًا لاَ يُطِيقُهُ.

٣٣٢٤ - (ضعيف مرفوعا) عن ابن عباس: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ نَذَرَ نَذْرًا لَمْ يُسَمِّهِ, فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ, وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا فِي مَعْصِيَةٍ, فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ, وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا لاَ يُطِيقُهُ, فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ, وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا أَطَاقَهُ فَلْيَفِ بِهِ).

واته: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ نەزرێك بکات ناوی نەبات و دیاری نەکات کەفارەتەکەی وەك کەفارەتی سوێند وایە، هەرکەسێ نەزرێك بکات لەسەر گوناهو سەرپێچی کەفارەتەکەی وەك کەفارەتی سوێند وایە، هەرکەسێ نەزرێك بکات نەتوانێ جێبەجێی بکات کەفارەتەکەی وەك کەفارەتی سوێند وایە، هەرکەسێ نەزرێك بکات توانی جێبەجێی بکات ئەوە با جێبەجێی بکات).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی کڕین و فرۆشتن.

## ١٧- أول كتاب البيوع.

### باسی سەبارەت بە بازرگانیە کە سوێندو قسەی بێ هودە(لەغو)ی تێکەڵاو ببێت.

### ١ - باب فِي التِّجَارَةِ يُخَالِطُهَا الْحَلِفُ وَاللَّغْوُ.

٣٣٢٦ - (صحيح) عن قيس بن أبو غرزة قال: كُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ, فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ, فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ, إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ اللَّغْوُ وَالْحَلِفُ, فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ).

واتە: لە قەیسی کوڕی ئیبنو ئەبو غەرەزەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بە ئێمەیان دەوت: دەڵاڵ، جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دای بەلاماندا ناوێکی جوانتر و چاکتری لێ ناین - وشە دەڵاڵ گۆڕی بۆ بازرگان کە وشەیەکی جوانترە - فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی بازرگانان، کڕین و فرۆشتن قسەی بێ هودەو سوێندی تێ دەکەوێت، تێکەڵی خێر و سەدەقەی بکەن واتە خێری لێ بکەن با ببێتە کەفارەتی ئەو سوێند و قسە بێ هودانەی کردوتانە).

٣٣٢٧ - (صحيح) عن أبو وائل عن قيس بن أبو غرزة, بمعناه, قال: (يَحْضُرُهُ

الْكَذِبُ وَالْحَلِفُ). وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ الزُّهْرِيُّ: (اللَّغْوُ وَالْكَذِبُ).

واتە: لە قەیسی کوڕی ئیبنو ئەبو غەرەزەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، فەرمووی: (کڕین و فرۆشتن درۆ و سوێندی تێ دەکەوێت)، (عَبْدُ اللَّه)ی زوهری وتی: فەرمووی: (کڕین و فرۆشتن قسەی بێ هودەو درۆی تێ دەکەوێت).

## باسی سەبارەت بە دەرهێنانی ئاڵتون و زیو لە کانەکان.

## ٢ - باب فِي اسْتِخْرَاجِ الْمَعَادِنِ.

٣٣٢٨ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً لَزِمَ غَرِيمًا لَهُ بِعَشْرَةِ دَنَانِيرَ, فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى تَقْضِيَنِى, أَوْ تَأْتِيَنِى بِحَمِيلٍ, فَتَحَمَّلَ بِهَا النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَاهُ بِقَدْرِ مَا وَعَدَهُ, فَقَالَ لَهُ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مِنْ أَيْنَ أَصَبْتَ هَذَا الذَّهَبَ؟). قَالَ: مِنْ مَعْدِنٍ, قَالَ: (لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهَا, وَلَيْسَ فِيهَا خَيْرٌ). فَقَضَاهَا عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ دە دیناری کابرایە قەرزار بوو خاوەن قەرزەکە یەخەی گرت و پێی وت: سوێند بە (الله) لێت جیا نابمەوە هەتا قەرزەکەم نەدەیتەوە یان کەفیلێکم دەدەیتێ، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو بە کەفیلی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لە وادەی قەرزدانەوەکەدا پیاوە قەرزارەکە هاتەوە قەرزەکەی هێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەمەت لەکوێ دەستکەوتوە؟)، وتی: لە کان، فەرمووی: (کارمان پێی نیەو، خێری پێوە نیە)، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی قەرزەکەی بۆ بژارد لەجیاتی ئەو. - ئاڵتونەکەی بە گڵەوە هێنایەوە بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قبوولی نەکرد - .

## باسی سەبارەت بە دورکەوتنەوە لە گومان گەل.

## ٣ - باب فِي اجْتِنَابِ الشُّبُهَاتِ.

٣٣٢٩ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ). وَأَحْيَانًا يَقُولُ (مُشْتَبِهَةٌ). (وَسَأَضْرِبُ لَكُمْ فِي ذَلِكَ مَثَلاً إِنَّ اللَّهَ حَمَى حِمًى وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَا حَرَّمَ, وَإِنَّهُ مَنْ يَرْعَ حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكْ أَنْ يُخَالِطَهُ, وَإِنَّهُ مَنْ يُخَالِطِ الرِّيبَةَ, يُوشِكْ أَنْ يَجْسُرَ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی ئەو کاروکردەوانەی حەڵاڵ کراون لەلایەن خوای گەورەوە روون و ئاشکراو دیارن، هەروەها ئەو کاروکردەوانەش کە حەرام کراون لەلایەن خوای گەورەوە روون و ئاشکراو دیارن، لەنێوان ئەم دوانەدا هەندێ شت هەن جێگەی گومانن حەڵاڵی و حەرامییان روون و ئاشکرا نیە زۆرکەس نازانن حەڵاڵە یان حەرامە). هەندێ جار لە جیاتی (مُشْتَبِهَات) دەیفەرموو: (مُشْتَبِهَة)، (لەوبارەوە نمونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە: بەڕاستی خوای گەورە پاوەنی هەیەو دەیپارێزێ، پاوەنی خوای گەورەش ئەوشتانەیە کە حەرامی کردون، بێگومان هەرکەسێ لەدەوروبەری پاوەندا بلەوەڕێنێ نزیکە بەرە بەرە بکەوێتە ناویەوە واتە هەرکەس لێی بەدور بێت سەلامەتە - ئەگەر شوان رانەکەی لەدەوروبەری پاوەن بلەوەڕێنێ بەرە بەرە رانەکە دەکەوێتە ناو پاوەنەکەوەو لێی دەلەوەڕێ -، هەرکەس بکەوێتە ناو شتێکەوە جێگەی گومان بێت، ئەوە نزیکە بکەوێتە ناو حرامەوە).

٣٣٣٠ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: بِهَذَا الْحَدِيثِ قَالَ (وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ عِرْضَهُ وَدِينَهُ, وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ, وَقَعَ فِي الْحَرَامِ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە فەرمودەی پێشو هاتوە، فەرمووی: (لەنێوان ئەم دوانەدا هەندێ شت هەن حەلاڵی و حەرامییان روون و ئاشکرا نیە زۆرکەس نازانن حەلاڵە یان حەرامە جێگەی گومانن، جا هەرکەس خۆی لەو کارانە بپارێزێت کە جێگەی گومانن ئەوە شەرەف و ناموس و دینی لە نەنگی دەپارێزێت و سەلامەت دەبێت، ئەوەی بکەوێتە ناو گومان گەلەوە، دەکەوێتە ناو حەرامەوە).

٣٣٣١ - (ضعيف) عن أبو هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لاَ يَبْقَى أَحَدٌ إِلاَّ أَكَلَ الرِّبَا, فَإِنْ لَمْ يَأْكُلْهُ أَصَابَهُ مِنْ بُخَارِهِ). قَالَ ابْنُ عِيسَى: (أَصَابَهُ مِنْ غُبَارِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (زەمانێ دێ سودخواردن ئەوەندە بڵاودەبێتەوە هیچ کەسێ نامێنێتەوە سود نەخوات، ئەگەر کەسێ سودی نەخوارد توشی ئاسەوارەکەی دەبێت - بەوەی کە دەبێتە شایەت یان دەنوسێ لە نێوان دوکەسدا یا دەیکەنە دیاری بۆی بە جۆرێ لە جۆرەکان هەر توش دەبێت، واتە ئەگەر کەسێ لە حەقیقەتەکەی سەلامەت بێ لە ئاسەوارەکانی سەلامەت نابێ - ). ئیبنو عیسا دەڵێت: (تەپ و تۆزەکەی بەردەکەوێت). -.

٣٣٣٢ - (صحيح) عن عاصم بن كليب, عن أبيه, عن رجل من الأنصار قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَنَازَةٍ, فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْقَبْرِ يُوصِي الْحَافِرَ: (أَوْسِعْ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيْهِ, أَوْسِعْ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ). فَلَمَّا رَجَعَ اسْتَقْبَلَهُ دَاعِيَ امْرَأَةٍ, فَجَاءَ وَجِيءَ بِالطَّعَامِ فَوَضَعَ يَدَهُ, ثُمَّ وَضَعَ الْقَوْمُ فَأَكَلُوا, فَنَظَرَ آبَاؤُنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَلُوكُ لُقْمَةً فِي فَمِهِ, ثُمَّ قَالَ: (أَجِدُ لَحْمَ شَاةٍ أُخِذَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ أَهْلِهَا). فَأَرْسَلَتِ الْمَرْأَةُ, قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَرْسَلْتُ إِلَى الْبَقِيعِ يَشْتَرِي لِي شَاةً فَلَمْ أَجِدْ, فَأَرْسَلْتُ إِلَى جَارٍ لِي قَدِ اشْتَرَى شَاةً: أَنْ أَرْسِلْ إِلَيَّ بِهَا بِثَمَنِهَا فَلَمْ يُوجَدْ, فَأَرْسَلْتُ إِلَى امْرَأَتِهِ فَأَرْسَلَتْ إِلَيَّ بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَطْعِمِيهِ الأَسَارَى).

واتە: لە عاصیمی کوڕی کولەیبەوە، لە باوکیەوە، لە یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە صلی اللە علیە وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی اللە علیە وسلم دەرچوین لەگەڵ جەنازەیەك بۆ گۆڕستان، پێغەمبەری خوام صلی اللە علیە وسلم بینی فەرمانی کرد بە گۆڕهەڵکەنەکە فەرمووی: (لەلای قاچەکانیەوە فراوانی بکە، لەلای سەریەوە فراوانی بکە)، کاتێ کە لەسەر گۆڕستان گەڕایەوە کەسێ لەلایەن ئافرەتێکەوە هات بۆ خوڵککردنی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم بۆ نان خواردن، کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم هات و خواردن هێنرا، دەستی خستە خواردنەکە، خەڵکەکەش لەدوای ئەوەوە دەستیان خستە سەر خواردنەکە، باوکانمان لوقمەیەکیان بینی لەدەمیدا ئەیجوی، لەپاشدا فەرمووی: (وا ئەزانم ئەمە گۆشتی مەڕێکە وەرگیراوە بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی). ژنەکە کەسێکی نارد بۆلای پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم کەسێکم نارد بۆ بەقیع مەڕێکم بۆ بکڕێ دەستم نەکەوت، ناردم بۆ لای دراوسێیەکی خۆم کە مەڕێکی کڕی بوو وتم بۆم بنێرە بە نرخەکەی خۆی دراوسێکەم دەست نەکەوت، ناردم بۆلای ژنەکەی ئەو مەڕەی بۆ ناردم، جا پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمووی: (دەرخواردی دیلەکانی بدە واتە بیدە بە دیلەکان با بیخۆن).

## باسی سەبارەت بە سودخۆر و سود وەرگر.

## ٤ - باب فِي آكِلِ الرِّبَا وَمُوكِلِهِ.

٣٣٣٣ - (صحيح) عبد الله بن مسعود عن أبيه قال: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَشَاهِدَهُ وَكَاتِبَهُ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعودەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم نەفرەتی کردوە لە سود خۆر و سود وەرگر و لەو کەسەی کە دەبێت بە شایەت و لەو کەسەش کە دەینوسێت).

## باسی سەبارەت بە هەڵوەوشانەوەو وەلانانی سود.

## ٥ - باب فِي وَضْعِ الرِّبَا.

٢٣٣٤ - (صحيح) عن سليمان بن عمرو, عن أبيه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم في حجة الوداع يقول: (أَلاَ إِنَّ كُلَّ رِبًا مِنْ رِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ, لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ, أَلاَ وَإِنَّ كُلَّ دَمٍ مِنْ دَمِ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ, وَأَوَّلُ دَمٍ أَضَعُ مِنْهَا دَمُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ). كَانَ مُسْتَرْضَعًا فِي بَنِي لَيْثٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ. قَالَ (اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ). قَالُوا نَعَمْ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. قَالَ (اللَّهُمَّ اشْهَدْ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عەمرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی ماڵاوایی دا دەیفەرموو: (هۆشیاربن هەموو سودێ لە سودەکانی سەردەمی نەفامی هەڵوەشاوەتەوەو وەلانراوە، ئەوەی ماڵێکی دابێ بە کەسێك بەسود سەری ماڵەکە وەربگرێتەوەو سودەکە وەرنەگرێت زوڵم و ستەم لەکەس مەکەن و با کەسیش زوڵم و ستەمتان لێ نەکات، هۆشیاربن هەموو خوێنێ لە خوێنەکانی سەردەمی نەفامی هەڵوەشاوەتەوەو وەلانراوە، یەکەم خوێنێ کە پشتگوێی دەخەم خوێنی (حارث)ی کوڕی (عبد المطلب)ە کە لەلای (بنی لیث) شیری پێ دەدرا (بنی هذیل) کوشتیان). سێ جار فەرمووی: (خوایە گەیاندم)، وتیان بەڵێ، سێ جار فەرمووی: (خوایە تۆ شاهید بە).

## باسی دەربارەی ناپەسەندی سوێندخواردن لە کڕین و فرۆشتندا.

## ٦ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الْيَمِينِ فِي الْبَيْعِ.

٣٣٣٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (الْحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ, مَمْحَقَةٌ لِلْبَرَكَةِ). قَالَ ابْنُ السَّرْحِ: (لِلْكَسْبِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (سوێندخواردن بایەخ بۆ شتەکە پەیدا دەکات و ڕەواجی پێ دەدات، بەڵام بەرەکەتەکەی ناهێڵێت). ئیبنو ئەبی سەرح لە جیاتی (لِلسِّلْعَة) وتی: (لِلْكَسْب). واتە بەرەکەتی کاسبیەکە ناهێڵێت.

## باسی سەبارەت سەنگینی کێشانەو کێشانە بەکرێ.

## ٧ - باب فِي الرُّجْحَانِ فِي الْوَزْنِ وَالْوَزْنِ بِالأَجْرِ.

٣٣٣٦ - (صحيح) عن سويد بن قيس رضي الله عنه قال: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ, فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ, فَجَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي, فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ,فَبِعْنَاهُ, وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالأَجْرِ, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (زِنْ وَأَرْجِحْ).

واتە: لە سوەیدی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و مەخرەفەی عەبدی لە هەجەرەوە قوماشمان هێنا بۆ مەککە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلامان سەودای شەرواڵێکی کرد پێمان فرۆشت، لەولاوە پیاوێ بەکرێ شتی دەکێشا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بیکێشەو سەنگین بیکێشە).

٣٣٣٦ - (صحيح) عن أبو صفوان بن عميرة قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ قَبْلَ أَنْ يُهَاجِرَ, بِهَذَا الْحَدِيثِ, وَلَمْ يَذْكُرْ: يَزِنُ بِالأَجْرِ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: رَوَاهُ قَيْسٌ كَمَا قَالَ سُفْيَانُ, وَالْقَوْلُ قَوْلُ سُفْيَانَ.

واتە: لە ئەبو صەفوانی کوڕی عومەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە مەککە چومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ مەدینە، جا راوی فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام باسی (بیکێشەو سەنگین بیکێشە)ی نەکرد. ئەبو داود دەڵێت: قەیس ریوایەتی کردوە وەك ئەوەی کە سوفیان وتی، قسەش قسەی سوفیانە.

٣٣٣٨ - (صحيح) عن ابن أبو رزمة قال: سمعت أبي يقول: قَالَ رَجُلٌ لِشُعْبَةَ: خَالَفَكَ سُفْيَانُ. قَالَ: دَمَغْتَنِي. وَبَلَغَنِي عَنْ يَحْيَى بْنِ مَعِينٍ قَالَ: كُلُّ مَنْ خَالَفَ سُفْيَانَ, فَالْقَوْلُ قَوْلُ سُفْيَانَ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو ریزمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ بە شوعبەی وت: سوفیان پێچەوانەی تۆیە، وتی: قسە قسەی سوفیانە، هەرکەسێ پێچەوانەی سوفیان بێ، قسە قسەی سوفیانە.

٣٣٣٩ - (صحيح مقطوع) عن شعبة قال: كَانَ سُفْيَانُ أَحْفَظَ مِنِّي.

واتە: لە شوعبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سوفیان لەمن چاکتر فەرموودەکەی لەبەرە بەهێزترە لە لەبەرکردندا.

## باسی سەبارەت بە فەرموودەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت: (باشترین پێوانە پێوانەی خەڵکی مەدینەیە).

## ٨ - باب فِي قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ الْمَدِينَةِ).

٣٣٤٠ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ, وَالْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ). قال أبو داود: عن حنظلة قال: (وَزْنُ الْمَدِينَةِ, وَمِكْيَالُ مَكَّةَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین کێشانە کێشانەی خەڵکی مەککەیە، باشترین پێوانەش پێوانەی خەڵکی مەدینەیە). ئەبو داود دەڵێت: لە (حنظلة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (پێوانەی خەڵکی مەدینەو، کێشانەی خەڵکی مەککە).

## باسی سەبارەت بە توندی لە قەرزدا.

## ٩ - باب فِي التَّشْدِيدِ فِي الدَّيْنِ.

٣٣٤١ - (حسن) عن سمرة قال: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِى فُلاَنٍ؟). فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ, ثُمَّ قَالَ: (هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِى فُلاَنٍ؟). فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ, ثُمَّ قَالَ: (هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِى فُلاَنٍ؟). فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ, فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا مَنَعَكَ أَنْ تُجِيبَنِى فِى الْمَرَّتَيْنِ الأُولَيَيْنِ, أَمَا إِنِّى لَمْ أُنَوِّهْ بِكُمْ إِلاَّ خَيْرًا, إِنَّ صَاحِبَكُمْ مَأْسُورٌ بِدَيْنِهِ). فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَدَّى عَنْهُ حَتَّى مَا بَقِىَ أَحَدٌ يَطْلُبُهُ بِشَىْءٍ.

واتە: لە سەمورەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆ دەداین فەرمووی: (ئایا کەسێ لە هۆزی بەنی فلان لێرەیە؟). هیچ کەسێ وەڵامی نەدایەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا کەسێ لە هۆزی بەنی فلان لێرەیە؟). هیچ کەسێ وەڵامی نەدایەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا کەسێ لە هۆزی بەنی فلان لێرەیە؟). پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من لێرەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چی رێگری ئەوەی لێ کردی لە دوو جارەکەی تردا وەڵامت نەدامەوە، خۆ من خێر و چاکەتان بۆ باس دەکەم، هاورێکەتان یان خزمەکەتان لەبەرئەوەی کە قەرزارە گیردراوە لەوەی کە بچێتە بەهەشتەوە). سەمورە وتی: بە چاوی خۆم پیاوەکەم بینی هەموو قەرزەکەی بۆ دایەوە هەتا کەس نەما داوای هیچ شتێکی لێ بکات.

٣٣٤٢ - (ضعيف) عن أبو موسى الأشعري, يقول عن أبيه: أَنَّ رسولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ أَعْظَمَ الذُّنُوبِ عِنْدَ اللَّهِ أَنْ يَلْقَاهُ بِهَا عَبْدٌ بَعْدَ الْكَبَائِرِ الَّتِى نَهَى اللَّهُ عَنْهَا: أَنْ يَمُوتَ رَجُلٌ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لاَ يَدَعُ لَهُ قَضَاءً).

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گەورەترین تاوان لەلای خوا کە بەندە بەو تاوانەوە پێی بگات لە دوای ئەو تاوانە گەورانەی کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوون ئەمەیە: پیاوێ بمرێ قەرزار بێ و ماڵێکی بەجێ نەهێشتبێ هەتا قەرزەکەی پێ بدەنەوە بۆی).

٣٣٤٣ - (صحيح) عن جابر قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُصَلِّى عَلَى رَجُلٍ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ, فَأُتِىَ بِمَيِّتٍ فَقَالَ: (أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟). قَالُوا: نَعَمْ دِينَارَانِ. قَالَ: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ). فَقَالَ أَبو قَتَادَةَ الأَنْصَارِىُّ: هُمَا عَلَىَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ, قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ, فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا فَعَلَىَّ قَضَاؤُهُ, وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ)

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی مردوی لەسەر کەسێ نەدەکرد کە قەرزار بووایە، کاتێ کە مردویەکیان دەهێنا نوێژی لەسەر بکات دەیفەرموو: (قەرزی کەسی لایە؟). وتیان: بەڵێ دوو دینار قەرزارە، فەرمووی: (دەی نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن)، ئەبوو قەتادەی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من کەفیلی دەکەم و قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی مردوی لەسەر کرد، لەدوای ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم سەرخست و ناوچەکانی رزگار کردو ماڵ و سامان و غەنیمەت زۆر بوو فەرمووی: (من لەپێشترم بۆ هەموو باوەڕدارێ لە نەفسی خۆی، هەرکەسێ قەرزارە خۆم قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، بەڵام هەرکەسێ ماڵ و سامانێ بەجێ بهێڵێ ئەوە بۆ میرات بەرەکانیەتی).

٣٣٤٤ - (ضعيف) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه و سلم مثله قال: اشْتَرَى مِنْ عِيرٍ تَبِيعًا وَلَيْسَ عِنْدَهُ ثَمَنُهُ, فَأُرْبِحَ فِيهِ, فَبَاعَهُ, فَتَصَدَّقَ بِالرِّبْحِ عَلَى أَرَامِلِ بَنِى عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَقَالَ: لاَ أَشْتَرِى بَعْدَهَا شَيْئًا إِلاَّ وَعِنْدِى ثَمَنُهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گۆلکێکی تەمەن یەك ساڵەی کڕی لە کاروانیە بەڵام نرخەکەی پێ نەبوو بۆیە فرۆشتی بە قازانج و قازانجەکەی دابەشکرد بەسەر بێوەژنەکانی هۆزی (بنی عبد المطلب)دا، فەرمووی: (لەدوای ئەمە هەرگیز شتێ ناکڕم نرخەکەیم پێ نەبێ و بۆم هەڵنەسوڕێ).

## باسی سەبارەت بە دواخستنی قەرز.

## ١٠ - باب فِي الْمَطْلِ.

٣٣٤٥ - (صحيح) عن أبو هريره، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ قەرزی کەسێکی بەلاوە بێت، دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوەو نەیداتەوە ئەوە زوڵم و ستەمە، هەرکاتێ یەکێ لەئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دارا واتە دەوڵەمەند کرا با بچێت).

## باسی سەبارەت بە دانەوەی قەرز بە جوانترین شێوە.

## ١١ - باب فِي حُسْنِ الْقَضَاءِ.

٣٣٤٦ - (صحيح) عن أبو رافع قال: اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَكْرًا, فَجَاءَتْهُ إِبِلٌ مِنَ الصَّدَقَةِ, فَأَمَرَنِي أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ, فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ فِي الإِبِلِ إِلاَّ جَمَلاً خِيَارًا رَبَاعِيًا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطِهِ إِيَّاهُ, فَإِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً).

واتە: لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وشترێکی بە سەلەم وەرگرت لە پیاوێ، جا وشتری زەکاتی بۆ هات، فەرمانی پێ کردم وشترێکی هەمان شێوە بدەمەوە بە کابرا، وتم: وشتری وەك وشترەکەی ئەوم نیە، تەنها وشترێکی تەمەن حەوت ساڵان نەبێ کە لەوەی خۆی چاکترە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەمووی: (پێی بدە بەڕاستی چاکترین کەس ئەو کەسەیە کە قەرز بە جوانترین شێوە دەداتەوە).

٣٣٤٧ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كَانَ لِي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: قەرزێکم بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بوو، بە زیادەوە قەرزەکەی دامەوە.

## باسی سەبارەت بە مامەڵەی پارە بە پارە.

## ١٢ - باب فِي الصَّرْفِ.

٣٣٤٨ - (صحيح) عن عمر رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ, وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ, وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ, وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەموویەتی: (زێڕ بە زێڕ دەست بە دەست نەبێ (ریبا)سودە، گەنم بە گەنم دەست بە دەست نەبێ سودە، خورما بە خورما دەست بە دەست نەبێ سودە، جۆ بە جۆ دەست بە دەست نەبێ سودە).

٣٣٤٩ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا, وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا, وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ مُدْيٌ بِمُدْيٍ, وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ مُدْيٌ بِمُدْيٍ, وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ مُدْيٌ بِمُدْيٍ, وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ مُدْيٌ بِمُدْيٍ, فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى, وَلاَ بَأْسَ بِبَيْعِ الذَّهَبِ بِالْفِضَّةِ وَالْفِضَّةُ أَكْثَرُهُمَا يَدًا بِيَدٍ, وَأَمَّا نَسِيئَةً فَلاَ, وَلاَ بَأْسَ بِبَيْعِ الْبُرِّ بِالشَّعِيرِ وَالشَّعِيرُ أَكْثَرُهُمَا يَدًا بِيَدٍ, وَأَمَّا نَسِيئَةً فَلاَ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەموویەتی: (زێڕ بە زێڕ چ زێڕی خاو بێ یان سکە لێ دراو. زیو بە زیو چ زیوی خاو بێ یان سکە لێ دراو، گەنم بە گەنم و، جۆ بە جۆ و، خورما بە خورماو، خوێ بە خوێ دەبێ دەق بە دەق یەك بن و دەست بە دەست بێ، ئەو کەسەی زیاتر بدات یان زیاتر وەرگرێ ئەوە سودخۆرە، بەڵام فرۆشتنی زێڕ بە زیو ئەگەر زیوەکە زیاتر بوو دەست بە دەست بوو ئەوە هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر بە قەرز بوو ئەوە دروست نیە، هەروەها فرۆشتنی گەنم بە جۆ ئەگەر جۆکە زیاتر بوو دەست بە دەست بوو ئەوە هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر بە قەرز بوو ئەوە دروست نیە).

٣٣٥٠ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت, عن النبي صلى الله عليه وسلم بِهَذَا الْخَبَرِ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ, وَزَادَ: قَالَ: فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە، لێی زیادو کەم کراوە، بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد، وتی: بەڵام ئەگەر لە چەشنی یەك نەبوون وەك گەنم بەجۆ و، زێڕ بە زیو ئەوە چۆن ئارەزوو دەکەن ئاوا بیفرۆشن بە مەرجێ دەست بە دەست بێ.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی دەسك و کێلانی شمشێر بە درهەم لەکاتێکدا کە زرکەفی زێڕ یان زیو بێت [(١)].

## ١٣ - باب فِي حِلْيَةِ السَّيْفِ تُبَاعُ بِالدَّرَاهِمِ.

٣٣٥١ - (صحيح) عن فضالة بن عبيد قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ خَيْبَرَ بِقِلَادَةٍ فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ - قَالَ أَبو بَكْرٍ وَابْنُ مَنِيعٍ: فِيهَا خَرَزٌ مُعَلَّقَةٌ بِذَهَبٍ - ابْتَاعَهَا رَجُلٌ بِتِسْعَةِ دَنَانِيرَ, أَوْ بِسَبْعَةِ دَنَانِيرَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ حَتَّى تُمَيِّزَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ). فَقَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ الْحِجَارَةَ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ حَتَّى تُمَيِّزَ بَيْنَهُمَا). قَالَ: فَرَدَّهُ حَتَّى مُيِّزَ بَيْنَهُمَا. وَقَالَ ابْنُ عِيسَى: أَرَدْتُ التِّجَارَةَ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: وَكَانَ فِي كِتَابِهِ الْحِجَارَةُ فَغَيَّرَهُ, فَقَالَ: التِّجَارَةَ.

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەساڵی رزگارکردنی قەڵای خەیبەردا گەردانەیەکی تێکەڵ لە زێڕ و موورویان هێنا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەبوو بەکر و ئیبنو مەنیع وتیان: مووروی بە زێڕ هەڵواسراو، پیاوێ کڕی بە نۆ دینار، یان بە حەوت دینار، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (فرۆشتنی دروست نیە هەتا زێڕ و مووروەکە لەیەك جیا نەکرێنەوە)، وتی: مەبەستم لە کڕینی موورە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (فرۆشتنی دروست نیە هەتا زێڕ و مووروەکە لەیەك جیا نەکرێنەوە)، راوی وتی: گەردانەکەی گێڕایەوە بۆ فرۆشیارەکە هەتا لەیەك جیایان بکاتەوە، ئیبنو عیسا وتی: مەبەستم لەم مامەڵەدا بازرگانی بە (التِّجَارَة)، ئەبو داود دەڵێت: لە پەرتوکەکەی ئیبنو عیسادا (الْحِجَارَة) بووە. لەهەندێ نوسخەدا گۆڕاوە، وتی: (التِّجَارَة).

(١) بێگومان درهەم و دیناری ئەو سەردەمە زێڕ بوو.

٣٣٥٢ - (صحيح) عن فضالة بن عبيد قال: اشْتَرَيْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلاَدَةً بِاثْنَىْ عَشَرَ دِينَارًا فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ, فَفَصَّلْتُهَا, فَوَجَدْتُ فِيهَا أَكْثَرَ مِنَ اثْنَىْ عَشَرَ دِينَارًا, فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لاَ تُبَاعُ حَتَّى تُفَصَّلَ).

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی ڕزگارکردنی قەڵای خەیبەردا گەردانەیەکم کڕی بە دوانزە دینار، هەندێکی زێر و هەندێکی موورو بوو، زێڕ و مووروەکەم لەیەك جیاکردەوە، تەماشا دەکەم لە دوانزە دینار زیاترە، ئەوەم باسکرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەتا جیانەکرێتەوە نافرۆشرێ).

٣٣٥٣ - (صحيح) عن فضالة بن عبيد قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ نُبَايِعُ الْيَهُودَ الأُوقِيَّةَ مِنَ الذَّهَبِ بِالدِّينَار - قَالَ غَيْرُ قُتَيْبَةَ: بِالدِّينَارَيْنِ وَالثَّلاَثَةِ, ثُمَّ اتَّفَقَا - فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ وَزْنًا بِوَزْنٍ).

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەڕۆژی خەیبەردا لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووین، ئۆقیەیە زێڕمان فرۆشت بە دینار بە جولەکەیە - جگە لە قوتەیبە وتیان: بە دوو دینار یا سێ دینار، لە پاشدا هەردوو راوی کۆك و تەبان - وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن مەگەر دەق وەك یەك بن و کێشانەکەیان هاوتا بێ).

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی زێڕ لەجیاتی زیو.

## ١٤ - باب فِي اقْتِضَاءِ الذَّهَبِ مِنَ الْوَرِقِ.

٣٣٥٤ - (ضعيف) عن ابن عمر قال: كُنْتُ أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ, فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ, وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ: آخُذُ هَذِهِ مِنْ هَذِهِ, وَأُعْطِي هَذِهِ مِنْ هَذِهِ, فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, رُوَيْدَكَ أَسْأَلُكَ, إِنِّي أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ, فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ, وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ, آخُذُ هَذِهِ مِنْ هَذِهِ, وَأُعْطِي هَذِهِ مِنْ هَذِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسَعْرِ يَوْمِهَا, مَا لَمْ تَفْتَرِقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من لە بەقیع وشترم دەفرۆشت، بە دیناری زێڕ دەمفرۆشت درهەمی زیوم لە جیاتی دا وەردەگرت، بە درهەمی زیو دەمفرۆشت دیناری زێڕم لە جیاتی دا وەردەگرت، دیناری زێڕم لە جیاتی دا درهەمی زیو وەردەگرت، دیناری زێڕم لە جیاتی درهەمی زیو دەدا، چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵی حەفصەی خێزانی بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من لە بەقیع وشترم دەفرۆشت، بە دینار دەمفرۆشت درهەمم لە جیاتی دا وەردەگرت، بە درهەم دەمفرۆشت دینارم لە جیاتی دا وەردەگرت، فەرمووی: (هیچی تێدا نیە ئەگەر بەنرخی ڕۆژ وەری بگریت، بە مەرجێ لەپێش ئەوەدا لەیەك جیاببنەوە هیچ لەنێوانتاندا نەمێنێ).

٣٣٥٥ - عن سماك بن حرب بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ, وَالأَوَّلُ أَتَمُّ, لَمْ يَذْكُرْ: (بِسِعْرِ يَوْمِهَا).

واتە: لە سیماکی کوڕی حەربەوە فەرموودەی پێشو هاتوە بە هەمان سەنەدو مانا، بەڵام فەرمودەی یەکەم تەواوترە، بەڵام باسی (بِسِعْرِ يَوْمِهَا)ی نەکرد - (بِسِعْرِ يَوْمِهَا) واتە بەنرخی ڕۆژ.

## باسی دەربارەی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە قەرز.

## ١٥ - باب فِي الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً.

٣٣٥٦ - (صحيح) عن سمرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً.

واتە: لە سەمورەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە قەرز.

## باسی سەبارەت بە روخسەت لەمەدا.

## ١٦ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٣٣٥٧ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يُجَهِّزَ جَيْشًا, فَنَفِدَتِ الإِبِلُ, فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ فِي قِلَاصِ الصَّدَقَةِ, فَكَانَ يَأْخُذُ الْبَعِيرَ بِالْبَعِيرَيْنِ إِلَى إِبِلِ الصَّدَقَةِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردوە سوپایە ئامادە بکات، وشتر تەواو بوو، فەرمانی پێ کرد لەوشتری خێر و زەکات بەرێت، ئەویش وشترێکی بە دوو وشتر دەبرد بۆ وشتری زەکات.

## باسی سەبارەت بە لەمەدا ئەگەر دەست بەدەست بێت.

## ١٧ - باب فِي ذَلِكَ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ.

٣٣٥٨ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اشْتَرَى عَبْدًا بِعَبْدَيْنِ.

واتە: لە جابیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەندەیەکی کڕیوە بە دوو بەندە.

## باسی سەبارەت بە خورمای تەڕ بە خورمای وشك.

## ١٨ - باب فِي التَمَر بِالتَّمْرِ.

٣٣٥٩ - (صحيح) عن عبد الله بن يزيد, أن زيدا أبا عياش أخبره: أَنَّهُ سَأَلَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ عَنِ الْبَيْضَاءِ بِالسُّلْتِ, فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: أَيُّهُمَا أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْبَيْضَاءُ, قَالَ: فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ, وَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْأَلُ عَنْ شِرَاءِ التَّمْرِ بِالرُّطَبِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ؟). قَالُوا: نَعَمْ, فَنَهَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی یەزیدەوە، دەگێڕنەوە، زەید ئەبا عەیاش هەواڵی داوەتێ، کە پرسیاری کردوە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەربارەی (الْبَيْضَاء) کە دانەوێڵەیەکە وەك گەنم بە (السُّلْت) ئەویش هەر دانەوێڵەیەکە وەك ئەو بەڵام تەڕی و وشکیەکەیان جیاوازە، سەعد پێی وت: کامەیان چاکە؟ وتی: (الْبَيْضَاء)، راوی وتی: جا سەعد نەهی لێ کردو وتی: گوێم لێ بوو دەربارەی خورمای وشك بە خورمای تەڕ لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی فەرمووی: (ئەگەر خورمای تەڕەکە وشك بوویەوە کەم دەکات؟). وتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی لێ کرد.

٢٣٦٠ - (شاذ) عن سعد بن أبي وقاص قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الرُّطَبِ بِالتَّمْرِ نَسِيئَةً.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشك بە قەرز.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی خورمای گەیو بەدارەوە بە بڕێك خورمای لێکراوە.

## ١٩ - باب فِي الْمُزَابَنَةِ.

٢٣٦١ - (صحيح) عن ابن عمر: أن النبي صلى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً, وَعَنْ بَيْعِ الْعِنَبِ بِالزَّبِيبِ كَيْلاً, وَعَنْ بَيْعِ الزَّرْعِ بِالْحِنْطَةِ كَيْلاً.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەری خورما بەدارەوە بە گۆترە بە خورمای وشك بە پێوانە، هەروەها لە فرۆشتنی ترێ بەدارەوە بە مێوژ بە پێوانە، وە لە فرۆشتنی گوڵە گەنمی تەڕ بە گەنمی وشك بە پێوانە.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی ( الْعَرَايَا ) واتە بەری ئەو درەختەی کە خاوەنەکەی جیای دەکاتەوە بۆ خواردن بە دارەکەوە.

## ٢٠ - باب فِي بَيْعِ الْعَرَايَا.

٣٣٦٢ - (صحيح) عن زيد بن ثابت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِالتَّمْرِ وَالرُّطَبِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ڕێگەی داوە بە فرۆشتنی (الْعَرَايَا) بەری خورما بە دارخورماکەوە بە خورمای لێکراوە لەبەر پێویستی.

٣٣٦٣ - (صحيح) عن سهل بن حثمة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا: يَأْكُلُهَا أَهْلُهَا رُطَبًا.

واتە: لە سەهلی کوڕی (حثمة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم بەدارەوە وەك بەری خورما بەدارەوە بە خورمای وشك، یان ترێ بە مێوژ، بەڵام ڕێگەی داوە بە فرۆشتنی (الْعَرَايَا) کە بەدارەوە بخەمڵێنرێت بە خورمای پێگەیشتوی ڕنراو، هەتا کڕیارەکەی بە تەڕی و پێگەیشتویی بیخوات.

## باسی سەبارەت بە ئەندازەی ( الْعَرِيَّة ).

## ٢١ - باب فِي مِقْدَارِ الْعَرِيَّةِ.

٣٣٦٤ - (صحيح) عن أبوو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ, أَوْ فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ, شَكَّ دَاوُدُ بْنُ الْحُصَيْنِ. قَالَ أبوو دَاوُدَ: حَدِيثُ جَابِرٍ إِلَى أَرْبَعَةِ أَوْسُقٍ.

واته: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێگەی داوە بە فرۆشتنی (الْعَرَايَا) بە مەرجێ لە پێنج ویسق کەمتربێت، یان لە پێنج ویسق تێ نەپەڕێت، داودی کوڕی حوصەین گومانی هەبوو، ئەبوو داود دەڵێت: لە فەرمودەکەی جابردا هاتوە لە چوار ویسق تێ نەپەڕێت.

## باسی سەبارەت بە تەفسیری ( الْعَرَايَا )

## ٢٢ - باب تَفْسِيرِ الْعَرَايَا.

٣٣٦٥ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن عبد ربه بن سعيد الأنصاري قال: الْعَرِيَّةُ: الرَّجُلُ يُعْرِى الرَّجُلَ النَّخْلَةَ أَوِ الرَّجُلُ يَسْتَثْنِى مِنْ مَالِهِ النَّخْلَةَ أَوْ الاِثْنَتَيْنِ يَأْكُلُهَا فَيَبِيعُهَا بِتَمْرٍ.

واته: لە (عَبْدِ رَبِّه)ی کوڕی سەعیدی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (الْعَرِيَّة) ئەوەیە پیاوێ بەری دارخورمایە بدات بە پیاوێکی تر، یان پیاوێ دارخورمایە یا دوو دارخورما جیابکاتەوە بۆ خواردنی خۆی لەپاشدا بیفرۆشێ بە خورمای لێکراوە.

٣٣٦٦ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن ابن إسحاق قال: الْعَرَايَا: أَنْ يَهَبَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ النَّخَلاَتِ, فَيَشُقَّ عَلَيْهِ أَنْ يَقُومَ عَلَيْهَا فَيَبِيعَهَا بِمِثْلِ خَرْصِهَا.

واتە: لە ئیبنو ئیسحاقەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (الْعَرَايَا) ئەوەیە پیاوێ بەری چەند دارخورمایە بەدیاری بدات بە پیاوێکی تر، لەپاشدا قورس بێت لەسەری بخەملێنرێت و بیفرۆشێتەوە بە خورمای وشك بە ئەندازەی خەملێنراوەکە.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی بەروبووم پێش گەیشتنی.

## ٢٣ - باب فِي بَيْعِ الثِّمَارِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلاَحُهَا.

٣٣٦٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا, نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێ دەگات واتە سور دەبێت یان زەرد، نەهی کردوە لە فرۆشیار هەتا ماڵەکەی زایە نەبێت و زەرەر نەکات هەروەها نەهی کردوە لەکڕیار هەتا ماڵی براکەی بە ناڕەوا نەخوات.

٣٣٦٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ, وَعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ وَيَأْمَنَ الْعَاهَةَ, نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێ دەگات واتە سور یان زەرد دەبێت، هەروەها نەهی کردوە لە فرۆشتنی دانەوێڵە بەرلەوە کە سپی هەڵئەگەڕێ و لە دەردو نەخۆشی ڕزگاری ببێ.

نەهی کردوە لە فرۆشیار هەتا ماڵەکەی زایە نەبێت و زەرەر نەکات نەهی کردوە لەکڕیار هەتا ماڵی براکەی بە ناڕەوا نەخوات.

٣٣٦٩ - (ضعيف الإسناد) عن أبو هريرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الْغَنَائِمِ حَتَّى تُقْسَمَ، وَعَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى تُحْرَزَ مِنْ كُلِّ عَارِضٍ، وَأَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ بِغَيْرِ حِزَامٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی غەنیمەت هەتا دابەش دەکرێت، هەروەها نەهی کردوە لە فرۆشتنی خورما هەتا لە دەردو نەخۆشی رزگاری دەبێ، لە پیاوێکیش هەتا خۆی نەپێچێتەوە نوێژ بکات لەبەرئەوەی نەوەکا شەرمگەی دەرکەوێت.

٣٣٧٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُبَاعَ الثَّمَرَةُ حَتَّى تُشَقِّحَ. قِيلَ: وَمَا تُشَقِّحُ؟ قَالَ: (تَحْمَارُّ وَتَصْفَارُّ وَيُؤْكَلُ مِنْهَا).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێ دەگات، وترا: پێگەیشتنی چۆنە؟ فەرمووی: (سور یان زەرد دەبێت و لێی بخورێت).

٣٣٧١ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْعِنَبِ حَتَّى يَسْوَدَّ، وَعَنْ بَيْعِ الْحَبِّ حَتَّى يَشْتَدَّ.

واتە: لە ئەنەسەوە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی ترێ هەتا رەش دەبێت واتە هەتا پێ دەگات، هەروەها نەهی کردوە لە فرۆشتنی دانەوێڵە هەتا دەنکەکەی رەق دەبێت واتە هەتا پێ دەگات.

٣٣٧٢ - (صحيح) عن زيد بن ثابت قال: كَانَ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ الثِّمَارَ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلاَحُهَا, فَإِذَا جَدَّ النَّاسُ وَحَضَرَ تَقَاضِيهِمْ قَالَ الْمُبْتَاعُ: قَدْ أَصَابَ الثَّمَرَ الدُّمَانُ, وَأَصَابَهُ قُشَامٌ, وَأَصَابَهُ مُرَاضٌ عَاهَاتٌ يَحْتَجُّونَ بِهَا!! فَلَمَّا كَثُرَتْ خُصُومَتُهُمْ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَالْمَشُورَةِ يُشِيرُ بِهَا: (فَإِمَّا لاَ فَلاَ تَتَبَايَعُوا الثَّمَرَةَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا). لِكَثْرَةِ خُصُومَتِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خەڵك بەروبوومەکەیان دەفرۆشت پێش ئەوەی کە پێ بگات، کاتێ کە خاوەن هەق دەهات داوای هەقی خۆی دەکرد کریار دەیوت: بەروبوومەکە توشی نەخۆشی (الدُّمَان) بووە، توشی نەخۆشی (قُشَام) بووە، توشی گەلێك نەخۆشی بووە چەندەها دەردو نەخۆشی و بیانوی بۆ دەدۆزییەوەو دەیکردە بەڵگە بۆئەوەی نرخەکەی نەدات!! کاتێ کە لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم کێشەو دەمەقاڵێ و دژایەتی و ناکۆکیان زیادی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەك پرس و را ئاماژەی بۆ کردن فەرمووی: (مادەم وایە ئیتر بەروبوومەکەتان مەفرۆشن هەتا پێ دەگات). بێگومان لەبەر زۆری کێشەو دەمەقاڵێ و دژایەتی و ناکۆکی و جیاوازییان.

٣٣٧٣ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهُ, وَلاَ يُبَاعُ إِلاَّ بِالدِّينَارِ أَوْ بِالدِّرْهَمِ, إِلاَّ الْعَرَايَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێ دەگات، کاتێ کە پێ گەیشت نابێ بفرۆشرێت بە جگە لە دینار و درهەم ئیللا (العرايا) نەبێت.

## باسی دەربارەی فرۆشتنی بەروبوومی درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ.

## ٢٤ - باب فِي بَيْعِ السِّنِينَ.

٣٣٧٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ السِّنِينَ وَوَضَعَ الْجَوَائِحَ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: لَمْ يَصِحَّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الثُّلُثِ شَيْءٌ, وَهُوَ رَأْيُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ.

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەروبوومی درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ - ئەمەش دروست نیە لەبەرئەوەی فرۆشتنی شتێكە بوونی نیە، فرۆشتنی بەروبووم دروست نیە پێش پێگەیشتنی، ئەگەر كەسێ بەروبوومەكەی بەدارەوە فرۆشت لەدوای پێگەیشتن بەروبوومەكە توشی دەردو نەخۆشی هات ئەوە كریار لێی بەرپرسە، فرۆشیار بۆی هەیە بەهاكەی لێ بسێنێ بەڵام وا چاكە چاوپۆشی لێ بكات یان كەمتری لێ بسێنێ. ئەبو داود دەڵێت: دەربارەی سێ یەك بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم نەهاتوە، ئەوە بریتیە لە راوبۆچونی خەڵكی شاری مەدینە.

٣٣٧٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْمُعَاوَمَةِ. وَقَالَ أَحَدُهُمَا: بَيْعِ السِّنِينَ.

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەروبوومی درەخت بە ساڵانە واتە لەساڵێ زیاتر. یەكێك لە راویەكان وتی: نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەروبوومی درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ.

## باسی دەربارەی مامەڵەی خەڵەتاندن.

## ٢٥ - باب فِي بَيْعِ الْغَرَرِ.

٣٣٧٦ - (صحيح) عن أبي هريرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ, زَادَ عُثْمَانُ: وَالْحَصَاةِ.

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە مامەڵەی خەڵەتاندن - وەك مامەڵەی ماسی لە دەریادا، باڵندە لە ئاسماندا -، (عُثْمَان) ئەمەی بۆ زیادکرد: هەروەها نەهی کردوە لە مامەڵەی بەرد فڕێدانیش - بۆ نمونە فرۆشیار بەردێ بهاوێت بڵێ ئەم زەویەم پێ فرۆشتیت هەتا ئەو جێگایەی ئەو بەردە پێی دەگات، ئەمەش دروست نیە چونکە بەرد هاویشتنەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ هەیە زیاتر دەیهاوێژێ - .

٣٣٧٧ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ وَعَنْ لِبْسَتَيْنِ, أَمَّا الْبَيْعَتَانِ: فَالْمُلَامَسَةُ وَالْمُنَابَذَةُ, وَأَمَّا اللِّبْسَتَانِ: فَاشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ, وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ كَاشِفًا عَنْ فَرْجِهِ, أَوْ لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە دوو جۆر مامەڵەو دوو شێوە پۆشاك لەبەرکردن، دوو جۆر مامەڵەکە بریتین لە: مامەڵەی دەست لێدان و مامەڵەی فڕێدان - بۆ نمونە مامەڵەی پۆشاکێ بە دەستدان لە پۆشاکەکە بەبێ سەیرکردن، مامەڵەی فڕێدان کەسێ پۆشاکەی خۆی فڕێ بدات بۆ کەسێکی تر ئەویش پۆشاکەکەی خۆی بۆ فڕێ بدات -، دوو شێوە پۆشاك لەبەرکردنیش بریتین لە: کەسێ پۆشاکێ بدات بە لایەکی شانی دا لاکەی تری بەدەرەوە بێت، یان کەسێ دانیشێ

قەچەکانی بلکێنێ بە سکیەوە بە پۆشاکێ و بدات بەخۆیدا شەرمگەی بەدەرەوە بێت. یان شەرمگەی دانەپۆشێت.

٣٣٧٨ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, بِهَذَا الْحَدِيثِ, زَادَ وَاشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ: أَنْ يَشْتَمِلَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ يَضَعُ طَرَفَيِ الثَّوْبِ عَلَى عَاتِقِهِ الأَيْسَرِ وَيُبْرِزُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ, وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَقُولَ: إِذَا نَبَذْتُ إِلَيْكَ هَذَا الثَّوْبَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ, وَالْمُلاَمَسَةُ: أَنْ يَمَسَّهُ بِيَدِهِ وَلاَ يَنْشُرُهُ وَلاَ يُقَلِّبُهُ, فَإِذَا مَسَّهُ وَجَبَ الْبَيْعُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: (اشْتِمَالُ الصَّمَّاء) بریتیە لە: کەسێ پۆشاکێ لەبەر بکات لایەکی بدات بەسەر شانی چەپی دا شانی راستی بەدەرەوە بێت یان بە پێچەوانەوە، (الْمُنَابَذَة)ش بریتیە لەوەی کەسێ بڵێ: ئەم پۆشاکەت بۆ هەڵدەدەم ئەوە مامەڵەکە دامەزراوە، (الْمُلاَمَسَة)ش بریتیە لەوەی کەسێ مامەڵەی پۆشاکێ بکات بەس دەستی لێ بدات بڵاوی نەکاتەوە و ئەم دیو دیوی پێ نەکات، ئەگەر دەستی لێ دا ئەوە مامەڵەکە دامەزراوە.

٣٣٧٩ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَى حَدِيثِ سُفْيَانَ وَعَبْدِ الرَّزَّاقِ جَمِيعًا.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردوە لە، جا راوی فەرموودەکەی بە هەمان مانای فەرموودەکەی سوفیان و (عبد الرزاق) گێڕایەوە واتە فەرموودەی پێشو.

٣٣٨٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی کۆرپەی ئەو کۆرپەیەی لەسکی دایکی دایە، واتە ئەگەر وشترێك ئاوس بووایە بەچکەیەکی مێینەی ببووایە، لەپاشدا ئەو بەچکەیە ئاوس ببووایە بەچکەیەکی ببوایە ئەو بەچکەیان دەفرۆشت، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لەو مامەڵەیە، چونکە شتێکە بوونی نیەو نادیارە.

٣٣٨١ - (صحيح) عن ابن عمر عن النبي صلى الله عليه و سلم نحوه وقال: حَبَلُ الْحَبَلَةِ: أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ بَطْنَهَا ثُمَّ تَحْمِلُ الَّتِى نُتِجَتْ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، وتی: (حَبَلُ الْحَبَلَة) بریتیە لەوەی ئەگەر وشترێك ئاوس بووایە بەچکەیەکی مێینەی ببووایە، لەپاشدا ئەو بەچکەیە ئاوس ببووایە بەچکەیەکی ببووایە ئەو بەچکەیان دەفرۆشت، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لەو مامەڵەیە، چونکە شتێکە بوونی نیەو نادیارە.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی ناچاری.

## ٢٦ - باب فِى بَيْعِ الْمُضْطَرِّ.

٣٣٨٢ - (ضعيف) عن شيخ من بني تميم, قال: خطبنا علي بن أبي طالب رضي الله عنه - أو قال: قال علي، قال ابن عيسى : هكذا حدثنا هشيم - قال: سَيَأْتِى عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ عَضُوضٌ يَعَضُّ الْمُوسِرُ عَلَى مَا فِى يَدَهِ, وَلَمْ يُؤْمَرْ بِذَلِكَ, قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَلاَ تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ). وَيُبَايِعُ الْمُضْطَرُّونَ, وَقَدْ نَهَى النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الْمُضْطَرِّ, وَبَيْعِ الْغَرَرِ, وَبَيْعِ الثَّمَرَةِ قَبْلَ أَنْ تُدْرِكَ.

واتە: لە شێخێکی بەنی تەمیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی

کوڕی (أَبِي طَالِب) ڕەزای خوای لێ بێ وتاری بۆ خوێندینەوە - یان وتی: پێشەوا عەلی وتی: ئیبنو عیسا وتی: هەشیم بەم شێوەیە بۆی گێڕاینەوە - وتی: زەمانێ دێت بەسەر خەڵکدا دەسەڵاتدارەکان دەست دەگرن بەوەی لەدەستیاندایە هەرچەندە فەرمانیان بەوە پێ نەکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ﴾ . سورە البقرە : ٢٣٧. واتە: چاکەی نێوانتان لەبیرمەکەن. ناچارەکان کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ دەکرێت، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی ناچاری و فرۆشتنی هەڵخەڵەتاندن(غرر)و فرۆشتنی میوە پێش پێگەیشتنی.

## باسی سەبارەت بە هاوبەشی و شەریکایەتی.

## ٢٧ - باب فِى الشَّرِكَةِ.

٣٣٨٣ - (ضعيف) عن أبو هريرة, رفعه, قال: (إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: أَنَا ثَالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ, فَإِذَا خَانَهُ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِمَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خوای گەورە دەفەرموێت: (من سێیەمی دوو شەریکم تاکو یەکێکیان خیانەت نەکات لە هاوڕێکەی، بەڵام هەرکاتێ خیانەتی لێ کرد ئەوە لەنێوانیان دەردەچم).

## باسی سەبارەت بە پێش بڕکێ کار یان زیاد کەر و کەم کەر لەکاری بازرگانیدا موخالەفە بکات.

## ٢٨ - باب فِي الْمُضَارِبِ يُخَالِفُ.

٣٣٨٤ - (صحيح) عن عروة ابن أبو الجعد البارقي, أَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِينَارًا يَشْتَرِي بِهِ أُضْحِيَةً أَوْ شَاةً, فَاشْتَرَى شَاتَيْنِ, فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا

بِدِينَارٍ, فَأَتَاهُ بِشَاةٍ وَدِينَارٍ, فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ, فَكَانَ لَوِ اشْتَرَى تُرَابًا لَرَبِحَ فِيهِ.

واتە: لە عوروەی کوڕی ئەبو جەعدی بارەقیەوە هاتوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دینارێکی داوەتێ کە ئاژەڵێکی بۆ بکڕێت، ئەویش دوو ئاژەڵی بۆ کڕی، یەکێکیانی دا بە دینارێك و، ئەوی تریان و دینارێکی بۆ هێنایەوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعای بۆ کرد کە پیت و بەرەکەت بکەوێتە مامەڵەیەوە، لەدوای ئەو دوعایە خاك و خۆڵیشی بکڕیایە قازانجی دەکرد.

٣٣٨٥ - عن عروة البارقي, بِهَذَا الْخَبَرِ, وَلَفْظُهُ مُخْتَلِفٌ.

واتە: لە عوروەی بارەقیەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام دەبڕینەکەی جیاوازە.

٣٣٨٦ - (ضعيف) عن حكيم بن حزام: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مَعَهُ بِدِينَارٍ يَشْتَرِي لَهُ أُضْحِيَةً, فَاشْتَرَاهَا بِدِينَارٍ, وَبَاعَهَا بِدِينَارَيْنِ, فَرَجَعَ فَاشْتَرَى لَهُ أُضْحِيَةً بِدِينَارٍ, وَجَاءَ بِدِينَارٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَتَصَدَّقَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَدَعَا لَهُ أَنْ يُبَارَكَ لَهُ فِي تِجَارَتِهِ.

واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە هاتوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دینارێکی داوەتێ ئاژەڵێکی بۆ بکڕێت، ئەویش ئاژەڵێکی بۆ کڕی بە دیناریێ. لەپاشدا فرۆشتی بە دوو دینار، گەڕایەوە ئاژەڵێکی بۆ کڕی بە دیناریێ. ئاژەڵێك و دینارێکی هێنایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش کارەکەی پەسەند کردو بە ڕاستی دانا، دوعای بۆ کرد کە پیت و بەرەکەت بکەوێتە بازرگانیەکەیەوە.

## باسی سەبارەت بە کەسێ بەبێ پرس بازرگانی بکات بە ماڵ و سامانی کەسێکی ترەوە.

## ٢٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَتَّجِرُ فِي مَالِ الرَّجُلِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ.

٣٣٨٧ - (منكر بهذه الزيادة في أوله وهو في ((صحيحين)) دونها) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ مِثْلَ صَاحِبِ فَرْقِ الأَرُزِّ فَلْيَكُنْ مِثْلَهُ). قَالُوا: وَمَنْ صَاحِبُ فَرْقِ الأَرُزِّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَذَكَرَ حَدِيثَ الْغَارِ حِينَ سَقَطَ عَلَيْهِمُ الْجَبَلُ, فَقَالَ: كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمُ اذْكُرُوا أَحْسَنَ عَمَلِكُمْ, قَالَ: وَقَالَ الثَّالِثُ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنِّي اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرْقِ أَرُزٍّ, فَلَمَّا أَمْسَيْتُ عَرَضْتُ عَلَيْهِ حَقَّهُ, فَأَبَى أَنْ يَأْخُذَهُ, وَذَهَبَ, فَثَمَّرْتُهُ لَهُ حَتَّى جَمَعْتُ لَهُ بَقَرًا وَرِعَاءَهَا, فَلَقِيَنِي, فَقَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي, فَقُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرِعَائِهَا فَخُذْهَا, فَذَهَبَ فَاسْتَاقَهَا).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ دەتوانێ وەك خاوەنی (فَرْق)ی برنجەکە بێت با وەکو ئەو بێت). - (فَرْق) ی برنج پێوانەیەکی خەڵکی مەدینە بووە شانزە ڕەتڵی گرتوە - وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خاوەنی (فَرْق)ێ برنجەکە کێ یە؟ فەرمودەی ئەشکەوتەکەی بۆ باس کردن کە سێ کەس چونە ئەشکەوتێکەوە کێوەکە هەرەسی کردو بەردێکی گەورە دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، ڕاوی وتی: هەر یەکێ لەوانە چی کردەوەیەکی باشی کردبوو بۆ خوا باسی کردو پێی پاڕایەوە هەتا خوای گەورە دەروی خێری لێ کردنەوەو ڕزگاری کردن، ڕاوی وتی: سێیەمیان وتی: ئەی خوایە تۆ خۆت ئاگاداری کە من جارێ کرێکارێکم بەکرێ گرت بە (فَرْق)، کاتێ کە ئێوارە هات و ئیشەکەی تەواو کرد کرێکەم دایە وەری نەگرت و ڕۆیشت، منیش هەموو ساڵێ چەڵتوکەکەی ئەوم دەچاندو بەرهەمەکەیم کۆکردەوەو گاگەل و ڕانێکم پێ کڕی و بۆم کۆکردەوە، ڕۆژێ

کرێکارەکە هاتەوە بۆلام، وتی: حەقەکەی خۆمم بدەرێ، وتم: برۆ ئەو گاگەل و رانە بەرە بۆ خۆت، ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆ خۆی و رۆشت.

## باسی سەبارەت بە شەریکایەتی لەغەیری سەرمایەدا.

## ٣٠ - باب فِي الشَّرِكَةِ عَلَى غَيْرِ رَأْسِ مَالٍ.

٣٣٨٨ - (ضعيف) عن عبد الله قال: اشْتَرَكْتُ أَنَا وَعَمَّارٌ وَسَعْدٌ فِيمَا نُصِيبُ يَوْمَ بَدْرٍ, قَالَ: فَجَاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ وَلَمْ أَجِئْ أَنَا وَعَمَّارٌ بِشَيْءٍ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: من و عەممار و سەعد بڕیارماندا لەدەستکەوتی رۆژی بەدردا شەریك بین، (عَبْدُ اللّه)وتی: سەعد دوو دیلی هێنا بەڵام ئێمە هیچمان نەهێنا.

## باسی سەبارەت بەکرێدانی زەوی بۆ چاندن.

## ٣١ - باب فِي الْمُزَارَعَةِ.

٣٣٨٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: مَا كُنَّا نَرَى بِالْمُزَارَعَةِ بَأْسًا, حَتَّى سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْهَا. فَذَكَرْتُهُ لِطَاوُسٍ, فَقَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَنْهَ عَنْهَا, وَلَكِنْ قَالَ: (لأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَرْضَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرَاجًا مَعْلُومًا).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە

ـەیشدا زەوی و زارمان بەکرێ دەدا بۆ چاندن بە خراپمان نەدەزانی هەتا
ـە رافیعی کوڕی خەدیجم بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه
وسلم نەهی لێ کردوە. منیش ئەوەم باسکرد بۆ (طاوس) وتی: ئیبنو عەباس
ـی وتم: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی لێ نەکردوە،، بەڵام
فەرمووی: (هەرکەسێکتان زەویەکەی ببەخشێت بۆ چاندن ئەوە خێر ترە بۆی
ـەوەی کرێ و خەراجی دیاریکراوی لەسەر وەربگرێت).

٣٣٩٠ - (ضعيف) عن عروة بن الزبير قال: قال زيد بن ثابت: يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ! أَنَا وَاللَّهِ أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ مِنْهُ, إِنَّمَا أَتَاهُ رَجُلَانِ - قَالَ مُسَدَّدٌ: مِنَ الْأَنْصَارِ, ثُمَّ اتَّفَقَا -: قَدِ اقْتَتَلَا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ كَانَ هَذَا شَأْنَكُمْ فَلَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ). زَادَ مُسَدَّدٌ: فَسَمِعَ قَوْلَهُ (لَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ).

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: زەیدی کوڕی (ثابت) وتی: خوای گەورە لە رافیعی کوڕی خەدیج خۆش بێت، سوێند بە (الله) من لەو زیاتر ئاگاداری فەرمودەکەم، دوو پیاوی ئەنصاری بەشەڕهاتبوون هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - موسەددەد وتی: دوو پیاو لە ئەنصار، لەپاشدا هەردوو راوی کۆکن - : کە بەشەڕهاتبوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه فەرمووی: (ئەگەر ئێوە ئەوە حاڵتان بێت زەوی مەدەن بەکرێ بۆ چاندن). موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: رافیع تەنها گوێی لەوە بووە: (زەوی مەدەن بەکرێ بۆ چاندن).

٣٣٩١ - (حسن) عن سعد قال: كُنَّا نُكْرِي الْأَرْضَ بِمَا عَلَى السَّوَاقِي مِنَ الزَّرْعِ وَمَا سَعِدَ بِالْمَاءِ مِنْهَا, فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ, وَأَمَرَنَا أَنْ نُكْرِيَهَا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ.

واتە: لە سەعدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە زەویمان دەدا بەکرێ بەوەی لەسەر قەراغی جۆگەو ئاوەکان دەڕوێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه نەهی

لێ کردین لەوەی کە کاری لەو جۆرە بکەین، بەڵام فەرمانی پێ کردین زەوی بدەین بەکرێ بە زێڕ و بە زیو.

٣٣٩٢ - (صحيح) عن حنظلة بن قيس الأنصاري قال: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ, فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهَا, إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ وَأَشْيَاءَ مِنَ الزَّرْعِ, فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا, وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا, وَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلاَّ هَذَا, فَلِذَلِكَ زَجَرَ عَنْهُ, فَأَمَّا شَيْءٌ مَضْمُونٌ مَعْلُومٌ فَلاَ بَأْسَ بِهِ.

واتە: لە (حنظلة)ی کوڕی قەیسی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە رافیعی کوڕی خەدیجم پرسی دەربارەی بەکرێدانی زەوی بە زێڕ و زیو، وتی: هیچی تێدا نیە، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم خەڵك زەویان دەدا بەکرێ لەسەر ئەوەی کە لە ئەمبەر و ئەوبەری ئاوەکان دەڕوێت. یان لەسەر ئەوەی کە لەسەرتاو سەری جۆگەکان و دەوروبەری ئاوەکان دەڕوێ. جاری وا دەبوو هی خاوەن موڵکەکە باشی دەهێناو هی وەرزێرەکە خراپ، یان بە پێچەوانەوە، تەنها بەم شێوەیەش زەوییان بەکرێ دەدا، ئەمەش زۆرجار دەبووە هۆی کێشەو هەرا لەبەرئەوەی لایەکیان زەرەرمەند دەبوو، بەڵام زەوی بەکرێدان لەسەر کرێیەکی دیاریکراو هیچی تێدا نیە.

٣٣٩٣ - (صحيح) عن حنظلة بن قيس: أَنَّهُ سَأَلَ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ, فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ, فَقُلْتُ: أَبِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ؟ فَقَالَ: أَمَّا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ.

واتە: لە (حنظلة)ی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە لە رافیعی کوڕی خەدیجی پرسیوە دەربارەی بەکرێدانی زەوی، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی لێ کردوە، وتم: بەزێڕ و زیویش؟ رافیع وتی: بە زێڕ و بە زیو هیچی تێدا نیە.

## باسی سەبارەت بە توندی لە بەکرێدانی زەوی بۆ چاندندا.

## ٣٢ - باب فِي التَّشْدِيدِ فِي ذَلِكَ.

٣٣٩٤ - (صحيح) عن سالم بن عبد الله بن عمر: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُكْرِي أَرْضَهُ حَتَّى بَلَغَهُ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ الأَنْصَارِيَّ حَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْهَى عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ, فَلَقِيَهُ عَبْدُ اللَّهِ, فَقَالَ: يَا ابْنَ خَدِيجٍ مَاذَا تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كِرَاءِ الأَرْضِ؟ قَالَ رَافِعٌ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: سَمِعْتُ عَمَّيَّ - وَكَانَا قَدْ شَهِدَا بَدْرًا - يُحَدِّثَانِ أَهْلَ الدَّارِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ الأَرْضَ تُكْرَى. ثُمَّ خَشِيَ عَبْدُ اللَّهِ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْدَثَ فِي ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يَكُنْ عَلِمَهُ, فَتَرَكَ كِرَاءَ الأَرْضِ.

واتە: لە سالمی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ زەویەکەی خۆی دەدا بە کرێ هەتا هەواڵی پێ گەیشت کە رافیعی کوڕی خەدیجی ئەنصاری باسی کردوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی، کاتێ (عَبْدُ اللَّه) گەیشت بە رافیع وتی: ئەی کوڕی خەدیج لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەربارەی بە کرێدانی زەوی چیت گێڕاوەتەوە؟ رافیع بە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەری وت: لە هەردوو مامەمم بیستوە — کە بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو — بۆ کەسوکاریان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی، (عَبْدُ اللَّه) وتی: سوێند بە (الله) خۆم دەزانم کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم زەویان دەدا بەکرێ، لەپاشدا (عَبْدُ اللَّه) دەترسا لەوەی کە پێغەمبەری

خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە شتێکی باس کردبێ و ئەو نەیزانیبێ و نەیبیستبێت، بۆیە وازی هێنا لە بەکرێدانی زەوی.

٣٣٩٥ - (صحيح) عن رافع بن خديج قال: كُنَّا نُخَابِرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ أَنَّ بَعْضَ عُمُومَتِهِ أَتَاهُ, فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعًا, وَطَوَاعِيَةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ أَنْفَعُ لَنَا وَأَنْفَعُ, قَالَ: قُلْنَا: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ فَلْيُزْرِعْهَا أَخَاهُ وَلاَ يُكَارِيهَا بِثُلُثٍ وَلاَ بِرُبُعٍ, وَلاَ بِطَعَامٍ مُسَمًّى).

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم کشتوکاڵمان لە زەوی و زاردا دەکرد تۆوەکە لەسەر کرێکار بوو ئەو کەسەی کە زەویەکەی بە کرێ دەگرت بەرهەمەکەش بە پێی ڕێکەوتن دابەش دەکرا، رافیع باسی ئەوەی کرد ڕۆژێ یەکێ لە مامەکانم هات و وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە کارێك کە بەسود بوو بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بە سود ترە بۆمان و چاکترەو سودی دونیاو قیامەتی هەیە بۆمان، رافیع وتی: وتمان: ئەوە چۆنە ئەو کارە چی یە کەسودی هەیە بۆتان؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس زەوی هەیە با بیچێنێ یان بیدات بە براکەی بیچێنێ، بە سێیەك و چواریەك بەکرێی نەدات، هەروەها بە خواردنی دیاریکراویش بەکرێی نەدات).

٣٣٩٦ - عن أيوب, قال: كَتَبَ إِلَيَّ يَعْلَى بْنُ حَكِيمٍ: أَنِّي سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ, بِمَعْنَى إِسْنَادِ عُبَيْدِ اللَّهِ وَحَدِيثِهِ.

واتە: لە ئەیوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: یەعلای کوڕی حەکیم بۆی نوسیم بەم شێوەیە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارم بیستوە، بە هەمان سەنەدی (عبید الله) و فەرمودەکەی.

٣٣٩٧ - (صحيح) (حسن ما بعده) عن رافع بن خديج, عن أبيه قال: جَاءَنَا أَبو رَافِعٍ مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَمْرٍ كَانَ يَرْفَقُ بِنَا, وَطَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِهِ أَرْفَقُ بِنَا, نَهَانَا أَنْ يَزْرَعَ أَحَدُنَا إِلاَّ أَرْضًا يَمْلِكُ رَقَبَتَهَا, أَوْ مَنِيحَةً يَمْنَحُهَا رَجُلٌ.

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو رافیع لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان و وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە کارێك کە بەسود بوو بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بەسود ترە بۆمان و چاکترە سودی دونیاو قیامەتی هەیە بۆمان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری لێ کردین لەوەی کە یەکێکمان زەوی و زاری بچێنێ مەگەر زەوی خۆی بێت، یان بەخشینێ بێ پیاوێ پێی بەخشیبێ.

٣٣٩٨ - (صحيح) عن مجاهد: أَنَّ أُسَيْدَ بْنَ ظُهَيْرٍ قَالَ جَاءَنَا رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ, فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ يَنْهَاكُمْ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَكُمْ نَافِعًا, وَطَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْفَعُ لَكُمْ, إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَاكُمْ عَنِ الْحَقْلِ وَقَالَ: (مَنِ اسْتَغْنَى عَنْ أَرْضِهِ فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ أَوْ لِيَدَعْ).

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێرنەوە، کە ئوسەیدی کوڕی (ظُهَیر) وتویەتی: رافیعی کوڕی خەدیج هات بۆ لامان وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە کارێك کە بەسودە بۆتان، بەڵام گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای گەورەو پێغەمبەری خوا بەسود ترە بۆتان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی و زار بۆ چاندن فەرمووی: (ئەوەی پێویستی بە زەویەکەی نیە با بیدات بە براکەی یان وازی لێ بهێنێت).

٣٣٩٩ - (صحيح الإسناد) عن أبو جعفر الخطمي قال: بَعَثَنِي عَمِّي أَنَا وَغُلاَمًا لَهُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ, قَالَ: فَقُلْنَا لَهُ: شَيْءٌ بَلَغَنَا عَنْكَ فِي الْمُزَارَعَةِ, قَالَ:

كَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَرَى بِهَا بَأْسًا, حَتَّى بَلَغَهُ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ حَدِيثٌ, فَأَتَ: فَأَخْبَرَهُ رَافِعٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى بَنِي حَارِثَةَ فَرَأَى زَرْعًا فِ أَرْضِ ظُهَيْرٍ, فَقَالَ: (مَا أَحْسَنَ زَرْعَ ظُهَيْرٍ). قَالُوا: لَيْسَ لِظُهَيْرٍ, قَالَ: (أَلَيْسَ أَرْضُ ظُهَيْرٍ؟). قَالُوا: بَلَى, وَلَكِنَّهُ زَرْعُ فُلاَنٍ, قَالَ: (فَخُذُوا زَرْعَكُمْ, وَرُدُّوا عَلَيْهِ النَّفَقَةَ قَالَ رَافِعٌ: فَأَخَذْنَا زَرْعَنَا, وَرَدَدْنَا إِلَيْهِ النَّفَقَةَ. قَالَ سَعِيدٌ: أَفْقِرْ أَخَاكَ أَوْ أَكْرِ بِالدَّرَاهِمِ.

واتە: لە ئەبو جەعفەری (الْخَطْمِيّ) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: مامم من غولامێکی خۆی نارد بۆلای سەعیدی کوڕی موسەییەب وتی: پێمان وت شتێکمان پێگەیشتوە لە تۆوە دەربارەی نەهی کردن لە زەوی بەکرێدان بە چاند سەعید وتی: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ پێی وابوو هیچی تێدا نیە هەتا فەرمودەیەکی پێ گەیشت لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، رافیع هەوالی دایە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلای (بَنِي حَارِثَةَ لە زەویەکەی (ظُهَير)دا کشتوکاڵی بینی، فەرمووی: (کشتوکاڵەکەی (ظُهَيْر چەندە چاکە). وتیان: وتیان: کشتوکاڵی (ظُهَير) نیە، فەرمووی: (ئایا نە زەوی یە زەوی (ظُهَير) نیە؟) وتیان: بەڵێ، بەڵام کشتوکاڵەکە هی فلانە کە فەرمووی: (کشتوکاڵەکە بۆ خۆتان و خەرجیەکەی بۆ بگێڕنەوە). رافیع وتی کشتوکاڵەکەمان هەڵگرتەوە بۆ خۆمان و خەرجیەکەیمان بۆ گێڕایەوە. سەعید وتی: سۆز و بەزییت هەبێ بەرامبەر بە براکەت و چاکەی لەگەڵ بکە یان کرێ زەویەکەتی بدەرێ بە درهەم.

٣٤٠٠ - (صحيح) عن رافع بن خديج قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ, وَقَالَ: (إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلاَثَةٌ رَجُلٌ لَهُ أَرْضٌ فَهُوَ يَزْرَعُهَا وَرَجُلٌ مُنِحَ أَرْضًا فَهُوَ يَزْرَعُ مَا مُنِحَ, وَرَجُلٌ اسْتَكْرَى أَرْضًا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ).

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی و

هەروەها لە فرۆشتنی بەری خوارماو بەرسیلەی تریّ بە دارەوە، فەرمووی: `تەنها سێ کەس کشتوکاڵ دەکەن: کەسێ خۆی زەوی هەبێ و بۆ خۆی دیچێنێ، کەسێ یەکێکی تر پارچەیە زەوی بداتێ و بۆ خۆی دایچێنێ، کەسێکی تر زەوی بە پارەو زێڕ و زیو بەکرێ بگرێ و بۆ خۆی دایچێنێ).

٣٤٠١ - (شاذ) قال أبو داود: عَنْ عُثْمَانُ بْنُ سَهْلِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ, قَالَ: إِنِّي يَتِيمٌ فِي حِجْرِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ وَحَجَجْتُ مَعَهُ, فَجَاءَهُ أَخِي عِمْرَانُ بْنُ سَهْلٍ, فَقَالَ: أَكْرَيْنَا أَرْضَنَا فُلَانَةَ بِمِائَتَيْ دِرْهَمٍ, فَقَالَ: دَعْهُ, فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: لە (عُثْمَان)ی کوڕی سەهلی کوڕی رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من هەتیوێ بووم لە کۆشی رافیعی کوڕی خەدیج دا واتە لەماڵی ئەواندا گەورە بووم، لەگەڵ ئەو حەجم کردوە، جارێ براکەم هات عیمرانی کوڕی سەهل بە رافیعی وت: زەوی فلانە کەسمان گرتوە بە کرێ بە دوو سەد درهەم، رافیع وتی: وازی لێ بێنە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی.

٣٤٠٢ - (ضعيف الإسناد) عن رافع بن خديج: أَنَّهُ زَرَعَ أَرْضًا فَمَرَّ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَسْقِيهَا, فَسَأَلَهُ: (لِمَنِ الزَّرْعُ وَلِمَنِ الأَرْضُ). فَقَالَ زَرْعِي بِبَذْرِي وَعَمَلِي لِيَ الشَّطْرُ وَلِبَنِي فُلَانٍ الشَّطْرُ. فَقَالَ: (أَرْبَيْتُمَا, فَرُدَّ الأَرْضَ عَلَى أَهْلِهَا وَخُذْ نَفَقَتَكَ).

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە لە زەویەکدا تۆوی دانەوێڵەی چاندوە لەکاتێکدا کە خەریکی ئاوەدانی بووە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داویەتی بەلایدا، لێی پرسیوە فەرموویەتی: (ئەم کشتوکاڵە هی کێیە؟ ئەم زەوی یە هی کێیە؟) وتی: کشتوکاڵی منە بە تۆوی خۆم و کاری خۆم، بەرهەکەش نیوەی بۆ منەو نیوەشی بۆ بەنی فلانە، فەرمووی: (ئایا ئێوە

هەستاون بە کاری سود (ربا) بە گرێبەستێکی نادروست، زەویەکە بگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی و هەقی تۆوەکەو خەرجی ئەرك و ماندوبوونی خۆتی لێ وەربگرە).

## باسی سەبارەت بە کشتوکاڵ کردن لەزەویەکدا بەبێ پرسی خاوەنەکەی.

## ٣٣ - باب فِي زَرْعِ الأَرْضِ بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهَا.

٣٤٠٣ - (صحيح) عن رافع بن خديج, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ, فَلَيْسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ وَلَهُ نَفَقَتُهُ).

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ کشتوکاڵ بکات لەزەوی و زاری قەومێکدا بەبێ پرسی ئەو قەومە هیچ شتێکی لەو کشتوکاڵە بۆ نیە. بەس خەرجیەکەی نەبێ واتە خەرجیەکەی بۆ دەگەڕێنرێتەوە).

## باسی سەبارەت بە کشتوکاڵ کردن لەزەویەکدا تۆوەکە لەسەر کرێکار بێت.

## ٣٤ - باب فِي الْمُخَابَرَةِ

٣٤٠٤ - (صحيح) عن حماد, وسعيد بن ميناء, عن جابر بن عبد الله, قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ, وَالْمُزَابَنَةِ, وَالْمُخَابَرَةِ, وَالْمُعَاوَمَةِ. قَالَ عَنْ حَمَّادٍ: وَقَالَ أَحَدُهُمَا: وَالْمُعَاوَمَةِ, وَقَالَ الآخَرُ: بَيْعِ السِّنِينَ, ثُمَّ اتَّفَقُوا, وَعَنِ الثُّنْيَا, وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا.

ـتە: حەمماد و سەعیدی كوڕی میناء، وتیان، جابری كوڕی (عبد الله)
ـتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی شینایی
ـە نەدووراوەیی و لە فرۆشتنی بەری خورماو بەرسیلەی ترێ بە دارەوە، لە
كشتوكاڵ كردن لەزەویەكدا تۆوەكە لەسەر كرێكار بێت، هەروەها لە فرۆشتنی
بەری درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ، وتی لە حەممادەوە، یەكێ لە راویەكان وتی:
لە فرۆشتنی بەری درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ، ئەوی تریان وتی: فرۆشتنی
ـلانە، لەپاشدا هەردوكیان رێكن، وە نەهی كردوە لە (استثناء) - بۆ نمونە یەكێ
بڵێ: ئەم پەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت هەندێكی نەبێ -، وە رێگەی عەرایای داوە.

٣٤٠٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله، قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ وَعَنِ الثُّنْيَا إِلاَّ أَنْ يُعْلَمَ.

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله) دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا
صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەری خورماو بەرسیلەی
ترێ بە دارەوە، لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی و لە (استثناء) ئەوەی
جیادەكرێتەوە مەگەر شتێكی زانراو و دیاریكراو بێت - بۆ نمونە یەكێ بڵێ:
ئەم پەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت چارەكێكی نەبێ - واتە (استثناء)ەكە شتێكی
نەزانراو نەبێت.

٣٤٠٦ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله، قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنْ لَمْ يَذَرِ الْمُخَابَرَةَ، فَلْيَأْذَنْ بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ).

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله) دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری
خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەو كەسەی لە (مُخَابَرَة) دورنەكەوێتەوە
با جەنگ رابگەیەنێت بەرامبەر بە خواو پێغەمبەرەكەی).
- (مُخَابَرَة) بریتیە لە مامەڵە لەسەر زەویە بە هەندێ لەو كشتوكاڵەی كە
بەرهەمی دەهێنێت - .

٣٤٠٧ - (صحيح) عن زيد بن ثابت قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُخَابَرَةِ, قُلْتُ: وَمَا الْمُخَابَرَةُ؟ قَالَ: أَنْ تَأْخُذَ الأَرْضَ بِنِصْفٍ أَوْ ثُلُثٍ أَوْ رُبُعٍ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە (مُخَابَرَة)، وتم: (مُخَابَرَة) چی یە؟ وتی: زەوی بگریت بۆ وەبەرهێنانی بەروبووم بە نیوەیی یان بە سێ یەك یا بە چوار یەك.

## باسی سەبارەت بە باخەوانی.

## ٣٥ - باب فِي الْمُسَاقَاةِ.

٣٤٠٨ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا ڕێکەوت لەسەر نیوەی درامەتی بەروبووم و دانەوێڵە.

٣٤٠٩ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَفَعَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ نَخْلَ خَيْبَرَ وَأَرْضَهَا عَلَى أَنْ يَعْتَمِلُوهَا مِنْ أَمْوَالِهِمْ, وَأَنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَطْرَ ثَمَرَتِهَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زەوی و دارخورماکانی خەیبەری دا بە جولەکەکانی خەیبەر کە زەویەکەی ئاوەدان بکەنەوە بە کەرەستەی خۆیان وە باخە خورماکانی ئاوبدەن بەمەرجێ نیوەی بەروبوومەکەی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێت.

٣٤١٠ - (حسن صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: افْتَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ, وَاشْتَرَطَ أَنَّ لَهُ الأَرْضَ وَكُلَّ صَفْرَاءَ وَبَيْضَاءَ, قَالَ أَهْلُ خَيْبَرَ: نَحْنُ أَعْلَمُ بِالأَرْضِ مِنْكُمْ, فَأَعْطِنَاهَا عَلَى أَنَّ لَكُمْ نِصْفَ الثَّمَرَةِ, وَلَنَا نِصْفٌ. فَزَعَمَ أَنَّهُ أَعْطَاهُمْ عَلَى ذَلِكَ. فَلَمَّا كَانَ حِينَ يُصْرَمُ النَّخْلُ بَعَثَ إِلَيْهِمْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَحَزَرَ عَلَيْهِمُ النَّخْلَ, وَهُوَ الَّذِي يُسَمِّيهِ أَهْلُ الْمَدِينَةِ الْخَرْصَ, فَقَالَ: فِي ذِهْ كَذَا وَكَذَا, قَالُوا: أَكْثَرْتَ عَلَيْنَا يَا ابْنَ رَوَاحَةَ! فَقَالَ: فَأَنَا أَلِي حَزْرَ النَّخْلِ وَأُعْطِيكُمْ نِصْفَ الَّذِي قُلْتُ, قَالُوا: هَذَا الْحَقُّ وَبِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ قَدْ رَضِينَا أَنْ نَأْخُذَهُ بِالَّذِي قُلْتَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خەیبەری رزگارکرد مەرجی دانا کە زەویەکان و چی زێڕو زیویان هەیە بۆ خۆی و موسوڵمانان بێت، خەڵکی خەیبەر وتیان: ئێمە شارەزاترین لەئێوە بۆ باخەوانی و کشتوکاڵ کردن لەم زەویانەدا، بۆیە بیاندەنەوە بە خۆمان نیوەی بەرهەمەکەی بۆ ئێمەو، نیوەکەی تریشی بۆ ئێوە، ئیبنو عەباس پێی وابوو ئەوەی کە بەرهەم دەهێنرێت نیوەی دەدەن بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کاتێ کە کاتی پێگەیشتنی بەروبووم و بڕینی بەری دارخورماکان نزیك بوویەوە (عبد الله)ی کوڕی رەواحەی نارد بۆ لایان کە تەخمینی دارخوماکانیان بۆ بکات پێش ئەوەی لێی بکەنەوەو لێی بخۆن، خەڵکی مەدینە پێی دەڵێن: تەخمین(خرص)، (عبد الله)ی کوڕی رەواحە وتی: لەم دارخورمانەدا ئەوەندەو ئەوەندە مەن(صاع) خورما، جولەکەکان وتیان ئەوە زۆری دەکەی لەسەرمان ئەی (عبد الله)ی کوڕی رەواحە! وتی: من ئەم دارخورمانە بەوەندە تەخمین دەکەم نیوەی ئەوەی کە دەیڵێم بۆ ئێوە، جولەکەکان وتیان: ئەوەی کە دەیڵێی هەق و راستیە بەو هەقەش ئاسمانەکان و زەوی راوەستاون، یان سوێند بەو (الله)یەی کە ئاسمانەکان و زەوی راوەستاندوە رازین ئەوەندە خورما وەرگرین بەو تەخمینەی کە تۆ وتت.

٣٤١١ - (صحيح الإسناد)عن جعفر بن برقان, بإسناده ومعناه, قال: فَحَرَزَ وَقَالَ عِنْدَ قَوْلِهِ وَكُلَّ صَفْرَاءَ وَبَيْضَاءَ يَعْنِي الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ لَهُ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی بوورقانەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەدو مە هاتوە، لە جیاتی (فَحَرَزَ) وتی: (فَحَرَزَ) بەبێ وشەی (النخل)یش، کاتێ کە گەیشتە سەر وتەی (وَكُلَّ صَفْرَاءَ وَبَيْضَاء) وتی: واتە: هەموو زێڕ و زیوەکەی بۆ خۆی و موسوڵمانان.

٣٤١٢ - (صحيح الإسناد) عن مقسم: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ ,فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ زَيْدٍ, قَالَ: فَحَزَرَ النَّخْلَ, وَقَالَ: فَأَنَا أَلِي جُذَاذَ النَّخْلِ وَأُعْطِيكُمْ نِصْفَ الَّذِي قُلْتُ.

واتە: لە میقسەمەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەیبەری رزگارکرد، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی زەید واتە فەرموودەی پێشو، وتی: دارخورماکانی تەخمین کرد، وتی: من ئەو دارخورمانە بەوەندە تەخمین دەکەم و بۆشکە خورماکان دەبڕم نیوەی ئەوەی کە دەیڵێم دەیدەم بە ئێوە.

## باسی سەبارەت بە تەخمین کردنی بەروبووم.

## ٣٦ - باب فِي الْخَرْصِ.

٣٤١٣ - عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْعَثُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَيَخْرُصُ النَّخْلَ حِينَ يَطِيبُ قَبْلَ أَنْ يُؤْكَلَ مِنْهُ, ثُمَّ يُخَيِّرُ يَهُودَ يَأْخُذُونَهُ بِذَلِكَ الْخَرْصِ, أَوْ يَدْفَعُونَهُ إِلَيْهِمْ بِذَلِكَ الْخَرْصِ, لِكَيْ تُحْصَى الزَّكَاةُ قَبْلَ أَنْ تُؤْكَلَ الثِّمَارُ وَتُفَرَّقَ.

[وا]تە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا [صلـ]ـی الله علیه وسلم (عبد الله)ی كوڕی رەواحەی نارد بۆ لایان كە تەخمینی [دا]رخوماكانیان بۆ بكات كاتێ كە خورماكەیان بۆ خواردن دەستی داو خۆش بوو، [پێـ]ـش ئەوەی جولەكەكان لێی بخۆن، لەپاشدا جولەكەكانی سەرپشك كرد ئەگەر [د]ەتانەوێ هەمووی بۆ ئێمەو نیوەی تەخمینەكە دەدەین بە ئێوە، ئەگەر دەتانەوێ هەمووی بۆ ئێوەو نیوەی تەخمینەكە بدەن بە ئێمە، بۆئەوەی زەكاتەكەی بژمێرن [بزا]نین زەكاتەكەی چەندە پێش ئەوەی بەروبوومەكەی بخۆن و پەرش و بڵاوبێتەوە.

٣٤١٤ - (صحيح ما بعده) عن جابر قال: لَما أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ خَيْبَرَ, فَأَقَرَّهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا كَانُوا, وَجَعَلَهَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ, فَبَعَثَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَخَرَصَهَا عَلَيْهِمْ.

[وا]تە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە خوای پەروەردگار خەیبەری [كر]دە دەستكەوتی جەنگی بەبێ جەنگ كردن(الفيء) بۆ پێغەمبەرەكەی صلی [ا]لله علیه وسلم، پێغەمبەرەكەی خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەی جێگیر كرد كە بەروبوومی زەوی زار و دارخورماكانی خەیبەر نیوەی بۆ خۆی و موسوڵمانان [ب]ێت و، نیوەشی بۆ جولەكەكان بێت، (عبد الله)ی كوڕی رەواحەی نارد بۆ لایان [ب]ۆئەوەی تەخمینی دارخوماكانیان بۆ بكات.

٣٤١٥ - (صحيح الإسناد) عن جابر بن عبد الله قال: خَرَصَهَا ابْنُ رَوَاحَةَ أَرْبَعِينَ أَلْفَ وَسْقٍ, وَزَعَمَ أَنَّ الْيَهُودَ لَمَّا خَيَّرَهُمُ ابْنُ رَوَاحَةَ أَخَذُوا الثَّمَرَ وَعَلَيْهِمْ عِشْرُونَ أَلْفَ وَسْقٍ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كوڕی رەواحە خورماكانی خەیبەری تەخمین كرد بە چل هەزار ویسق، جابر پێی وابوو كاتێ كە كوڕی رەواحە جولەكەكانی سەرپشك كرد هەموو بەروبوومەكەیان وەرگرت و بیست هەزار ویسقیان لەسەر بوو كە بیدەن بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و موسوڵمانان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پەرتوکی بەکرێدان.

# ١٨ - كتاب الإجارة

## باسی سەبارەت بە بە کرێ و داهاتی مامۆستای قورئان فێرکردن.

## ٣٧- باب فِي كَسْبِ الْمُعَلِّمِ.

٣٤١٦ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت قال: عَلَّمْتُ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ الْكِتَابَ وَالْقُرْآنَ, فَأَهْدَى إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْهُمْ قَوْسًا, فَقُلْتُ: لَيْسَتْ بِمَالٍ وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟! لآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلأَسْأَلَنَّهُ, فَأَتَيْتُهُ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, رَجُلٌ أَهْدَى إِلَيَّ قَوْسًا مِمَّنْ كُنْتُ أُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْقُرْآنَ, وَلَيْسَتْ بِمَالٍ وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ تعالى؟!. قَالَ: (إِنْ كُنْتَ تُحِبُّ أَنْ تُطَوَّقَ طَوْقًا مِنْ نَارٍ فَاقْبَلْهَا).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چەند کەسێکم لە ئەهلی صوفە فێری خوێندەواری و قورئان خوێندن دەکرد، یەکێکیان کەوانێکی بەدیاری بۆ هێنام، منیش وتم: ئەمە ماڵ و سامان وەرگرتن نیە بۆ تیر هاوێشتن لە جیهاد لەڕێی خوادا بەکاری دەهێنم، کاتێك پێغەمبەری خوا هات پرسیاری لێدەکەم لەو بارەوە، پێغەمبەری خوا هات و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکێك لەوانەی کە فێری خوێندەواری و قورئان خوێندنیان دەکەم کەوانێکی بەدیاری بۆ هێنام، منیش وەرم گرت وتم: خۆ ئەمە ماڵ و سامان وەرگرتن نیە بۆ تیر هاوێشتن لە جیهاد لەڕێی خوادا

ـەکاری دەهێنم!! ئەویش فەرمووی: (ئەگەر حەزدەکەی لە قیامەتدا ببێتە تەوقی ئاگرین و بکرێتە ملتەوە ئەوە وەریگرە).

٣٤١١ - (صحيح) عن عبادة بن الصامت, نَحْوَ هَذَا الْخَبَرِ, وَالأَوَّلُ أَتَمُّ, فَقُلْتُ: مَا تَرَى فِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: (جَمْرَةٌ بَيْنَ كَتِفَيْكَ تَقَلَّدْتَهَا). أَوْ (تَعَلَّقْتَهَا).

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە وەك ئەو بەسەرهاتە هاتوە، بەڵام فەرمودەی یەکەم واتە پێشو تەواوترە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تۆ پێت چۆنە؟ فەرمووی: (لەنێوان شانەکانتدا پشکۆیەکی ئاگرت کردۆتە گەردن)، یان (لەنێوان شانەکانتدا پشکۆیەکی ئاگرت هەڵواسیوە).

## باسی سەبارەت بە کرێ و داهاتی پزیشکەکان.

## ٣٨ - باب فِي كَسْبِ الأَطِبَّاءِ.

٣٤١٨ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري: أَنَّ رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْطَلَقُوا فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا فَنَزَلُوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبوا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ - قَالَ - فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ فَشَفَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا بِكُمْ لَعَلَّ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ يَنْفَعُ صَاحِبَكُمْ فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ فَشَفَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ فَلاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ شَيْءٌ يَشْفِي صَاحِبَنَا يَعْنِي رُقْيَةً . فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ إِنِّي لأَرْقِي وَلَكِنِ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَأَبَيْتُمْ أَنْ تُضَيِّفُونَا مَا أَنَا بِرَاقٍ حَتَّى تَجْعَلُوا لِي جُعْلاً. فَجَعَلُوا لَهُ قَطِيعًا مِنَ الشَّاءِ فَأَتَاهُ فَقَرَأَ عَلَيْهِ بِأُمِّ الْكِتَابِ وَيَتْفُلُ حَتَّى بَرِئَ كَأَنَّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَأَوْفَاهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُ عَلَيْهِ. فَقَالُوا اقْتَسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى لاَ تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَسْتَأْمِرَهُ. فَغَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرُوا

لَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مِنْ أَيْنَ عَلِمْتُمْ أَنَّهَا رُقْيَةٌ أَحْسَنْتُمْ وَاضْرِبوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، لە سەفەرێكدا هەندێك لە هاوەڵان كاتێك برسیان بوو لای هۆزێك لایاندا بەڵام هۆزەكە میوانداریيان نەكردن. دووپشكێك دای بەگەورەكەيانەوە، هەموو هەوڵێكياندا بۆ ئەوەی ئازاری نەمێنێ و چاك بێتەوە بەڵام سوودی نەبوو، بۆیە هەندێكيان وتيان بنێرن بۆلای ئەو كۆمەڵە بزانن یەكێكی خوێنەواریان تێدا نییە شتێكی پێدا بخوێنێ بەڵكو شیفای بۆ بێت و چاك بێتەوە، هاتن بۆ لایان و هەواڵەكەيان دانێ، ئەوانیش وتیان: بەڵێ شتێكی بەسەرا دەخوێنین بە مەرجێك مەڕێكمان بدەنێ بۆ خۆمان لە جیاتیدا. یەكێ لە هاوەڵان چوو سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند،كە تا ئەو كاتەش ئازارێكی زۆر زۆری هەبوو، هەر وەك وشترێكی بەسراوە بەرەڵای بكەی ئاوا رزگاری بوو ئازاری نەماو چاك بوویەوە، مەڕەكەيان دانێ، هاوەڵان لە نێوان خۆياندا وتیان: بڵێی حەرام نەبێت، گۆشتەكەی ناخۆين تا پرسيار لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەكەین، كاتێك گەشتنەوە مەدینە هەواڵەكەیان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چۆنتان زانی ئەوە بۆ دوعاو نوشتە دەبێت؟ بەراستی پێكاتان بچن سەهمێك لەو گۆشتە بۆ منیش بهێنن).

٣٤١٩ - عن أبو سعيد الخدري: عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە، لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە.

٣٤٢٠ - (صحيح) عن خارجة بن الصلت, عن عمه, أَنَّهُ مَرَّ بِقَوْمٍ فَأَتَوْهُ فَقَالُوا: إِنَّكَ جِئْتَ مِنْ عِنْدِ هَذَا الرَّجُلِ بِخَيْرٍ, فَارْقِ لَنَا هَذَا الرَّجُلَ, فَأَتَوْهُ بِرَجُلٍ مَعْتُوهٍ فِي الْقُيُودِ, فَرَقَاهُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً,كُلَّمَا خَتَمَهَا جَمَعَ بُزَاقَهُ ثُمَّ تَفَلَ فَكَأَنَّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ, فَأَعْطُوهُ شَيْئًا, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

فَذَكَرَهُ لَهُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كُلْ فَلَعَمْرِي لَمَنْ أَكَلَ بِرُقْيَةٍ بَاطِلٍ لَقَدْ أَكَلْتَ بِرُقْيَةٍ حَقٍّ).

واتە: لە خاریجەی کوڕی (الصَّلْت)ەوە لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە داویەتی بەلای کۆمەڵێکدا هاتن بۆلای وتیان: تۆ لەلای ئەو پیاوەوە هاتوی بە خێر واتە بە قورئان و یادی خواوە، دوعاو نوشتەیە بکە بۆ ئەم پیاوە، پیاوێکی شێتیان بۆ هێنا بە کۆت و زنجیر کراوی، سێ ڕۆژ لەسەر یەك بەیانیان و ئێواران سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند، هەرکاتێ کە لێ دەبووەوە تفەکانی ناو دەمی کۆدەکردەوە لەپاشدا لێی دەدا وەك ئەوەی بەرەڵای بکەی ئاوای لێ دەهات، لەسەر ئەو کارەی شتێکیان دایە، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیخۆ، کەسی وا هەیە بە دوعاو نوشتەی پوچ و بەتاڵ ماڵ و سامان پەیدا دەکات و دەیخوات، بەڵام تۆ بە دوعاو نوشتەی هەق دەیخۆی).

## باسی سەبارەت بە داهاتی کەڵەشاخ.

## ٣٩ - باب فِي كَسْبِ الْحَجَّامِ.

٣٤٢١ - (صحيح) عن رافع بن خديج: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (كَسْبُ الْحَجَّامِ خَبِيثٌ, وَثَمَنُ الْكَلْبِ خَبِيثٌ, وَمَهْرُ الْبَغِيِّ خَبِيثٌ).

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کرێی کەڵەشاخ پیسە، نرخ و بەهای سەگ پیسە، کرێ و بەهای زینای ئافرەت پیس و حەرامە).

٣٤٢٢ - (صحيح) عن ابن محيصة, عن أبيه: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إِجَارَةِ الْحَجَّامِ, فَنَهَاهُ عَنْهَا, فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ وَيَسْتَأْذِنُهُ حَتَّى أَمَرَهُ: أَنِ اعْلِفْهُ نَاضِحَكَ وَرَقِيقَكَ.

واتە: لە ئیبنو موحەییصەوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە داوای كردوە نە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەی بدات كەڵەشاخ بكات بۆ خەڵك بە كرێ، بەڵام ئەو نەهی لێ كرد، بەردەوام ئەوەندەی وتەوە هەتا فەرمانی پێ كرد: كرێكەی بدات بە ئاڵف بۆ وشترەكەی و خواردن بۆ بەندەكەی.

٣٤٢٣ - (صحيح) عن ابن عباس قال: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ، وَلَوْ عَلِمَهُ خَبِيثًا لَمْ يُعْطِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كەڵەشاخی گرت و كرێكەی دا بە كەڵەشاخ گرەكە. بێگومان ئەگەر كرێی كەڵەشاخ حەرام بووایە كرێكەی نەدەدایە.

٣٤٢٤ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: حَجَمَ أَبو طَيْبَةَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، وَأَمَرَ أَهْلَهُ أَنْ يُخَفِّفُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: (أبو طَيْبَةَ) كەڵەشاخی گرت بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانی كرد لەجیاتی كرێكەی مەن(صاع)ێ خورمای بدەنێ، هەروەها فەرمانی كرد بە گەورەكانی ئەو باجەی كە لەسەری دایان ناوە سوكی بكەن - بێگومان (أبو طَيْبَةَ) كەسێكی كۆیلە بووە - .

## باسی سەبارەت بە كرێ و داهاتی كەنیزەكەكان.

### ٤٠ - باب فِي كَسْبِ الإِمَاءِ.

٣٤٢٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَسْبِ الإِمَاءِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە داهات و کرێی زینای کەنیزەکەکان.

٣٤٢٦ - (حسن) عن طارق بن عبد الرحمن القرشي قال: جَاءَ رَافِعُ بْنُ رِفَاعَةَ إِلَى مَجْلِسِ الأَنْصَارِ فَقَالَ: لَقَدْ نَهَانَا نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْيَوْمَ, فَذَكَرَ أَشْيَاءَ, وَنَهَانَا عَنْ كَسْبِ الأَمَةِ إِلاَّ مَا عَمِلَتْ بِيَدِهَا, وَقَالَ هَكَذَا بِأَصَابِعِهِ نَحْوَ الْخَبْزِ وَالْغَزْلِ وَالنَّفْشِ.

واتە: لە (طارق)ی کوڕی (عبد الرحمن)ی قورەشییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: رافیعی کوڕی ریفاعە هات بۆ کۆڕی ئەنصار وتی: بەڕاستی ئەمرۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری هەندێ شتی لێ کردین، جا باسی هەندێ شتی کرد، رێگری لێ کردین لەوەرگرتنی داهات و کرێی زینای کەنیزەکەکان، مەگەر کرێی دەست رەنگینیان ئەوەی کە بە هێزی دەست و بازووی خۆیان پەیدای دەکەن، بەم شێوەیە بە دەستی ئاماژەی کردو وتی: وەك نان کردن و چنین و رستن و شیکردنەوەی خوری بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ رِستن.

٣٤٢٧ - (حسن بما قبله) عن رافع بن خديج قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَسْبِ الأَمَةِ, حَتَّى يُعْلَمَ مِنْ أَيْنَ هُوَ.

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە کرێ و داهاتی کەنیزەك، هەتا نەزانرێ لە کوێ پەیدای کردوە.

## باسی سەبارەت بە داهات و سەرقەڵەمانەی کوڵەنانی فاڵ گرتنەوە.

## ٤١- باب فِي حُلْوَانِ الْكَاهِنِ.

٣٤٢٨ - (صحيح) عن أبو مسعود, عن النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم: أَنَّهُ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ.

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە. کە نەهی کردوە لە کرێ و نرخ و بەهای سەگ و، زینای ئافرەت و، کوڵەنانی فاڵ گرتنەوە.

## باسی سەبارەت بە کرێی تۆوی کەڵگرتن.

## ٤٢ - باب فِي عَسْبِ الْفَحْلِ.

٣٤٢٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردوە لە کرێ و داهاتی تۆوی نێرەی ئاژەڵەکانی وەك ئەسپ و وشتر و کەڵەگا و نێرەکەر لەکاتێکدا کە دەیانپەڕێنن لە مێیەکان بە مەبەستی کەڵگرتن.

## باسی سەبارەت بە پیشەی زەرنگەری.

## ٤٣ - باب فِي الصَّائِغِ.

٣٤٣٠ - (ضعيف) عن أبو ماجدة قال: قَطَعْتُ مِنْ أُذُنِ غُلاَمٍ, أَوْ قُطِعَ مِنْ أُذُنِي, فَقَدِمَ عَلَيْنَا أبو بَكْرٍ حَاجًّا, فَاجْتَمَعْنَا إِلَيْهِ, فَرَفَعَنَا إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ, فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ هَذَا قَدْ بَلَغَ الْقِصَاصَ, ادْعُوا لِي حَجَّامًا لِيَقْتَصَّ مِنْهُ, فَلَمَّا دُعِيَ الْحَجَّامُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنِّي وَهَبْتُ لِخَالَتِي غُلاَمًا, وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يُبَارَكَ لَهَا فِيهِ, فَقُلْتُ لَهَا لاَ تُسَلِّمِيهِ حَجَّامًا وَلاَ صَائِغًا وَلاَ قَصَّابًا).

واتە: لە ئەبو ماجیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بەشێ لەگوێی غولامێکم بری، یان بەشێ لەگوێی برپم، لەوکاتەدا پێشەوا ئەبو بەکر هاتبوو بۆ حەج، ئەگەڵی کۆبووینەوە سکاڵامان کرد لەلای و دەربارەی ئەو روداوە قسەمان کرد، ئەویش کێشەو سکاڵاکەی بەرزکردەوە بۆ لای پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ بۆ ئەوەی حوکم بکات لە نێوانیاندا، ئێمەش چوین بۆلای پێشەوا عومەر وتی: ئەمە گەیشتۆتە حەددی تۆڵە شایستەی ئەوەیە تۆڵەی لێ بکرێتەوە گوێی ببڕدرێت وەك چۆن گوێی ئەوی بڕیوە، کەڵەشاخ گرێکم بۆ بانگ بکەن بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە، کاتێ کە کەڵەشاخ گرەکەیان هێنا، پێشەوا عومەر وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (من غولامێکم بە دیاری پێشکەش کرد بە پورم، ئاواتەخوازبووم ببێتە مایەی بەرەکەت و پیرۆزی بۆی، بە پورمم فەرموو: تەسلیمی ئەو کەسانەی نەکەی کە ئەمە پیشەیانە: کەڵەشاخ گر، گۆشت فرۆش، (ئاڵتونچی) ئەوکەسەی کە پیشەی زەرنگەری یە).

٣٤٣١ - (ضعيف) عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم, يقول بمعناه.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە. کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

٣٤٣٢ - (ضعيف) عن عمر بن الخطاب, عن النبي صلى الله عليه و سلم, مثله.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

## باسی سەبارەت بە بەندەیە بفرۆشرێت

## ماڵ و سامانی هەبێ.

## ٤٤- باب فِي الْعَبْدِ يُبَاعُ وَلَهُ مَالٌ.

٣٤٣٣ - (صحيح) عن سالم عن أبيه: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ بَاعَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ فَمَالُهُ لِلْبَائِعِ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ الْمُبْتَاعُ, وَمَنْ بَاعَ نَخْلاً مُؤَبَّرًا فَالثَّمَرَةُ لِلْبَائِعِ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ).

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەندەیە بفرۆشێت بەندەکە ماڵ و سامانی هەبێت ئەوە ماڵ و سامانەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیار بە مەرجی دانابێ، هەرکەسێ باخە خورمایە بکڕێت تۆوی نێرەکەی لە مێکەی درابێ بەروبوومەکەی بۆ فرۆشیارە مەگەر کڕیار بە مەرجی دانابێ).

٣٤٣٤ - عن ابن عمر, عن النبي صلى الله عليه و سلم. بقصة النخل. قال أبو داود, واختلف الزهري ونافع في أربعة أحاديث, هذا أحدها.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە خوا صلی
الله علیه وسلم، بەسەرهاتی باخە دارخورماكە هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا
زوهری و نافیع لە چوار فەرموودەدا جیاوازییان هەیە ئەمە یەكێكیانە.

٣٤٣٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه
وسلم: (مَنْ بَاعَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ فَمَالُهُ لِلْبَائِعِ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ).

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا
صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ بەندەیە بفرۆشێت بەندەكە ماڵ
و سامانی هەبێت ئەوە ماڵ و سامانەكەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر كڕیار بە
مەرجی دانابێ).

## باسی سەبارەت بەچون بەرەوپیری ئەوكەسانەی كە كاڵاو كەل و پەلی بازرگانی دێنن بۆ بازاڕ بۆ فرۆشتن.

## ٤٥ - باب فِي التَّلَقِّي.

٣٤٣٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم
قال: (لاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ, وَلاَ تَلَقَّوُا السِّلَعَ حَتَّى يُهْبَطَ بِهَا الأَسْوَاقَ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە
پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەوداو مامەڵە مەكەن
بەسەر سەوداو مامەڵەی یەكتردا، هەروەها بەرەوپیری ئەو كەسانە مەچن كە
كاڵاو كەل و پەلی بازرگانی دێنن بۆ بازاڕ بۆ فرۆشتن هەتا دەیهێننە بازاڕ و
بارەكەیان دادەگرن لە مەیدان).
- ئەمەش لەبەرئەوەیە كە خاوەن كاڵاكان نرخی بازاڕ بزانن و نەخەڵەتێنرێن
لەلایەن بازرگانەكانەوە وە خەڵكی تریش لێیان بكڕێت - .

٣٤٣٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ تَلَقِّي الْجَلَبِ, فَإِنْ تَلَقَّاهُ مُتَلَقٍّ مُشْتَرٍ فَاشْتَرَاهُ فَصَاحِبُ السِّلْعَةِ بِالْخِيَارِ إِذَا وَرَدَتِ السُّوقَ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: قَالَ سُفْيَانُ: لاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ: أَنْ يَقُولَ: إِنَّ عِنْدِي خَيْرًا مِنْهُ بِعَشَرَةٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە چون بەرەوپیری ئەو کەسانەی کە کاڵاو کەل و پەلی بازرگانی دێنن بۆ بازاڕ بۆ فرۆشتن، هەرکەس چو بەرەوپریان و شتێکی لێ کڕین ئەگەر هاتنە ناو بازاڕ ئارەزووی خۆیانە سەوداو مامەڵەکە پەسەند دەکەن یان پەشیمان دەبنەوە خۆیان سەرپشکن. ئەبو داود دەڵێت: سوفیان وتی: سەوداو مامەڵە مەکەن بەسەر سەوداو مامەڵەی یەکتردا: وەك ئەوەی بڵێن: من لەوە چاکترم هەیە بە دە دینار یان دە درهەم واتە نرخەکە زیادو کەم بکات بە پێی بەرژەوەندی خۆی.

## باسی سەبارەت بە نەهی کردن لە زیادکردن لەسەر شت بێ ئەوەی مەبەستی کڕین بێت، تەنها بۆ فێڵ کردن بێت.

## ٤٦ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ النَّجْشِ.

٣٤٣٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَنَاجَشُوا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زەمی درۆ مەکەن بۆ تەفرەدانی کڕیار واتە نرخ لەسەر شت زیاد مەکەن بۆ فێڵ کردن لە کڕیارو خەڵەتاندنی لەکاتێکدا کە خۆشتان نەیکڕن بەو نرخە).

# باسی سەبارەت بە نەهی کردن لەوەی شاری شت بفرۆشێ بۆ لادێیی.

## ٤٧- باب فِي النَّهْيِ أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ.

٣٤٣٩ - (صحيح) عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ. فَقُلْتُ: مَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لاَ يَكُونُ لَهُ سِمْسَارًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی شاری شت بفرۆشێ بۆ لادێیی. وتم: شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ یانی چی؟ وتی: نەبێتە چاوساغ و دەڵاڵی.

٣٤٤٠ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (لاَ يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ, وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ أَوْ أَبَاهُ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ، با براو باوکی خۆشی بێت).

(صحيح) قال أبوو داود: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ يُقَالُ لاَ يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ. وَهِيَ كَلِمَةٌ جَامِعَةٌ لاَ يَبِيعُ لَهُ شَيْئًا وَلاَ يَبْتَاعُ لَهُ شَيْئًا.

ئەبوو داود دەڵێت: هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتراوە: با شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ. ئەمەش وتەیەکی (جامعه) با شاری هیچ شتێ بۆ لادێیی نەفرۆشێ و نەبێتە دەڵاڵی، هیچیشی بۆ نەکڕێت.

٣٤٤١ - (ضعيف الإسناد) عن سالم المكي: أَنَّ أَعْرَابِيًّا حَدَّثَهُ أَنَّهُ قَدِمَ بِحَلُوبَةٍ لَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَ عَلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ, فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ, وَلَكِنِ اذْهَبْ إِلَى السُّوقِ فَانْظُرْ مَنْ يُبَايِعُكَ, فَشَاوِرْنِي حَتَّى آمُرَكَ أَوْ أَنْهَاكَ.

واتە: لە سالمی مەککییەوە دەگێڕنەوە، پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی بۆی باسکردوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی اللە علیە وسلم وشترە شیردەرەکانی هێناوە بۆ شار بۆ فرۆشتن، جا لەلای (طلحە)ی کوڕی (عبید اللە) دابەزیوە واتە بووە بە میوانی ئەو، (طلحە) وتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم نەهی کردوە لەوەی شاری شت بفرۆشێ بۆ لادێیی، بەڵام برۆ بۆ بازاڕ با نرخی شتەکانت بزانیت سەیر بکە بزانە کێ شتەکانت لێ دەکڕێت و موشتەری یە، ئەو کاتە پرس و رام پێ بکە هەتا فەرمانت پێ بکەم و رێگریشت لێ بکەم واتە ئەگەر لە قازانجت بوو ئەوا دەڵێم بیفرۆشە، ئەگەر زەرەیشت بوو ئەوا دەڵێم مەیفرۆشە.

٣٤٤٢ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ, وَذَرُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (با شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ، واز بێنن لەو خەڵکە با خوای پەروەردگار رۆزی هەندکیان بدات بە هۆی هەندێکی تریانەوە خۆیان بۆ خۆیان سەوداو مامەڵە بکەن و شتەکانیان بفرۆشن).

## باسی کەسێ ئاژەڵێکی کڕی شیریان لەگوانەکانیدا ڕاگرتبوو ئەگەر ناڕازی بوو ئەوە بۆی هەیە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

## ٤٨ - باب مَنِ اشْتَرَى مُصَرَّاةً فكَرِهَهَا.

٣٤٤٣ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَلَقَّوُا الرُّكْبَانَ لِلْبَيْعِ, وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ, وَلاَ تُصَرُّوا الإِبِلَ وَالْغَنَمَ, فَمَنِ ابْتَاعَهَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلِبَهَا: فَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا, وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەچنە دەرەوەی شار بەدەم کاروانەوە بۆ شت لێ کڕینیان با بێنە بازاڕ و نرخی شتەکانی خۆیان بزانن، هەندێکتان سەوداو مامەڵە مەکەن بەسەر سەوداو مامەڵە هەندێکتاندا، لەکاتی فرۆشتنی مانگا و وشتر و مەڕ و ماڵاتەکانتاندا شیر ڕامەگرن لە گوانیاندا بە مەبەستی ئەوەی وا بزانرێت کە شیری زۆردەدەن، هەرکەسێ ماڵاتێ لەوجۆرەی کڕی لەپاشدا بۆی دەرکەوت فێڵی لێ کراوە ئەوە خۆی سەرپشکە لەنێوان ئەم دوو هەڵبژاردنەدا: ئەگەر ڕازی بوو ئەوە با ڕاگیری بکات، ئەگەر ناڕازیش بوو ئەوە با بۆی بگێڕێتەوە، لەگەڵ مەن(صاع)ێك خورما).

٣٤٤٤ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنِ اشْتَرَى شَاةً مُصَرَّاةً فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ, إِنْ شَاءَ رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ طَعَامٍ لاَ سَمْرَاءَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

فەرموويەتی: (هەرکەسێ مەڕێ بکڕێ شیریان لە گوانەکانیدا راگرتبوو ئەوە کڕیارەکە خۆی سەرپشکە هەتا سێ رۆژ، ئەگەر ویستی ئەوە با بۆی بگێڕێتەوە لەگەڵ مەن(صاع)ێك خواردندا نەك گەنم).

| ٣٤٤٥ - (صحيح) عن أبو هريرة, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ اشْتَرَى غَنَمًا مُصَرَّاةً احْتَلَبَهَا: فَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا, وَإِنْ سَخِطَهَا فَفِي حَلْبَتِهَا صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ). |
|---|

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (هەرکەسێ مەڕێ بکڕێ شیریان لە گوانەکانیدا راگرتبوو ئەوە با بیدۆشێت، ئەگەر رازی بوو راگیری بکات، ئەگەر نارازیش بوو ئەوە با بۆی بگێڕێتەوە، لەگەڵ مەن(صاع)ێك خورما).

| ٣٤٤٦ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ ابْتَاعَ مُحَفَّلَةً فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ, فَإِنْ رَدَّهَا رَدَّ مَعَهَا مِثْلَ أَوْ مِثْلَيْ لَبَنِهَا قَمْحًا). |
|---|

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (هەرکەسێ ماڵاتێکی کڕێ شیریان لە گوانەکانیدا راگرتبوو ئەوە کڕیارەکە خۆی سەرپشکە هەتا سێ رۆژ، بۆ راگرتنی یان گەڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی جا ئەگەر بۆی گەڕاندەوە ئەوە با بە ئەندازەی شیرەکەی یان دوو ئەوەندەی شیرەکەی گەنمی بۆ بنێرێت).

## باسی سەبارەت بە نەهی کردن لە قۆرخکردن واتە شاردنەوەو هەڵگرتنی خواردن و کاڵاو شمەکی پێویست بۆ کاتی گرانی و بە مەبەستی گران فرۆشتنەوە.

## ٤٩ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْحُكْرَةِ.

٣٤٤٧ - (صحيح) عن سعيد بن المسيب, عن معمر بن أبي معمر, أحد بني عدي بن كعب, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَحْتَكِرُ إِلاَّ خَاطِئٌ). فَقُلْتُ لِسَعِيدٍ: فَإِنَّكَ تَحْتَكِرُ! قَالَ: وَمَعْمَرٌ كَانَ يَحْتَكِرُ! قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَسَأَلْتُ أَحْمَدَ: مَا الْحُكْرَةُ؟ قَالَ: مَا فِيهِ عَيْشُ النَّاسِ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: الْمُحْتَكِرُ مَنْ يَعْتَرِضُ السُّوقَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، لە مەعمەری کوڕی ئەبی مەعمەرەوە، کە یەکێ بووە لە هۆزی بەنی عەدی کوڕی کەعب، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خواردن و شمەکی پێویست ناشارێتەوە بۆ کاتی گرانی مەگەر کەسی تاوانبار). بە سەعیدم وت: خۆ تۆش (احتکار) دەکەیت! وتی: مەعمەریش (احتکار)ی دەکرد! ئەبو داود دەڵێت: لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم پرسی وتم: (الْحُكْرَة)چی یە؟ وتی: شاردنەوەی قوتی خەڵك بۆ کاتی گرانی و بە گران فرۆشتن. ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا ئەوزاعی وتی: (محتكر) کەسێکە بەربەرەکانێی بازار دەکات، قوتی خەڵك دەکڕێ و هەڵی دەگرێ و دەیشارێتەوە لەپاشدا بەگران دەیفرۆشێ.

٣٤٤٨ - (ضعيف الإسناد مقطوع) عن قتادة قال: لَيْسَ فِي التَّمْرِ حُكْرَةٌ. قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: قَالَ: عَنِ الْحَسَنِ, فَقُلْنَا لَهُ: لاَ تَقُلْ عَنِ الْحَسَنِ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ عِنْدَنَا بَاطِلٌ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: كَانَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ يَحْتَكِرُ النَّوَى وَالْخَبَطَ وَالْبِزْرَ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قۆرخکردن لە خورمادا نیە واتە ئەگەر کەسێك خورمای هەڵگرت گوناهی ناگات، (ابن المثنی) لە ریوایەتەکەیدا وتی: یەحیا وتی: لە حەسەنەوە، پێمان وت: مەڵێ لە حەسەنەوە، ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە لە یەحیای کوڕی (فیاض)ەوە ئیتر لە قەتادەوە بێت یان لە حەسەنەوە لەلای ئێمە (باطل)پوچ و نارەوایە لەڕێی سەنەدەکەیەوە، ئەبو داود دەڵێت: سەعیدی کوڕی موسەییەب ئەمانەی هەڵدەگرت: تۆوی وشکانی و هەموو تۆوێك کە بچێنرێت، گەڵای وەریو مەبەست لێی ئاڵفە.

(صحيح مقطوع) قال أبو داود: سمعت أحمد بن يونس قال: سَأَلْتُ سُفْيَانَ عَنْ كَبْسِ الْقَتِّ فَقَالَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ الْحُكْرَةَ, وَسَأَلْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَيَّاشٍ فَقَالَ: اكْبِسْهُ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: گوێم لێ بوو ئەحمەدی کوڕی یونوس وتی: دەربارەی هەڵگرتنی ئاڵف لە سوفیانم پرسی؟ وتی: ئەوان هەڵگرتنی شتیان پێ ناخۆش بوو، لە ئەبوو بەکری کوڕی عەییاشم پرسی وتی: هیچی تێدا نیە قەیدی نیە.

## باسی سەبارەت بە شکاندنی درهەم و دیناری ئاسن.

## ٥٠ - باب فِي كَسْرِ الدَّرَاهِمِ.

٣٤٤٩ - (ضعيف) عن علقمة بن عبد الله, عن أبيه قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُكْسَرَ سِكَّةُ الْمُسْلِمِينَ الْجَائِزَةُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ مِنْ بَأْسٍ.

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی (عبد الله)وە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نەهی کردوە لە شکاندنی پارە سکەی موسوڵمانان ئەوەی کە سەوداو مامەڵەی پێ دەکەن لەنێوان خۆیانداو مایەی سودو قازانجە بۆیان، مەگەر ئەو پارە تەزویر کرابێ.

## باسی سەبارەت بە نرخ دانان لەسەر شت.

## ٥١ - باب فِي التَّسْعِيرِ.

٣٤٥٠ - عن أبو هريرة: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, سَعِّرْ. فَقَالَ (بَلْ أَدْعُو). ثُمَّ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ سَعِّرْ فَقَالَ (بَلِ اللَّهُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ, وَإِنِّى لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ لأَحَدٍ عِنْدِى مَظْلَمَةٌ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کەل و پەل و کاڵاو شمەك گرانە نرخیان بۆ دابنێ، فەرمووی: (بەڵکو دوعا بکە خوای گەورە ڕۆزی فراوان بکات و نرخ دابەزێ و هەرزانی بکەوێتەوە)، لەپاشدا پیاوێ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کەل و پەل و کاڵاو شمەك گرانە نرخیان بۆ دابنێ، فەرمووی: (بەڵکو خوای گەورە خۆی نرخ بەرزدەکاتەوەو دایشی دەبەزێنێ و هەرزانی دەکات، ئومێد دەکەم هەتا دەگەمەوە بە خوای گەورە هیچ کەسێ لەئێوە داواچی نەبێ لەسەرم داوای هەقی خۆیم لێ بکات).

٣٤٥١ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال الناس: يَا رَسُولَ اللَّهِ غَلاَ السِّعْرُ فَسَعِّرْ لَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ, وَإِنِّى لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُطَالِبُنِى بِمَظْلَمَةٍ فِى دَمٍ وَلاَ مَالٍ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نرخی کەل و پەل و کاڵاو شمەك گران بووە، نرخی شتەکان دابنێ بۆمان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

فەرمووی: (خوای پەروەردگار خۆی نرخ دانەرە، رۆزی دەرە، هەرخۆی رۆزی و هەموو شتێ دەگرێتەوەو گوشادیشی دەكات، ئومێد دەكەم هەتا دەگەمەوە بە خوای گەورە هیچ كەسێ لەئێوە داواچی نەبێ لەسەرم داوای هەقی خۆیم لێ بكات ئیتر ئەو هەقە خوێن بێت یان ماڵ و سامان.

## باسی سەبارەت بە نەهی كردن لە غەل و غەش.

## ٥٢ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْغِشِّ.

٣٤٥٢ - عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِرَجُلٍ يَبِيعُ طَعَامًا, فَسَأَلَهُ: (كَيْفَ تَبِيعُ). فَأَخْبَرَهُ فَأُوحِيَ إِلَيْهِ أَنْ: أَدْخِلْ يَدَكَ فِيهِ, فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ, فَإِذَا هُوَ مَبْلُولٌ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای پیاوێكدا خۆراكی دەفرۆشت، لێی پرسی فەرمووی: (چۆنی دەفرۆشیت؟) نیگای بۆ كرا كە دەست بخاتە ناو ئەو خواردنەوە، ئەویش دەستی كرد بەناویدا، سەیردەكات تەڕەو ئاو ڕشێن كراوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەركەسێ غەل و غەش بكات لەسەر بەرنامەو ڕێبازی ئێمە نی یە).

٣٤٥٣ – (صحيح الإسناد مقطوع) عن يحي قال: كَانَ سُفْيَانُ يَكْرَهُ هَذَا التَّفْسِيرَ: لَيْسَ مِنَّا: لَيْسَ مِثْلَنَا.

واتە: لە یەحیاوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: سوفیان ئەم تەفسیرەی پێ خۆش نەبوو: (لیس منا): واتە وەك ئێمە نی یە.

## باسی سەبارەت بە سەرپشکی کڕیار و فرۆشیار.

## ٥٣ - باب فِي خِيَارِ الْمُتَبَايِعَيْنِ.

٣٤٥٤ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا, إلاَّ بَيْعَ الْخِيَارِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کڕیار و فرۆشیار هەریەکێکیان بۆ خۆیان سەرپشکن لە سەوداو مامەڵەکەیاندا هەتاوەکو جیادەبنەوە، مەگەر فرۆشتن بە مەرجی سەرپشکی).

٣٤٥٥ - (صحيح) عن ابن عمر: عن النبي صلى الله عليه و سلم بمعناه قال: (أَوْ يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ اخْتَرْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، فەرمووی: (یان یەکێکیان بڵێ بەوی تریان خۆت سەرپشك بە).

٣٤٥٦ - (حسن) عن عبد الله بن عمرو بن العاص: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْمُتَبَايِعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا, إلاَّ أَنْ تَكُونَ صَفْقَةَ خِيَارٍ, وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُفَارِقَ صَاحِبَهُ خَشْيَةَ أَنْ يَسْتَقِيلَهُ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کڕیار و فرۆشیار هەریەکێکیان بۆ خۆیان سەرپشکن لە سەوداو مامەڵەکەیاندا هەتاوەکو

جیادەبنەوە، مەگەر کڕین و فرۆشتنەکە بە مەرجی سەرپشکی بێت بۆ چەند ڕۆژێ یان هەتا لەو کۆڕو دانیشتنەدان، دروست نیە یەکێکیان لەوی تریان جیاببێتەوە لەترسی ئەوەی نەوەکا سەوداو مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوەو پەشیمان ببێتەوە.

٣٤٥٧ - (صحيح) عن أبو الوضيء قال: غَزَوْنَا غَزْوَةً لَنَا, فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً, فَبَاعَ صَاحِبٌ لَنَا فَرَسًا بِغُلَامٍ, ثُمَّ أَقَامَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَلَيْلَتِهِمَا, فَلَمَّا أَصْبَحَا مِنَ الْغَدِ حَضَرَ الرَّحِيلُ فَقَامَ إِلَى فَرَسِهِ يُسْرِجُهُ فَنَدِمَ, فَأَتَى الرَّجُلَ وَأَخَذَهُ بِالْبَيْعِ, فَأَبَى الرَّجُلُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَيْهِ, فَقَالَ: بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَبوو بَرْزَةَ صَاحِبُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَيَا أَبَا بَرْزَةَ فِي نَاحِيَةِ الْعَسْكَرِ, فَقَالاَ لَهُ هَذِهِ الْقِصَّةَ, فَقَالَ: أَتَرْضَيَانِ أَنْ أَقْضِيَ بَيْنَكُمَا بِقَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا). قَالَ هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ: حَدَّثَ جَمِيلٌ أَنَّهُ قَالَ: مَا أُرَاكُمَا افْتَرَقْتُمَا.

واتە: لە (أبو الوضيء)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لە غەزایەکدا لە جێگایە لاماندا، یەکێ لە هاوڕێکانمان ئەسپێکی فرۆشت بە پیاوێ بە غولامێ، لەپاشدا ماوەی ئەو ڕۆژە کە مابوو لەگەڵ شەوەکەی مانەوە لەو شوێنەدا بۆ بەیانی دواتر کاتێ کە کاتی ڕۆشتن هات کابرا هەستا ویستی کۆپانی ئەسپەکە بخاتە سەرپشتی ئەسپەکە بۆئەوەی ئامادەی بکات بۆ سواربوون، خاوەن ئەسپەکە هات پەشیمان بوویەوەو داوای ئەسپەکەی کردەوە، بەڵام کابرا ئەسپەکەی نەدایەوە. وتی: نێوانی من و تۆ ئەبو بەرزەی ئەسلەمی هاوەڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێت، چون بۆ خزمەت ئەبو بەرزە لەوکاتەدا لەرویەکی سەربازگەکەوە بوو، بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، وتی: ڕازی دەبن دادوەری بکەم لە نێوانتاندا بەو شێوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردویەتی؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کڕیار و فرۆشیار هەریەکێکیان بۆ خۆیان سەرپشکن لە سەوداو مامەڵەکەیاندا هەتاوەکو جیادەبنەوە). هیشامی کوڕی حەسسان وتی: جەمیل گێڕایەوە کە ئەبو بەرزە وتی: پێم وا نی یە کە جیابوو بێتنەوە لەبەرئەوەی لەیەك سەربازگەدان و لەیەك شوێندان بۆیە خاوەن

ـەسپەكە بۆی هەیە ئەسپەكەی بەرێتەوە.

٣٤٥٠ - (حسن صحيح) عن يحيى بن أيوب قال: كَانَ أَبو زُرْعَةَ إِذَا بَايَعَ رَجُلاً خَيَّرَهُ, قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ: خَيِّرْنِي, وَيَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَفْتَرِقَنَّ اثْنَانِ إِلاَّ عَنْ تَرَاضٍ).

واتە: لە یەحیای كوڕی ئەیوبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەبو زورعە ئەگەر شتێكی بفرۆشتایە بە كەسێ سەرپشكی دەكرد بۆ پەشیمان بوونەوە، لەپاشدا وتی: هەریەكێكیان ئەوی تریان سەرپشك بكات بۆ تەواوی سەوداو مامەڵەكە بێن بۆ پەشیمان بوونەوە، وتی: گوێم لێ بوو ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (با كڕیار و فرۆشیار لەیەكتر جیانەبنەوە هەتا لەیەكتری رازی نەبن).

٣٤٥٩ - (صحيح) عن حكيم بن حزام: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا, فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا, وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتِ الْبَرَكَةُ مِنْ بَيْعِهِمَا). قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ سَعِيدُ بْنُ أَبو عَرُوبَةَ وَحَمَّادٌ, وَأَمَّا هَمَّامٌ فَقَالَ: (حَتَّى يَتَفَرَّقَا) قال: (أَوْ يَخْتَارَ). ثَلاَثَ مِرَارٍ.

واتە: لە حەكیمی كوڕی حیزامەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (كڕیار و فرۆشیار هەریەكێكیان بۆ خۆیان سەرپشكن لە سەوداو مامەڵەكەیاندا هەتاوەكو جیادەبنەوە، جا ئەگەر راستگۆ بوون و شتەكانیان بەجوانی خستەڕو ئەوە خێر و بەرەكەت دەكەوێتە سەوداو مامەڵەكەیانەوە، ئەگەر درۆشیان كردو راستیەكەیان شاردەوە ئەوە خێر و بەرەكەت لە سەوداو مامەڵەكەیاندا نامێنێت، ئەبو داود دەڵێت: هەروەها سەعیدی كوڕی ئەبو عەروبەو حەمماد ریوایەتیان كردوە، بەڵام هەممام دەڵێ: (هەتاوەكو جیادەبنەوە) وتی: (یان واژۆی گرێبەستەكە دەكەن و هەڵی دەبژێرن و مامەڵەكە قبوڵ دەكەن یا سەوداو مامەڵەكە هەڵدەوەشێننەوە) سێ جار.

## باسی سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی لەکارخستن.

## ٥٤ - باب فِي فَضْلِ الإِقَالَةِ.

٣٤٦٠ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ أَقَالَ مُسْلِمًا أَقَالَهُ اللَّهُ عَثْرَتَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ چاوپۆشی بکات لە پەشیمان بوونەوەی موسوڵمانێك لە سەوداو مامەڵەکەیدا لەرۆژی دوایی دا خوای گەورە چاوپۆشی لە هەڵەکانی دەکات).

## باسی سەبارەت بە دوو فرۆشتن لەفرۆشتنێکدا.

## ٥٥ - باب فِيمَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ.

٣٤٦١ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا أَوِ الرِّبَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ دوو فرۆشتن لە فرۆشتنێکدا ئەنجام بدات وەك ئەوە بڵێ من ئەم خانوەت پێ دەفرۆشم بەوەندە بەمەرجێ تۆش سەیارەکەی خۆتم پێ بفرۆشی بە ئەوەندە ئەو کەسەی ئەمە بکات ئەوە دەبێ سەوداکەر کەمترەکەیان هەڵبگرێ یان خۆی توشی سود(ربا)خواردن دەبێ).

## باسی سەبارەت بە نەهی کردن لە .

## ٥٦ - باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْعِينَةِ.

٣٤٦٢ - (صحيح) عن ابن عمر قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ, وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ, وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ, سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلاً لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر خەڵك سەوداو مامەڵەی (عِينَة)یان کرد - (عِينَة) واتە: بازرگان ماڵێ دەفرۆشێ بە کەسێ بە قەرز لەپاشدا هەمان ماڵی لێ دەکرێتەوە بە حازر بە نرخێکی کەمتر لەوەی کە پێی فرۆشتوە -، دوای کلکی مانگا کەوتن و، رازی بوون بە کشتوکاڵ و تۆوچاندن و، وازتان لە جیهادو تێکۆشان هێنا، خوای گەورە توشی زەلیلی و ژێردەستەییتان دەکات لەسەرتان لاینابات هەتا نەگەڕێنەوە بۆ سەر دینەکەتان).

## باسی سەبارەت بە سەلەم [1].

## ٥٧ - باب فِي السَّلَفِ

٣٤٦٣ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي التَّمْرِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ).

---

(١) سلف: لە زمانەوانیدا بریتیە لە: سولفەو پێشخستن. لە شەرعیشدا: فرۆشتنی شتێکی وەسفکراوە لەئەستۆدا بە وشەی سەلەم و پێشخستن.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كۆچی كرد بۆ شاری مەدینە خەڵكی مەدینە ساڵ و دوو ساڵ و سێ ساڵ خورمایان سەلەم دەكرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەركەس سەلەم دەكات با پێوانەكەی دیاریكراو بێت و كێشانەكەی و ماوەو وادەكەشی دیاریكراو بێت).

٣٤٦٤ - (صحيح) عن محمد أو عبد الله بن مجالد, قال: اخْتَلَفَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ وَأَبو بُرْدَةَ فِي السَّلَفِ, فَبَعَثُونِي إِلَى ابْنِ أَبِي أَوْفَى فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: إِنْ كُنَّ نُسْلِفُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالتَّمْرِ وَالزَّبِيبِ. زَادَ ابْنُ كَثِيرٍ: إِلَى قَوْمٍ مَا هُوَ عِنْدَهُمْ, ثُمَّ اتَّفَقَا: وَسَأَلْتُ ابْنَ أَبْزَى فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە موحەممەدەوە یان لە (عبد الله)ی كوڕی موجالیدەوە دەگێڕنەوە. كە وتویەتی: (عبد الله)ی كوڕی شەدداد و ئەبو بووردە لەبارەی سەلەمەوە جیاوازی كەوتە نێوانیانەوە، منیان نارد بۆلای ئیبنو ئەبی ئەوفا لێم پرسی وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم و ئەبو بەكر و عومەردا گەنم و جۆ و خورماو مێوژمان سەلەم دەكرد. (ابن كثير) ئەمەی بۆ زیاد كرد: لەگەڵ كۆمەڵێ كە لەوكاتەدا گەنم و جۆ و خورماو مێوژیان نەبوو، لەپاشدا هەردوو راوی فەرموودەكە رێكن: هەروەها لە ئیبنو ئەبزیم پرسی بە هەمان شێوەی وت.

٣٤٦٥ - (صحيح) عن ابن أبو المجالد بِهَذَا الْحَدِيثِ قَالَ: عِنْدَ قَوْمٍ مَا هُوَ عِنْدَهُمْ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: الصَّوَابُ ابْنُ أَبِي الْمُجَالِدِ وَشُعْبَةُ أَخْطَأَ فِيهِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو موجالیدەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، دەڵێت: لەگەڵ كۆمەڵێك كە لەوكاتەدا گەنم و جۆ و خورماو مێوژیان نەبوو، ئەبوو داود دەڵێت: راستیەكەی ئیبنو ئەبو موجالیدە شوعبە بە هەڵەدا چوە.

٣٤٦٦ - (صحيح بما قبله) عن عبد الله بن أبي أوفى الأسلمي قال: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الشَّامَ فَكَانَ يَأْتِينَا أَنْبَاطٌ مِنْ أَنْبَاطِ الشَّامِ فَنُسْلِفُهُمْ فِي الْبُرِّ وَالزَّيْتِ سِعْرًا مَعْلُومًا وَأَجَلاً مَعْلُومًا, فَقِيلَ لَهُ: مِمَّنْ لَهُ ذَلِكَ؟ قَالَ: مَا كُنَّا نَسْأَلُهُمْ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئیبنو ئەبی ئەوفای ئەسلەمییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەشداری غەزامان کرد لەدەوروبەری وڵاتی شام خەڵکانێك لە (أنباط)ی شامەوە دەهاتنە لامان گەنم و جۆ و زەیتمان بە نرخی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە سەلەم پێ دەدان، پێی وترا: ئەو شتانەیان هەبوو واتە گەنم و جۆ و زەیت؟ وتی: ئێمە پرسیاری ئەوەمان لێ نەدەکردن گرنگ ئەوەیە لە ئەستۆیاندا بوو.

## باسی سەبارەت بە سەلەم کردن لە بەری دارخورمای دیاریکراودا.

## ٥٨ - باب فِي السَّلَمِ فِي ثَمَرَةٍ بِعَيْنِهَا.

٣٤٦٧ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَجُلاً أَسْلَفَ رَجُلاً فِي نَخْلٍ فَلَمْ تُخْرِجْ تِلْكَ السَّنَةَ شَيْئًا فَاخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ (بِمَ تَسْتَحِلُّ مَالَهُ ارْدُدْ عَلَيْهِ مَالَهُ). ثُمَّ قَالَ (لاَ تُسْلِفُوا فِي النَّخْلِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ بەروبوومی دارخورمای بە سەلەم دا بە پیاوێکی تر، ئەو ساڵە دارخورماکانی هیچ بەرهەمیان نەهێنا، سکاڵایان بردە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەچی ئەو پارەو ماڵەی حەڵاڵ دەکەیت کە داویەتی پێت، پارەو ماڵەکەی بۆی بیگێڕەرەوە) لەپاشدا فەرمووی: (سەلەم مەکەن لە دارخورمادا هەتا دێتەبەر و خۆش دەبێ).

## باسی سەبارەت بە سەلەم کە ناگۆڕدرێت بە شتێکی تر.

## ٥٩ - باب السَّلَفِ لاَ يُحَوَّلُ.

٣٤٦٨ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَلاَ يَصْرِفْهُ إِلَى غَيْرِهِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خو صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس سەلەمی کرد لەشتێکدا ب نەیگۆڕێت بە شتێکی تر، یان نەیدا بە کەسێکی تر هەتا خۆی وەری نەگرێ).

## باسی سەبارەت بەو بەلاو ئافاتەی کە دەدات لە بەروبووم و لەناوی دەبات.

## ٦٠ - باب فِي وَضْعِ الْجَائِحَةِ.

٣٤٦٩ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا فَكَثُرَ دَيْنُهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ). فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ, فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم پیاوێ بەروبوومی باخێکی کڕی بەروبوومەکە فەوتا پیاوەکە توشی قەرزاریەکی زۆر بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خێری پێ بکەن و زەکاتی بدەنێ)، خەڵك خێر و زەکاتیان دایە بەڵام بەشی ئەوەی نەدەکرد بەتەواوی قەرزەکانی پێ بداتەوە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: (چیتان

ـەستکەوتوە بیبەن لەوە زیاترتان بۆ نیە هەر ئەوەتان دەکەوێت).

٣٤٧٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ تَمْرًا فَأَصَابَتْهَا جَائِحَةٌ فَلاَ يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا, بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر خورما یان بەروبوومێکت فرۆشت بە برایەکت، دواتر پێشدا بەڵاو ئافاتێ لێی دا لەناوی برد، بۆت دروست نیە هیچ شتێکی لێ وەربگریت، بەهۆی چیەوە ماڵی برای خۆت بە ناهەق وەردەگریت).

## باسی سەبارەت بە تەفسیری (جائحە) ئەو بەڵاو ئافاتەی کە دەدات لە بەروبووم و لەناوی دەبات.

## ٦١ - باب فِي تَفْسِيرِ الْجَائِحَةِ.

٣٤٧١ - (حسن مقطوع) عن عطاء قال: الْجَوَائِحُ كُلُّ ظَاهِرٍ مُفْسِدٍ مِنْ مَطَرٍ أَوْ بَرْدٍ أَوْ جَرَادٍ أَوْ رِيحٍ أَوْ حَرِيقٍ.

واتە: لە (عطاء)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (جوائح) لەناوچونی بەروبووم: هەموو بەڵاو ئافاتێکە کە بەروبووم توشی دەبێت بە ئاشکراو لەناوی دەبات لە باران و سەرماو سۆڵەو کوللەو باو بۆران و سوتاندن).

٣٤٧٢ - (حسن مقطوع) عن يحيى بن سعيد قال: لاَ جَائِحَةَ فِيمَا أُصِيبَ دُونَ ثُلُثِ رَأْسِ الْمَالِ, قَالَ يَحْيَى: وَذَلِكَ فِي سُنَّةِ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (جائحە) نیە ئەگە سێ یەکی بەروبوومی سەری ماڵ و سامان توشی زەرەر و زیان نەهات لەناونەچو، یەحیا وتی: زانستی ئەمەش لە ڕێباز و کردەوەی موسوڵمانانەوەیە.

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی ئاو.

## ٦٢ - باب فِي مَنْعِ الْمَاءِ.

٣٤٧٣ - (صحيح) عن أبو هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم: (لاَ يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ الْكَلأُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زیادەی ئاوی هەڵقوڵاو و لەبەر ڕۆیشتو قەدەغەناکرێت لەکاتێکدا کە ئەویش ببێتە هۆی قەدەغەکردنی لەوەڕ، - بۆ نمونە کەسێ بیرێ یان کانیاوێکی هەبێت لە دەوروبەری لەوەڕ هەبێ ئەویش زیادەی ئاوەکەی قەدەغەی بکات بۆ ئەوەی خەڵك مەڕو ماڵاتەکانیان لە لەوەڕی ئەو دەوروبەر دوریخەنەوە لەبەر بێ ئاوی، ئەو کاتە تەنها خۆی سودی لێ ببینێ، بەڵکو دەبێت زیادەی ئاوەکە نەگرێتەوە بۆ ئەوەی خەڵك مەڕو ماڵاتەکانیانی لێ ئاو بدەن - ).

٣٤٧٤- (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ مَنَعَ ابْنَ السَّبِيلِ فَضْلَ مَاءٍ عِنْدَهُ، وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلَى سِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ - يَعْنِى كَاذِبًا - وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا فَإِنْ أَعْطَاهُ وَفَى لَهُ, وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ لَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ کەس لە ڕۆژی قیامەتدا خوا نایان دوێنێ: کەسێ

ـ..ی ئاوەکەی قەدەغەبکات لە کەسی ڕێبوار، وە کەسێ لەدوای نوێژی ـەسر سوێندی درۆ بخوات لەسەر شمەك و کاڵای بازرگانی، هەروەها کەسێ ـەێن و پەیمان بدات بە پێشەوایە ئەگەر پێی بەخشی وەفای بۆی هەبێ، حۆ ئەگەر پێی نەبەخشی بێ وەفا بێ بەرامبەری واتە بەڵێن و پەیمانەکەی ـۆ دونیا بێت).

٣٤٧٥ - (صحيح) عن الأعمش بإسناده ومعناه قال: (وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ ـيمٌ). وَقَالَ فِى السِّلْعَةِ: (بِاللَّهِ لَقَدْ أُعْطِىَ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ الآخَرُ فَأَخَذَهَا).

ـتە: لە ئەعمەشەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەدو مانا هاتوە، فەرمووی: ـیان ناکاتەوەو سزایەکی زۆر سەختیان بۆ هەیە)، دەربارەی کاڵاو شمەکێکی ـزرگانی بە درۆوە بڵێ: (سوێند بە (الله) دەیدەم بە ئەوەندەو ئەوەندە ئەوەندەو ئەوەندەم پێ داوە، کەسێکی تر باوەڕی پێ بکات و بەو نرخە لێی بکڕێت کە ـوێندی لەسەر دەخوات کە بەوەندە کڕیویەتی).

٣٤٧٦ - (ضعيف) عن بهيسة, عن أبيها قالت: اسْتَأْذَنَ أَبِى النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَمِيصِهِ, فَجَعَلَ يُقَبِّلُ وَيَلْتَزِمُ, ثُمَّ قَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (الْمَاءُ). قَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (الْمِلْحُ). قَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (أَنْ تَفْعَلَ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ).

واتە: لە بووهەیسەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم مۆڵەتی وەرگرت لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەری کرد بەژێر کراسەکەیداو جەستەی موبارەکی ماچ کرد و ڕووی خۆی هەڵسو لە جەستەی، لەپاشدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبکرێت؟ فەرمووی: (ئاو). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبکرێت؟ فەرمووی: (خوێ). هەروەها وتی:

ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبکرێت؟ فەرمووی: (هەر چاکەیە بکەیت ئەوە بۆ خۆت چاکترە).

٣٤٧٧ - (صحيح) عن علي, عن رجل من المهاجرين من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم, قال: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثًا أَسْمَعُهُ يَقُولُ: (الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ: فِي الْمَاءِ وَالْكَلَإِ وَالنَّارِ).

واتە: لە عەلیەوە، لە پیاوێکی موهاجرینەوە کە یەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەشداری سێ غەزام کردوە گوێم لێی بوو فەرمووی: (موسوڵمانان لە سێ شتدا شەریك و هاوبەشن: (ئاو و لەوەڕ و ئاگر).

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی ئاوی زیادە لەخۆ.

### ٦٣ - باب فِي بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ.

٣٤٧٨ - (صحيح) عن إياس بن عبد: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ.

واتە: لە ئیاسی کوڕی عەبدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی ئاوی زیادە لەخۆ - واتە کەسێ ئاوێکی هەبێت لەخۆی زیادبێ و بیفرۆشێ ئەو کارە نەهی لێ کراوە - .

## باسى سەبارەت بە نرخ و بەهاى پشيلە.

## ٦٤ - باب فِي ثَمَنِ السِّنَّوْرِ.

٣٤١٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ.

واتە: لە جابرى كورِى (عبد الله)وە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم نەهى كردوە لە نرخ و بەهاى سەگ و پشيلە.

٣٤٨٠ - (صحيح) عن جابر أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْهِرَّةِ.

واتە: لە جابرەوە ى دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهى كردوە لە نرخ و بەهاى پشيلە.

## باسى سەبارەت بە نرخ و بەهاى سەگەكان.

## ٦٥ - باب فِي أَثْمَانِ الْكِلاَبِ.

٣٤٨١ - (صحيح) عن أبو مسعود: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ.

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە، لە پێغەمبەرى خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، كە نەهى كردوە لە نرخ و بەهاى سەگ و، زيناى ئافرەت و، كولەنانى فاڵ گرتنەوە.

٣٤٨٢ - (صحيح الإسناد) عن عبد اللّه بن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَإِنْ جَاءَ يَطْلُبُ ثَمَنَ الْكَلْبِ فَامْلأْ كَفَّهُ تُرَابًا.

واتە: لە (عبد الله)ى كوڕى عەباسەوە ڕەزاى خوايان لىٚ بىٚ دەگێڕنەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم نەهی كردوە لە نرخ و بەهاى سەگ، ئەگەر كەسێ هات داواى نرخ و بەهاى سەگی كرد مشتی پڕ بكەن لە گڵ واتە جگە لە نائومێدی هیچی بۆ نیە.

٣٤٨٣ - (صحيح) عن عون بن أبي جحيفة, أن أباه قال: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ.

واتە: لە عەونی كوڕى ئەبو جوحەيفەوە دەگێڕنەوە، كە باوكی وتويەتی: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم نەهی كردوە لە نرخ و بەهاى سەگ.

٣٤٨٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَحِلُّ ثَمَنُ الْكَلْبِ, وَلاَ حُلْوَانُ الْكَاهِنِ, وَلاَ مَهْرُ الْبَغِيِّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (نرخ و بەهاى ئەمانە حەڵاڵ نین: سەگ و، كوڵەنانی فاڵ گرتنەوەو، زیناى ئافرەت).

## باسی سەبارەت بە نرخ و بەهاى مەى و مردارەوەبوو.

## ٦٦- باب فِي ثَمَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ.

٣٤٨٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ الْخَمْرَ وَثَمَنَهَا, وَحَرَّمَ الْمَيْتَةَ وَثَمَنَهَا, وَحَرَّمَ الْخِنْزِيرَ وَثَمَنَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (بێگومان خواى گەورە مەیی حەرام كردوە لەگەڵ

ـرخ و بەهاکەی، گۆشتی مردارەوەبووی حەرام کردوە لەگەڵ نرخ و بەهاکەی، گۆشتی بەرازی حەرام کردوە لەگەڵ نرخ و بەهاکەی).

٣٤٨٦ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أنه سمع رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول عام الفتح وهو بمكة: (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ). فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ, وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: (لاَ هُوَ حَرَامٌ). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ ذَلِكَ: (قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ! إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا أَجْمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە لە ساڵی رزگارکردنی شاری مەککەدا لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بیستوە ئەو کاتە لە مەککە بوو فەرموویەتی: (بێگومان خوای گەورە فرۆشتنی مەیی و، گۆشتی مردارەوەبوو، گۆشتی بەراز و بتەکانی حەرام کردووە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێت چۆنە ئەگەر بە بەزی مردارەوەبوو کەشتیەکانی پێ چەور بکرێت و پێستەکانی پێ چەور بکرێت و بکرێتە چراوەو خەڵك سودی لێ ببینن بۆ روناکی؟ فەرمووی: (نابێ حەرامە) لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە جولەکە لەناوبات! لەکاتێکدا کە خوای گەورە بەزی مردارەوەبووی لێ حەرام کردن ئەوان تاواندیانەوەو کردیان بە رۆن لەپاشدا فرۆشتیان و پارەکەیان خوارد).

٣٤٨٧ - عن جابر, نحوه, ولم يقول: (هُوَ حَرَامٌ).

واتە: لە جابرەوە، فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەڵام نەیفەرموو: (ئەوە حەرامە).

٣٤٨٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

جَالِسًا عِنْدَ الرُّكْنِ, قَالَ: فَرَفَعَ بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَضَحِكَ, فَقَالَ (لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ ثَلَاثًا (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ فَبَاعُوهَا وَأَكَلُوا أَثْمَانَهَا, وَإِنَّ اللَّهَ إِذَا حَرَّمَ عَلَى قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عَلَيْهِمْ ثَمَنَهُ). وَلَمْ يَقُلْ فِي حَدِيثِ خَالِدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الطَّحَّانِ: (رَأَيْتُ). وَقَالَ: (قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای روکن پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی، ئیبنو عەباس وتی: سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و پێکەنی، سێ جار لەسەریەك فەرمووی: (خوای گەورە جولەکە لەناوبات) (لەکاتێکدا کە خوای گەورە بەزی مردارەوەبووی لێ حەرام کردن ئەوان تاواندیانەوەو دەیانفرۆشت و پارەکەیان دەخوارد، بێگومان ئەگەر خوای گەورە خواردنی شتێکی حەرام کرد لەسەر گەلێك پارەو نرخ و بەهاکەشی لەسەریان حەرام دەکات). لە فەرموودەکەی خالیدی کوڕی (عبد الله)ی (طحان)دا ئیبنو عەباس نەیوت: (رَأَيْتُ). واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی، فەرمووی: (خوای گەورە جولەکە لەناوبات).

٣٤٨٩ - (ضعيف) عن المغيرة بن شعبة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ بَاعَ الْخَمْرَ فَلْيُشَقِّصِ الْخَنَازِيرَ).

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس مەی بفرۆشێ با گۆشتی بەراز پارچە پاچە بکات بۆ خواردن یان بۆ فرۆشتن). - واتە وەك ئەوە وایە کە فرۆشتن و خواردنی گۆشتی بەراز بە ڕەوا بزانێ - .

٣٤٩٠ - (صحيح) عن عائشة قالت: لَمَّا نَزَلَتِ الآيَاتُ الأَوَاخِرُ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَهُنَّ عَلَيْنَا وَقَالَ: (حُرِّمَتِ التِّجَارَةُ فِي الْخَمْرِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (البقرة) دابەزی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچو بۆی خوێندینەوەو فەرمووی: (بازرگانی کردن بە مەیەوە حەرام کراوە).

| |
|---|
| ٣٤٩٠ - (صحيح) عن أعمش باسناده ومعناه قال: الآيَاتُ الأَوَاخِرُ فِي الرِّبَا. |

واتە: لە ئەعمەشەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، کە وتویەتی: کاتێ ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (البقرة) دەربارەی سوو (ربا) دابەزین.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی خۆراك پێش ئەوەی وەربگیرێت.

## ٦٧ - باب فِي بَيْعِ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى.

| |
|---|
| ٣٤٩٢ - (صحيح) عن ابن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال (مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ). |

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خۆراکێکی کڕی نەیفرۆشێ بە کەسێکی تر هەتا بەتەواوی وەریدەگرێت).

| |
|---|
| ٣٤٩٣ - (صحيح) عن ابن عمر قال: كُنَّا فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبْتَاعُ الطَّعَامَ، فَيَبْعَثُ عَلَيْنَا مَنْ يَأْمُرُنَا بِانْتِقَالِهِ مِنَ الْمَكَانِ الَّذِى ابْتَعْنَاهُ فِيهِ، إِلَى مَكَانٍ سِوَاهُ قَبْلَ أَنْ نَبِيعَهُ. يَعْنِى (نشتريه) جُزَافًا. |

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی:

ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خۆراکمان دەکڕی. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ دەکردین لەو شوێنەی کە کڕیومانە بیگوێزینەوە بۆ جێگایەکی تر پێش ئەوەی بیفرۆشین. واتە بەگۆترە.

٣٤٩٤ - (صحيح) عن ابن عمر قال: كَانُوا يَتَبَايَعُونَ الطَّعَامَ جُزَافًا بِأَعْلَى السُّوقِ. فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعُوهُ حَتَّى يَنْقُلُوهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جاران ئەوان لەسەروی بازاڕەوە خۆراکیان بەگۆترە دەکڕی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی لێ کردن کە بیفرۆشن هەتا لەو شوێنە نەیگوێزنەوە بۆ جێگایەکی تر.

٣٤٩٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَبِيعَ أَحَدٌ طَعَامًا اشْتَرَاهُ بِكَيْلٍ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە. کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەکەسێ خواردنێ بفرۆشێ لە کاتێکدا کە لە کەسێکی تری بە کیلۆ کڕیبێت هەتا بەتەواوی وەری نەگرێت.

٣٤٩٦ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ). زَادَ أَبو بَكْرٍ, قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: لِمَ؟ قَالَ: أَلاَ تَرَى أَنَّهُمْ يَتَبَايَعُونَ بِالذَّهَبِ وَالطَّعَامُ مُرَجًّى.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خۆراکێکی کڕی نەیفرۆشێت بە کەسێکی تر هەتا بە کێشانە بەتەواوی وەری دەگرێت). ئەبو بەکر ئەمەی بۆ زیاد کرد، (طاوس) وتی: وتم بە ئیبنو عەباس: بۆچی؟

وتی: ئایا نابینی دەیکڕن بە زێڕ، لەکاتێکدا کە خۆراکەکە دواخراوە.

٣٤٩١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: إِذَا اشْتَرَى أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ). قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ: (حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ). زَادَ مُسَدَّدٌ قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَحْسِبُ أَنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِثْلُ الطَّعَامِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خۆراکێکی کڕی نەیفرۆشێت بە کەسێکی تر هەتا بەتەواوی وەریدەگرێت). سولەیمانی کوڕی حەرب وتی: (حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ). موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: ئیبنو عەباس وتی: پێم وایە هەموو شتێك وەك خۆراکە.

٣٥٩٨ - (صحيح) عن ابن عمر قال: رَأَيْتُ النَّاسَ يُضْرَبونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اشْتَرَوُا الطَّعَامَ جُزَافًا أَنْ يَبِيعُوهُ حَتَّى يُبْلِغَهُ إِلَى رَحْلِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم خەڵکم دەبینی چاودێرەکانی بازاڕ لێیان دەدان کاتێ کە خۆراکیان بەگۆترە بکڕیایەو بیانفرۆشتایەتەوە پێش ئەوەی بیانگەیاندایەتە لای وڵاخەکەیان واتە دەبووایە لەو جێگایە بیانگواستایەتەوە.

## باسى سەبارەت بە پياوێ كاتێ كە شتێ دەفرۆشێ بڵێ: بە بێ گزى و فرِوفێڵ.

## ٦٨ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ فِي الْبَيْعِ لاَ خِلاَبَةَ.

٣٥٠٠ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبَيْعِ, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ لاَ خِلاَبَةَ). فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لاَ خِلاَبَةَ.

واتە: لە ئيبنو عومەرەوە رەزاى خوايان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پياوێ باسى كرد بۆ پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم كە لە سەوداو مامەڵەدا گزى و فرِوفێڵى لێ دەكرێ، پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پێى فەرموو: (كاتێ كە شتێ دەفرۆشيت بڵێ: بە بێ گزى و فرِوفێڵ). ئيتر پياوەكە كاتێ كە شتێكى دەفرۆشت دەيوت: بە بێ گزى و فرِوفێڵ.

٣٥٠١ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبْتَاعُ وَفِي عُقْدَتِهِ ضَعْفٌ, فَأَتَى أَهْلُهُ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ, احْجُرْ عَلَى فُلاَنٍ فَإِنَّهُ يَبْتَاعُ وَفِي عُقْدَتِهِ ضَعْفٌ! فَدَعَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَهَاهُ عَنِ الْبَيْعِ, فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنِّي لاَ أَصْبِرُ عَنِ الْبَيْعِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ كُنْتَ غَيْرَ تَارِكٍ الْبَيْعَ فَقُلْ هَاءَ وَهَاءَ وَلاَ خِلاَبَةَ).

واتە: لە ئەنەسى كورِى ماليكەوە دەگێرنەوە، كە پياوێ لەسەردەمى پێغەمبەرى خوادا صلى الله عليه وسلم عەقڵ و زمانى لاواز بوو لە سەوداو مامەڵەكەيد بەرژەوەندى خۆى لەبەرچاو نەدەگرت دا، كەسوكارەكەى هاتنە خزمەت پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم وتيان: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى

ـلە علیه وسلم مەیەڵە فلان کەس سەوداو مامەڵە بکات ڕێگری لێ بکە ـەبەرئەوەی عەقڵ و زمانی لاوازە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ـنگی کردو سەوداو مامەڵەی لێ قەدەغەکرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر سەوداو مامەڵە نەکەم خۆم ناگرم و ئارامم نیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر هەر وازناهێنیت لە سەوداو مامەڵەدا بڵێ ها ئەوە بەوەندە شتەکەی بدەرێ و پارەکە وەربگرە بە بێ گزی و فڕوفێڵ واتە دەست بەدەست سەوداو مامەڵە بکە).

## باسی سەبارەت بە بەخشش(عربان) [1].

## ٦٩ - باب فِى الْعُرْبَانِ.

٣٥٠٢ - (ضعيف) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ. قَالَ مَالِكٌ: وَذَلِكَ - فِيمَا نَرَى, وَاللَّهُ أَعْلَمُ - أَنْ يَشْتَرِىَ الرَّجُلُ الْعَبْدَ أَوْ يَتَكَارَى الدَّابَّةَ, ثُمَّ يَقُولُ: أُعْطِيكَ دِينَارًا عَلَى أَنِّى إِنْ تَرَكْتُ السِّلْعَةَ أَوِ الْكِرَاءَ فَمَا أَعْطَيْتُكَ: لَكَ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەخشینی مامەڵە(عربان). مالیك وتی: لەبەرئەوە - ئێمەش پێمان وابوو، خوای پەروەردگار خۆی باش دەیزانێت - پیاوێ بەندەیە بکڕێ یان وڵاخێ بەکرێ بگرێت لەپاشدا بڵێ: دینارێکت دەدەمێ لەسەرئەوەی ئەگەر ویستم باقی پارەکەی ترت دەدەمێ ئەگەر نەمویست دینارەکە بۆ خۆت.

---

(١) عربان: بریتیە لەوەی کە شتێکی پێ بفرۆشێت لەبەرامبەر پێدانی بەشێك لە نرخەکەی, وەك دیاری بێت بۆ فرۆشیار ئەگەر مامەڵەکەی سەری نەگرت, ئەگەر ئەنجامیشدرا ئەوا لەنرخەکە دەژمێرێت, ئەمەش نەهی لێ کراوە.

## باسی سەبارەت بە پیاوێ شتێ بفرۆشێ کە لەلای نەبێت.

## ٧٠ - باب فِي الرَّجُلِ يَبِيعُ مَا لَيْسَ عِنْدَهُ.

٣٥٠٣ - (صحيح) عن حكيم بن حزام قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ, يَأْتِينِى الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّى الْبَيْعَ لَيْسَ عِنْدِى, أَفَأَبْتَاعُهُ لَهُ مِنَ السُّوقِ؟ فَقَالَ: (لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ

واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێ دێتە لام و داوام لێ دەکات شتێکی پێ بفرۆشم کە ئێستا لەلام نیە، ئایا لە بازاڕ بۆی بکڕم؟ فەرمووی: (شتێ مەفرۆشە کە لەلات نیە).

٣٥٠٤ - (حسن صحيح) عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ, وَلاَ شَرْطَانِ فِى بَيْعٍ, وَلاَ رِبْحُ مَا لَمْ تَضْمَنْ, وَلاَ بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕەوا نیە سەلەم و مامەڵە بەیەکەوە - بۆ نمونە کەسێ بڵێ ئەم بەندەت پێ دەفرۆشم بە پەنجا هەزار درهەم بەو مەرجەی کە سەد هەزار درهەمم پێ بدەیت بە سەلەم -، دوو مەرج لەیەك مامەڵەدا ڕەوا نیە، ڕەوا نیە سودی شتێك زامنی نەبێ - وەك ئەوەی ماڵێ لە کەسێك بکڕیت پێش ئەوەی وەری بگریت بیفرۆشی بە کەسێکی تر -، ڕەوا نیە فرۆشتنی ئەو شتەی کە لات نەبێ و نەتوانی تەسلیمی بکەیت).

## باسی سەبارەت بە مەرج دانان لە کڕین و فرۆشتندا.

## ٧١ - باب فِي شَرْطٍ فِي بَيْعٍ.

٣٥٠٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: بِعْتُهُ - يَعْنِى بَعِيرَهُ - مِنَ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاشْتَرَطْتُ حُمْلاَنَهُ إِلَى أَهْلِى، قَالَ فِى آخِرِهِ: (تُرَانِى إِنَّمَا مَاكَسْتُكَ لأَذْهَبَ بِجَمَلِكَ خُذْ جَمَلَكَ وَثَمَنَهُ فَهُمَا لَكَ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وشترەکەم فرۆشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە مەرجێ سواری ببم هەتا دەگەمەوە ناو ماڵ و منداڵم واتە هەتا دەگەمەوە شاری مەدینە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەرجەکەی قبووڵ کرد، لە کۆتایی دا راوی وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پێت وا بوو بۆیە سەوداو مامەڵەم لەگەڵ کردی بۆ ئەوەی وشترەکەتم بە هەرزان دەست بکەوێت وشترەکەش و نرخ و بەهاکەشی بۆ خۆت).

## باسی سەبارەت بە دەرکەوتنی عەیبی کۆیلە.

## ٧٢ - باب فِي عُهْدَةِ الرَّقِيقِ.

٣٥٠٦ - (ضعيف) عن عقبة بن عامر: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (عُهْدَةُ الرَّقِيقِ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەرکەوتنی عەیبی بەندە لەماوەی سێ رۆژدا کڕیار بۆی هەیە بەبێ بەڵگە بیگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە پێی فرۆشتوە بەبێ بەڵگە). - پێشەوا (خطابی) دەڵێت: بریتیە لەوەی کەسێ بەندەیە

یان کەنیزەکێ بکڕێت فرۆشیارەکە مەرجی لەگەڵ نەکات کە بێ عەیبە، ئەگەر کڕیارەکە لەماوەی سێ ڕۆژدا هەر عەیبەیەکی بۆ دەرکەوت لەو بەندەدا ئەگەر ویستی ئەوە دەتوانێ بیداتەوە بەو کەسەی کە پێی فرۆشتوە بەبێ بەڵگە، بەڵا لەدوای سێ ڕۆژ هەر عەیبەیەکی بۆ دەرکەوت لەو بەندەدا ئەوە ناتوانێ بۆی بگێڕێتەوە بەبێ بەڵگە .

٣٥٠٧ - (ضعيف) عن قتادة, بإسناده ومعناه، زاد: إِنْ وَجَدَ دَاءً فِي الثَّلَاثِ اللَّيَالِي رُدَّ بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ, وَإِنْ وَجَدَ دَاءً بَعْدَ الثَّلَاثِ كُلِّفَ الْبَيِّنَةَ أَنَّهُ اشْتَرَاهُ وَبِهِ هَذَ الدَّاءُ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: هَذَا التَّفْسِيرُ مِنْ كَلَامِ قَتَادَةَ.

واتە: لە قەتادەوە فەرموودەی پێشو هاتوە بە هەمان سەنەدو مانا، ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەگەر کڕیار لەماوەی سێ شەودا نەنگیە یان هەر دەردێکی بۆ دەرکەوت لەو بەندەدا ئەوە دەتوانێ بۆی بگێڕێتەوە بەبێ بەڵگە، بەڵام ئەگەر لەدوای سێ ڕۆژ بۆی دەرکەوت ئەوە داوای بەڵگەی لێ دەکرێت هەرچەند لەوکاتەشدا کە کڕیویەتی ئەو عەیبەی هەبوبێت. ئەبو داود دەڵێت: ئەم ڕاڤەیە قسەی قەتادەیە.

## باسی سەبارەت بەو کەسەی کە کۆیلەیە دەکڕێت بەکاری دەهێنێ لەپاشدا عەیبێکی لە بەندەکەدا بۆ دەردەکەوێت.

## ٧٣ - باب فِيمَنِ اشْتَرَى عَبْدًا فَاسْتَعْمَلَهُ ثُمَّ وَجَدَ بِهِ عَيْبًا.

٣٥٠٨ - (حسن) عن عائشة رضى الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سودو دەستکەوتی فرۆشراو بۆ کڕیارە، لەوماوەیەدا کە لەلایەتی لەپێش پەشیمان بوونەوەدا لەجیاتی دەستەبەری، چونکە کڕیار لەو ماوەیەدا دەستەبەرە).

٣٥٠٩ - (حسن) عن مخلد بن خفاف الغفاري قال: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ أُنَاسٍ شَرِكَةٌ فِي عَبْدٍ فَاقْتَوَيْتُهُ وَبَعْضُنَا غَائِبٌ, فَأَغَلَّ عَلَيَّ غَلَّةً, فَخَاصَمَنِي فِي نَصِيبِهِ إِلَى بَعْضِ الْقُضَاةِ, فَأَمَرَنِي أَنْ أَرُدَّ الْغَلَّةَ, فَأَتَيْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ فَحَدَّثْتُهُ, فَأَتَاهُ عُرْوَةُ فَحَدَّثَهُ عَنْ عَائِشَةَ عَلَيْهَا السَّلاَمُ, عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ).

واتە: لە موخەلەدی کوڕی خوفاف غیفاری دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەنێوان من و چەند کەسانێکدا بەندەیەکمان هەبوو بە شەریکی کارم پێ دەکرد، شەریکەکانم غائب بوون، قازانج و سودێکم لێی دەستکەوت، شەریکەکەم شکاتی لێ کردم لەلای قازیان داوای بەشی خۆی کرد لەو قازانج و دەستکەوتە، قازی فەرمانی پێ کردم کە بەشی خۆی بدەمێ، چوم بۆلای عوروەی کوڕی زوبێر بەسەرهاتەکەم بۆ باسکرد، شەریکەکەم هات بۆلای عوروە، عوروە لە عائیشەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ئەم فەرموودەی بۆ گێڕایەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سودو دەستکەوتی فرۆشراو بۆ کڕیارە، لەوماوەیەدا کە لەلایەتی لەپێش پەشیمان بوونەوەدا لەجیاتی دەستەبەری، چونکە کڕیار لەو ماوەیەدا دەستەبەرە).

٣٥١٠ - (حسن بما قبله) عن عائشة رضى الله عنها قالت: أَنَّ رَجُلاً ابْتَاعَ غُلاَمًا فَأَقَامَ عِنْدَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يُقِيمَ, ثُمَّ وَجَدَ بِهِ عَيْبًا, فَخَاصَمَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَرَدَّهُ عَلَيْهِ, فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدِ اسْتَغَلَّ غُلاَمِي, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ بەندەیەکی کڕی ئەوەندەی خوای پەروەردگار بیەوێت لەلای مایەوە، لەپاشدا نەنگیەکی بۆ دەرکەوت لە بەندەکەدا، سکاڵای بردە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بەندەکەی عەیبدارە، بەندەکەی گێڕایەوە بۆ فرۆشیارەکە، پیاوەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سودو قازانجی لەو بەندەیەی من دەستکەوتوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سودو دەستکەوتی فرۆشراو بۆ کڕیارە، لەوماوەیەدا کە لەلایەتی لەپێش پەشیمان بوونەوەدا لەجیاتی دەستەبەری، چونکە کڕیار لەو ماوەیەدا دەستەبەرە).

## باسی سەبارەت بە ئەگەر جیاوازی هەبوو لە نێوان کڕیارو فرۆشیاردا لەسەر نرخی فرۆشراوێك، فرۆشراوەکە ئامادە بێت.

## ٧٤- باب إِذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعَانِ وَالْمَبِيعُ قَائِمٌ.

٣٥١١ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن قيس بن محمد بن الأشعث, عن أبيه, عن جده قال: اشْتَرَى الأَشْعَثُ رَقِيقًا مِنْ رَقِيقِ الْخُمُسِ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بِعِشْرِينَ أَلْفًا, فَأَرْسَلَ عَبْدُ اللَّهِ إِلَيْهِ فِي ثَمَنِهِمْ, فَقَالَ: إِنَّمَا أَخَذْتُهُمْ بِعَشَرَةِ آلاَفٍ, فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَاخْتَرْ رَجُلاً يَكُونُ بَيْنِي وَبَيْنَكَ, قَالَ الأَشْعَثُ: أَنْتَ بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِكَ, قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعَانِ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ فَهُوَ مَا يَقُولُ رَبُّ السِّلْعَةِ, أَوْ يَتَتَارَكَانِ).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی قەیسی کوڕی موحەممەدی کوڕی (أشعث) وە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (أشعث) بەندەیەکی لە دیلەکانی ناو پێنج یەك کڕی لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعود بە بیست هەزار. (عبد الله) پیاوێکی نارد بۆلای (أشعث) بۆ پارەکە، (أشعث) وتی: من بە

دە هەزار لێم کڕیوی، (عبد الله) وتی: پیاوێ هەڵبژێرە با بکەوێتە نێوانمان، (أشعث) وتی: تۆ لەنێوان من خۆتدا - حەکەم - بە، (عبد الله) وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەگەر کڕیارو فرۆشیار قسەیان یەك نەبوو، جیاوازی هەبوو لە نێوانیاندا لەسەر نرخی فرۆشراوێك، کەسیشیان بەڵگەی نەبوو، ئەوە قسە قسەی خاوەن کاڵاو کەلوپەلە، یان ئەوتا واز لەو سەوداو مامەڵەیە دێنن).

٣٥١٢ - (صحيح) عن عبد الرحمن, عن أبيه: أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ بَاعَ مِنَ الأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ رَقِيقًا, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ, وَالْكَلاَمُ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (عبد الله)ی کوڕی مەسعود بەندەیەکی لە دیلەکانی ناو پێنج یەك فرۆشت بە (أشعث)ی کوڕی قەیس، راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، ئەوەندە هەیە زیادو کەمی تێدا دەکرا.

## باسی سەبارەت بە هەڵگرتنەوە(شوفعە) [1].

## ٧٥ - باب فِي الشُّفْعَةِ.

٣٥١٣ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الشُّفْعَةُ فِي كُلِّ شِرْكٍ: رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ, لاَ يَصْلُحُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ, فَإِنْ بَاعَ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ حَتَّى يُؤْذِنَهُ).

---

(١) (شفعة) بریتیە لە هەقی شەریك لەبەشە شەریکایەتیەکەیدا ئەگەر شەریکەکەی فرۆشتی بە کەسێکی تر, بۆ نمونە ئەگەر دوو کەس باخێکیان هەبوو بە شەریکی یەکێکیان ویستی بەشەکەی خۆی بفرۆشێ ئەوە پێویستە شەریکەکەی ئاگادار بکاتەوەو بەبێ پرس و ڕەزامەندی ئەو نەیفرۆشێت, چونکە ئەو شایستەترە بە هەڵگرتنەوەی لە کەسانی تر.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك شەریکێکی هەبوو لە خانویەرەو زەویکدا یان لە باخ و باخاتێکدا ئەوە دروست نیە بۆ هاوبەش بەشەکەی خۆی بفرۆشێت هەتا پرس نەکات بە شەریکەکەی و ئاگاداری نەکاتەوەو مۆڵەتی لێ وەرنەگرێت، ج ئەگەر فرۆشتی ئەوا شەریکەکەی شایستەترە بە هەڵگرتنەوەی ئەگەر بیەوێت).

٣٥١٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: إِنَّمَا جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ, فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شوفعەی داناوە لەهەموو شتێکی هاوبەشی بەش نەکراودا. بەڵام هەرکاتێ بەشکراو سنوریان دیاریکراو جیاکرایەوەو ڕێگاکانی چونە ناوی گۆڕرا ئیتر مافی هەڵگرتنەوە(شفعە)ی بەسەرەوە نامێنێ.

٣٥١٥ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِذَا قُسِّمَتِ الأَرْضُ وَحُدَّتْ فَلاَ شُفْعَةَ فِيهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر زەویە بەش کراو هەرکەس سنوری بەشەکەی خۆی زانی و بەشی خۆی برد ئیتر ئەو زەوی یە مافی هەڵگرتنەوە(شفعە)ی بەسەرەوە نامێنێت).

٣٥١٦ - (صحيح) عن أبو رافع قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ).

واتە: لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی

ـە عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (دراوسێ لەپێشترە بۆ لاتەنیشتی خۆی هەتا کەسانی تر).

٣٥١١ - (صحيح) عن سمرة: عن النبي قال (جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِدَارِ الْجَارِ أَوِ الأَرْضِ).

واتە: لە سەمورەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم بوو دەیفەرموو: (دراوسێی خانو شایستەترە بە خانوی دراوسێ یان زەوی).

٣٥١٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ: يُنْتَظَرُ بِهَا وَإِنْ كَانَ غَائِبًا, إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دراوسێ شایستەترە بە هەڵگرتنەوە (شفعە)ی شتی دراوسێکەی، ئەگەر لەو کاتەدا ئامادە نەبوو دەبێ چاوەڕوانی بکرێت هەتا ئامادە دەبێ بەمەرجێ ڕێگەی هەردوولا یەك بێت).

## باسی سەبارەت بە کەسێ موفلیس بێ پیاوێ خودی کەلوپەلەکەی خۆی بدۆزێتەوە لەلای شایستەترە بە کەلوپەلەکەی لە کەسانی تر.

## ٧٦ - باب فِي الرَّجُلِ يُفْلِسُ فَيَجِدُ الرَّجُلُ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَهُ.

٣٥١٩ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَيُّمَا رَجُلٍ أَفْلَسَ فَأَدْرَكَ الرَّجُلُ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەركەس شتێكی خۆی دۆزیەوە لای موفلیسێك ئەوە لەهەموو كەس لەپێشترە بۆ ئەو شتە).

٣٥٢٠ - (صحيح) عن أبو بكر بن عبد الرحمن بن الحارث بن هشام: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم فذكر معنى حديث مالك, زاد: (أَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ مَتَاعًا فَأَفْلَسَ الَّذِى ابْتَاعَهُ وَلَمْ يَقْبِضِ الَّذِى بَاعَهُ مِنْ ثَمَنِهِ شَيْئًا, فَوَجَدَ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ: فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ, وَإِنْ مَاتَ الْمُشْتَرِى فَصَاحِبُ الْمَتَاعِ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ).

واتە: لە ئەبو بەكری كوڕی (عبد الرحمن)ی كوڕی (حارث)ی كوڕی هیشامەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی. جا راوی فەرموودەكەی پێشوی مالیكی بە هەمان مانا گێڕایەوە، ئەمەی بۆ زیاد كرد: (هەركەس شتێكی فرۆشت بە كەسێكی تر هیچ شتێك لەپارەكەی وەرنەگرتبوو، ئەو كەسەی كە پێی فرۆشتوە ئیفلاسی كرد، خودی كەلوپەلەكەی خۆی دۆزیەوە لەلای ئەوە لەهەموو كەس لەپێشترە بۆ ئەو كەلوپەلە، ئەگەر موشتەریەكە وەفاتی كرد ئەوە خاوەنی كەلوپەلەكە وەك خاوەن قەرزەكانە).

٣٥٢١ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, نحوه, قال: (فَإِنْ كَانَ قَضَاهُ مِنْ ثَمَنِهَا شَيْئًا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ, وَأَيُّمَا امْرِئٍ هَلَكَ وَعِنْدَهُ مَتَاعُ امْرِئٍ بِعَيْنِهِ اقْتَضَى مِنْهُ شَيْئًا أَوْ لَمْ يَقْتَضِ فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: حَدِيثُ مَالِكٍ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم، فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە دەگێڕنەوە، فەرمووی: (ئەگەر شتێكی لە نرخەكەی دابوویە ئەوەی كە ماوەتەوە لەوەدا وەك خاوەن قەرزەكانە، هەركەس تیاچو مرد خودی كەلوپەلی كەسێكی لەلا بوو، شتێكی لەنرخەكەی دابوو بەو كەسە یان شتێكی لەنرخەكەی پێ نەدابوو ئەوە وەك خاوەن قەرزەكانە). ئەبو داود دەڵێت:

فەرموودەکەی مالیك واتە فەرموودەی پێشو صەحیح ترە.

٣٥٢٢ - (صحيح) عن أبو بكر بن عبد الرحمن بن الحارث بن هشام: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم, فذكر معنى حديث مالك, زاد: (وَإِنْ قَضَى مِنْ ثَمَنِهَا شَيْئًا فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ فِيهَا).

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی (عبد الرحمن)ی کوڕی (حارث)ی کوڕی هیشامەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی مالیك، ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەگەر شتێکی لە نرخەکەی دابوویە ئەوە وەك خاوەن قەرزەکانە).

٣٥٢٣ - (ضعيف) عن عمر بن خلدة قال: أَتَيْنَا أَبَا هُرَيْرَةَ فِي صَاحِبٍ لَنَا أَفْلَسَ, فَقَالَ لأَقْضِيَنَّ فِيكُمْ بِقَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَفْلَسَ أَوْ مَاتَ فَوَجَدَ رَجُلٌ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ).

واتە: لە عومەری کوڕی خەلدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هاوڕێیەکمان ئیفلاسی کردو نابووت بوو چوین بۆ خزمەت ئەبو هورەیرە لەوبارەوە قسەمان لەگەڵ کرد وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن حوکمی کردوە لەو بارەوە منیش بەو شێوەیە کێشەکەتان بۆ چارەسەر دەکەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ ئیفلاسی کرد یان وەفاتی کرد پیاوێ خودی کەلوپەلەکەی خۆی دۆزیەوە لەلای ئەوە لەهەموو کەس لەپێشترە بۆ ئەو کەلوپەلە).

## باسی سەبارەت بەو کەسەی وڵاخێکی پەککەوتەی بەرەڵا بژێنێتەوە واتە ئاو و ئاڵفی بداتێ و خزمەتی بکات.

## ٧٧ - باب فِيمَنْ أَحْيَا حَسِيرًا.

٣٥٢٤ - (حسن) عن عامر الشعبي: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ وَجَدَ دَابَّةً قَدْ عَجَزَ عَنْهَا أَهْلُهَا أَنْ يَعْلِفُوهَا فَسَيَّبُوهَا فَأَخَذَهَا فَأَحْيَاهَ فَهِيَ لَهُ).

واتە: لە عامیری شەعبییەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس وڵاخێکی پەککەوتەی دۆزیەوە خاوەنەکەی نەیدەتوانی خزمەتی بکات و بەرەڵای کردبوو، بیبات ئاو و ئاڵفی بداتێ و خزمەتی بکات و بیژێنێتەوە ئەوە ئەو وڵاخە بۆ ئەو کەسەیە).

٣٥٢٥ - (حسن) عن الشعبي عن النبي صلى الله عليه وسلم قال:(مَنْ تَرَكَ دَابَّةً بِمُهْلِكٍ فَأَحْيَاهَا رَجُلٌ فَهِيَ لِمَنْ أَحْيَاهَا).

واتە: لە شەعبییەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس وڵاخێکی بەرەڵا کرد لەشوێنێکدا ئەگەری ئەوەی هەبوو لەناوبچێ و خزمەتی نەدەکرد پیاوێ ئاو و ئاڵفی بداتێ و خزمەتی بکات و بیژێنێتەوە ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە دەیژێنێتەوە).

# باسی سەبارەت بە رەهن.

## ٧٨ - باب فِي الرَّهْنِ.

٣٥٢٦ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لَبَنُ الدَّرِّ يُحْلَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا, وَالظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا, وَعَلَى الَّذِى يَرْكَبُ وَيَحْلِبُ النَّفَقَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شیری شیرداری دەخورێتەوە لەجیاتی خەرجیەکەیدا، وڵاخی سواری لەبارمتەدا سواربوونی دروستە لەجیاتی خەرجیەکەیدا، پێویستە لەسەر ئەوکەسەی کە سواری دەبێ و شیری دەخوات خەرجی بدات).

٣٥٢٧ - (صحيح لغيره) عن عمر بن الخطاب قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ لأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ؟ قَالَ: (هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ وَلاَ أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا, فَوَاللَّهِ إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ, وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ: لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ, وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ). وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەناو بەندەکانی خوای گەورەدا خەڵکانێك هەن نە پێغەمبەرن نەشەهیدن کەچی پێغەمبەران و شەهیدەکان خۆزگەیان پێ ئەخوازن لەڕۆژی قیامەتدا لەبەر شوێنەکانیان لای خوای بەرزی شکۆمەند)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه

وسلم هەواڵمان بدەرێ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: (کەسانێکن لەبەر خوای گەورە یەکتریان خۆش دەوێت بەبێ ئەوەی خزمایەتیان هەبێت یان ماڵ و سامانیان دابێت بەیەك، سوێند بە (الله) ئەوانە سەروچاویان نورە، وە لەسەر نورن، ئەو کاتەی کە خەڵك ترسی لێ دەنیشێت ئەوان ناترسن، ئەو کاتەی خەڵك غەم و پەژارە دایان دەگرێت ئەوان بێ غەم و پەژارەن). جا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾.سورة یونس: ٦٢. واتە: بەڕاستی دۆستەکانی خوای گەورە نە ترسیان هەیە نە پەژارە.

## باسی سەبارەت بە پیاوێ لە ماڵ و سامانی کوڕەکەی بخوات.

## ٧٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَأْكُلُ مِنْ مَالِ وَلَدِهِ.

٣٥٢٨ - (صحيح) عن عمارة بن عمير, عن عمته, أنها سألت عائشة رضي الله عنها: فِي حِجْرِي يَتِيمٌ أَفَآكُلُ مِنْ مَالِهِ؟ فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْ أَطْيَبِ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ: مِنْ كَسْبِهِ, وَوَلَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ).

واتە: لە عومارەی کوڕی عومەیرەوە، لە پوورێکیەوە دەگێرنەوە، کە لە عائیشەی ڕەزای خوای لێ بێ پرسیوە وتویەتی: هەتیوێك لەکۆشی مندایە ئایا لە ماڵ و سامانەکەی بخۆم؟ عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پاکترین شتێك کە مرۆڤ بیخوات: شتێکە کە بە ڕەنجی شانی خۆی و بەدەست و بازووی خۆی پەیدای کردبێت، نەوەو منداڵەکانیشی بەرهەمی دەستی خۆیەتی).

٣٥٢٩ - (حسن صحيح) عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (وَلَدُ الرَّجُلِ مِنْ كَسْبِهِ, مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِهِ, فَكُلُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ). قَالَ أَبو دَاوُدَ, حَمَّادُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ زَادَ فِيهِ (إِذَا احْتَجْتُمْ). وَهُوَ مُنْكَرٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەوەو منداڵەکانی پیاوێ لە بەرهەمی دەستی خۆیەتی، لە پاکترین بەرهەمی دەستی خۆیەتی، لە ماڵ و سامانەکانیان بخۆن). شتێك کە مرۆڤ بیخوات: شتێکە کە بە ڕەنجی شانی خۆی و بەدەست و بازووی خۆی پەیدای کردبێت، نەوەو منداڵەکانیشی بەرهەمی دەستی خۆیەتی). ئەبو داود دەڵێت: حەممادی کوڕی ئەبوو سولەیمان لەپاش (فَكُلُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ) ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەگەر پێویستتان پێی هەبوو موحتاج بوون)، ئەمەش (منكر)ە.

٣٥٣٠ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي مَالاً وَوَلَدًا, وَإِنَّ وَالِدِي يَجْتَاحُ مَالِي, قَالَ: (أَنْتَ وَمَالُكَ لِوَالِدِكَ, إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ, فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلاَدِكُمْ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماڵ و سامان و نەوەو منداڵم هەیە بەڵام باوکم پێویستی بە ماڵ و سامانەکەی منە، فەرمووی: (خۆت و ماڵ و سامانەکەشت هی باوکتن، نەوەو منداڵەکانتان لە پاکترین بەرهەمی دەستی خۆتانە، لە ماڵ و سامانی نەوەو منداڵەکانتان بخۆن).

## باسی سەبارەت بە کەسێ شتی خۆی لای کەسێك بینی.

## ٨٠ - باب فِي الرَّجُلِ يَجِدُ عَيْنَ مَالِهِ عِنْدَ رَجُلٍ.

٣٥٣١ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ وَجَدَ عَيْنَ مَالِهِ عِنْدَ رَجُلٍ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ, وَيَتَّبِعُ الْبَيِّعُ مَنْ بَاعَهُ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خو صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ شتی خۆی لای کەسێك بینی ئەو، ئەو شایستەترە بەو شتە لە کەسانی تر و مافی گێڕانەوەی هەیە، کڕیارەکەش نرخەکەی لە فرۆشیار بسەنێتەوە).

## باسی سەبارەت بە کەسێ هەقی خۆی هەڵگرێت لەو شتەی کە لەژێردەستیدایە.

## ٨١ - باب فِي الرَّجُلِ يَأْخُذُ حَقَّهُ مِنْ تَحْتِ يَدِهِ.

٣٥٣٢ - (صحيح) عن عائشة: أَنَّ هِنْدًا أُمَّ مُعَاوِيَةَ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ, وَإِنَّهُ لاَ يُعْطِينِى مَا يَكْفِينِى وَبَنِىَّ, فَهَلْ عَلَىَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ شَيْئًا؟ قَالَ (خُذِى مَا يَكْفِيكِ وَبَنِيكِ بِالْمَعْرُوفِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە هیندی دایکی موعاویە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕژدو پیسکەیە ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات. ئایا گوناهم ناگات ئەوەندە شتی لێ ببەم بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات؟ فەرمووی: (بەشی خۆت و منداڵەکانت هەڵگرە بەپێی دەستوری ئەو خەڵکە ئەو خەڵکە چۆن دەژین بەو شێوەیە).

٣٥٣٣ - (صحيح) عن عائشة قالت: جَاءَتْ هِنْدٌ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مُمْسِكٌ, فَهَلْ عَلَىَّ مِنْ حَرَجٍ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى عِيَالِهِ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ؟ فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ حَرَجَ عَلَيْكِ أَنْ تُنْفِقِى عَلَيْهِمْ بِالْمَعْرُوفِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی هیند هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەبوو سوفیان پیاوێکی رژدو گیرە، ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، ئایا گوناهم ناگات بە نهێنی لە ماڵ و سامانەکەی سەرف بکەم بۆ خاوخێزان و منداڵەکانی؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (گوناهت ناگات بەپێی دەستوری ئەو خەڵکە ئەو خەڵکە چۆن دەژین بەو شێوەیە).

٣٥٣٤ - (صحيح) عن يوسف بن ماهك المكي قال: كُنْتُ أَكْتُبُ لِفُلاَنٍ نَفَقَةَ أَيْتَامٍ كَانَ وَلِيَّهُمْ, فَغَالَطُوهُ بِأَلْفِ دِرْهَمٍ, فَأَدَّاهَا إِلَيْهِمْ, فَأَدْرَكْتُ لَهُمْ مِنْ مَالِهِمْ مِثْلَيْهَا, قَالَ: قُلْتُ: أَقْبِضُ الأَلْفَ الَّذِى ذَهَبوا بِهِ مِنْكَ؟ قَالَ: لاَ, حَدَّثَنِى أَبِى أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ, وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ).

واتە: لە یوسوفی کوڕی ماهەکی مەککیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خەرجی هەتیوانم دەنوسی بۆ فڵان کەس کە ئەو سەرپەرشیاریان بوو، هەزار درهەمی بە هەڵە دا بە هەتیوەکان، ئەوەندە یان دوو ئەوەندە ماڵ و سامانی هەتیوەکان کەوتە ژێردەستم، یوسوف وتی: وتم: ئەو هەزار درهەمەت کە رۆشتوە هەڵی بگرمەوە؟ وتی: نەخێر، لەبەرئەوەی باوکم بۆی گێڕامەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو سپاردەیەی کە لات دانراوە بیدەرەوە بە خاوەنی، ناپاکی مەکە لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ناپاکیت بەرامبەر دەکات).

٣٥٣٥ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ, وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو سپاردەیەی کە لات دانراوە بیدەرەوە بە خاوەنی، ناپاکی مەکە لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ناپاکیت بەرامبەر دەکات).

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی دیاریەکان.

## ٨٢ - باب فِي قَبوولِ الْهَدَايَا.

٣٥٣٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دیاری وەرگرتوەو پاداشتی داوەتەوە.

٣٥٣٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (وَايْمُ اللَّهِ لاَ أَقْبَلُ بَعْدَ يَوْمِى هَذَا مِنْ أَحَدٍ هَدِيَّةً إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مُهَاجِرًا قُرَشِيًّا, أَوْ أَنْصَارِيًّا, أَوْ دَوْسِيًّا أَوْ ثَقَفِيًّا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) لە ئەمڕۆ بەدواوە دیاری لە هیچ کەسێك وەرناگرم مەگەر ئەو کەسە لە کۆچەرانی قورەیشی بێت، یان لە (ئەنصار، یاریدەدان بێت، یان دەوسی بێت یا لە هۆزی سەقەفی (ثقفی) بێت).

## باسی سەبارەت بە پاشگەزبوونەوەو گێڕانەوەی دیاری و بەخشش.

## ٨٣ - باب الرُّجُوعِ فِي الْهِبَةِ.

٣٥٣٨ - (صحيح) عن ابن عباس: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ, كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ). قَالَ هَمَّامٌ وَقَالَ قَتَادَةُ وَلاَ نَعْلَمُ الْقَىْءَ إِلاَّ حَرَامًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لە دیاری و بەخششەکەی پەشیمان بێتەوە ئەوە وەکو ئەوکەسە وایە کە بڕشێتەوەو سەرلەنوێ رشانەوەکەی خۆی بخواتەوە).

٣٥٣٩ - (صحيح) عن ابن عمر وابن عباس: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً أَوْ يَهَبَ هِبَةً فَيَرْجِعَ فِيهَا, إلاَّ الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ, وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَأْكُلُ, فَإِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەر و ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رەوا نیە بۆ هیچ کەسێك شتێك ببەخشێ یان بیکاتە دیاری بۆ کەسێك لەپاشدا پاشگەزبێتەوەو لێی وەربگرێتەوە، بێجگە لە بەخشینی باوك لەوەی کە دەیبەخشێ بە کوڕ و نەوەکانی، وێنەی ئەو کەسەی کە شتێك ئەبەخشێ لەپاشدا پاشگەزدەبێتەوەو لێی وەرئەگرێتەوە، وەك سەگێك وایە کە خواردنێ بخوات هەتا تێر ئەخوات ئینجا ئەڕشێتەوە، لەپاشدا رشانەوەکەی خۆی بخواتەوە).

٣٥٤٠ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَثَلُ الَّذِي يَسْتَرِدُّ مَا وَهَبَ كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَقِيءُ فَيَأْكُلُ قَيْئَهُ, فَإِذَا اسْتَرَدَّ الْوَاهِبُ فَلْيُوَقَّفْ فَلْيُعَرَّفْ بِمَا اسْتَرَدَّ ثُمَّ لِيُدْفَعْ إِلَيْهِ مَا وَهَبَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وێنەی ئەو کەسەی لە دیاری و بەخششی خۆی پەشیمان دەبێتەوە لەو کەسەی کە پێی بەخشیوە، وەك سەگێکە کە بڕشێتەوەو رشانەوەکەی خۆی بخواتەوە، جا ئەگەر بەخشەر لە بەخشینی خۆی پاشگەزبوویەوە داوای کرد دیاریەکەی بۆ بگێڕدێتەوە ئەوە دەبێ رابگیرێت و پرسیاری هۆکارەکەی لێ بکرێت کە بۆچی پەشیمان بۆتەوە ئینجا دیاریەکەی بۆ بگێڕدرێتەوە).

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی دیاری لەجیاتی ئەنجامدانی کارێکی پێویست.

## ٨٤ - باب فِي الْهَدِيَّةِ لِقَضَاءِ الْحَاجَةِ.

٣٥٤١ - (حسن) عن أبو أمامة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ شَفَعَ لِأَخِيهِ بِشَفَاعَةٍ فَأَهْدَى لَهُ هَدِيَّةً عَلَيْهَا فَقَبِلَهَا: فَقَدْ أَتَى بَابًا عَظِيمًا مِنْ أَبووابِ الرِّبَا).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە، دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك تکایە بکات بۆ براکەی ئەویش لەسەر ئەوە دیاریەکی پێ بدات دیاریەکە وەربگرێت: ئەوە چوەتە دەرگایەکی گەورە لە دەرگاکانی سوو(ریبا) ).

## باسی سەبارەت بە کەسێ هەندێ لە کوڕەکانی جیابکاتەوە لە بەخشیندا.

## ٨٥- باب فِي الرَّجُلِ يُفَضِّلُ بَعْضَ وَلَدِهِ فِي النُّحْلِ.

٣٥٤٢ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: أَنْحَلَنِي أَبِي نُحْلاً - قَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ سَالِمٍ مِنْ بَيْنِ الْقَوْمِ: نِحْلَةً غُلَامًا لَهُ - قَالَ: فَقَالَتْ لَهُ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: ائتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَشْهِدْهُ, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَشْهَدَهُ, فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ, قَالَ: فَقَالَ له: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي النُّعْمَانَ نُحْلاً وَإِنَّ عَمْرَةَ سَأَلَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ عَلَى ذَلِكَ. قَالَ: فَقَالَ: (أَلَكَ وَلَدٌ سِوَاهُ؟). قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: (فَكُلَّهُمْ أَعْطَيْتَ مِثْلَ مَا أَعْطَيْتَ النُّعْمَانَ؟). قَالَ: لاَ, قَالَ: فَقَالَ بَعْضُ هَؤُلَاءِ الْمُحَدِّثِينَ: (هَذَا جَوْرٌ). وَقَالَ بَعْضُهُمْ: (هَذَا تَلْجِئَةٌ, فَأَشْهِدْ عَلَى

هَذَا غَيْرِي). قَالَ مُغِيرَةُ فِي حَدِيثِهِ: (أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا لَكَ فِي الْبِرِّ وَاللُّطْفِ سَوَاءً؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي). وَذَكَرَ مُجَالِدٌ فِي حَدِيثِهِ: (إِنَّ لَهُمْ عَلَيْكَ مِنَ الْحَقِّ أَنْ تَعْدِلَ بَيْنَهُمْ, كَمَا أَنَّ لَكَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْحَقِّ أَنْ يَبَرُّوكَ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: فِي حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ: قَالَ بَعْضُهُمْ: (أَكُلَّ بَنِيكَ؟). وَقَالَ بَعْضُهُمْ: (وَلَدِكَ؟). وَقَالَ ابْنُ أَبِي خَالِدٍ, عَنِ الشَّعْبِيِّ فِيهِ: (أَلَكَ بَنُونَ سِوَاهُ؟). وَقَالَ أَبو الضُّحَى, عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ: (أَلَكَ وَلَدٌ غَيْرُهُ؟).

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: باوكم بەخششێكی دا بە من - ئیسماعیلی كوڕی سالیم لەناوخەڵكەكەدا وتی: بەخششێكی داوە بە یەكێك لە كوڕكانی - وتی: دایكم عەمرەی كچی ڕەواحە بە باوكمی وت: بچۆ بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیكە بە شاهید لەسەر ئەوەی كە پێت بەخشیوە، باوكم چوە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: من زیادە بەخششێكم داوە بە نوعمانی كوڕم، عەمرەی دایكی داوای لێ كردم تۆ بكەم بە شاهید لەسەری، وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا جگە لەو كوڕی ترت هەیە؟)، وتی: وتم: بەڵێ، فەرمووی: (ئایا بەخششت داوە بە هەموویان وەك چۆن بە نوعمانت داوە؟)، وتی: نەخێر، وتی: هەندێ لە فەرمودەناسان وتیان: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە زوڵم و ستەمە)، هەندێكیان وتیان: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە ستەمە بڕۆ كەسێكی تر بكە بە شاهید لەسەری)، موغیرە لە فەرمودەكەیدا وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا پێت خۆش نیە هەموویان لە چاكەكردن و بەزەیی دا بەرامبەرت یەكسان بن)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (بڕۆ كەسێكی تر بكە بە شاهید لەسەری)، موجالید لە فەرمودەكەیدا باسی ئەوەی كرد وتی: فەرمووی: (ئەوان مافی ئەوەیان هەیە بەسەرتەوە كە دادپەروەر بیت لەنێوانیاندا، هەروەك تۆ مافت هەیە بەسەریانەوە كە چاكەت لەگەڵ بكەن). ئەبو داود لە فەرمودەكەی زوهریدا دەڵێت: هەندێكیان وتیان: (بە هەمان شێوە بەشی هەموو منداڵەكانت داوە؟) هەندێكیان وتیان: (كوڕەكەت)، ئیبنو ئەبو خالید، لە شەعبیەوە گێڕاویەتیەوە تێیدا وتی: پێغەمبەر

صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا جگە لە نوعمان کوڕی ترت هەیە؟)، ئەبو (ضحی) وتی: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتوە: کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (ئایا جگە لە نوعمان منداڵی ترت هەیە؟).

٣٥٤٣ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: أَعْطَاهُ أَبوهُ غُلاَمًا, فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا هَذَا الْغُلاَمُ؟). قَالَ: غُلاَمِى أَعْطَانِيهِ أَبِى, قَالَ: (فَكُلَّ إِخْوَتِكَ أَعْطَى كَمَا أَعْطَاكَ). قَالَ: لاَ, قَالَ: (فَارْدُدْهُ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکی غوڵامێکی بەندەی پێ بەخششی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەم غوڵامە چییە؟)، وتی: غوڵامی خۆمە باوکم پێی بەخشیوم، فەرمووی: (غوڵامی بەخشیوە بە هەموو براکانت وەك چۆن بە تۆی بەخشیوە؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی بۆی بگێڕەرەوە).

٣٥٤٤ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ, اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دادپەروەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا. دادپەروەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا).

٣٥٤٥ - (صحيح) عن جابر قال: قَالَتِ امْرَأَةُ بَشِيرٍ: انْحَلِ ابْنِى غُلاَمَكَ, وَأَشْهِدْ لِى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: إِنَّ ابْنَةَ فُلاَنٍ سَأَلَتْنِى أَنْ أَنْحَلَ ابْنَهَا غُلاَمًا, وَقَالَتْ لِى: أَشْهِدْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (لَهُ إِخْوَةٌ؟). فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَكُلَّهُمْ أَعْطَيْتَ مِثْلَ مَا أَعْطَيْتَهُ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَلَيْسَ يَصْلُحُ هَذَا وَإِنِّى لاَ أَشْهَدُ إِلاَّ عَلَى حَقٍّ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژنەکەی بەشیر وتی: غولامەکەت ببەخشە بە کوڕەکەم و، پێغەمبەری خوداش صلی الله علیه وسلم بکە بە شاهید بۆم لەسەری، بەشیر چوە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: کچی فلانە کەس داوای لێ کردوم غولامێك ببەخشەم بە کوڕەکەی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا برای تری هەیە؟)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئایا غولامت بەخشیوە بە براکانی تری وەك چۆن بەخشوتە بەو؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (ئەوە کارێکی چاك نیە، من شاهیدی نادەم ئیللا بۆ هەق نەبێت).

## باسی سەبارەت بە بەخشینی ژن بەبێ رەزامەندی مێردەکەی.

## ٨٦ - باب فِي عَطِيَّةِ الْمَرْأَةِ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا.

٣٥٤٦ - (حسن صحيح) عن عَمْرو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (لاَ يَجُوزُ لاِمْرَأَةٍ أَمْرٌ فِي مَالِهَا إِذَا مَلَكَ زَوْجُهَا عِصْمَتَهَا).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ ئافرەتێك بۆی نیە لەماڵەکەی ببەخشێت بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەکەی واتە ئەوەی لەژێردەستی ئەودایە لە ماڵی مێردەکەی، ئەگەر پیاوەکەی خاوەنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بێت).

٣٥٤٧ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو، أن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم قال: (لاَ يَجُوزُ لاِمْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێك دروست نیە بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەكەی لەماڵەكەی ببەخشێت).

## باسی دەربارەی بەخشین بۆ ماوەی ژیان.

## ٨٧ - باب فِي الْعُمْرَى.

٣٥٤٨ - (صحيح) عن أبو هريرة: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (الْعُمْرَى جَائِزَةٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((عمری) بەخشین بۆ ماوەی تەمەن دروستە).

٣٥٤٩ - (صحيح بما قبله) عن سمرة, عن النبي صلى الله عليه و سلم, مثله.

واتە: لە سەمورەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

٣٥٥٠ - (صحيح) عن جابر, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الْعُمْرَى لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((عمری) بۆ ئەو كەسەیە كە پێی بەخشراوە).

٣٥٥١ - (صحيح) عن جابر, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أُعْمِرَ عُمْرَى فَهِيَ لَهُ وَلِعَقِبِهِ يَرِثُهَا مَنْ يَرِثُهُ مِنْ عَقِبِهِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس (عمری)یەکی کرد ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە بە زیندوویی، لەدوای خۆشی بۆ نەوەکانیەتی).

٣٥٥٢ - (صحيح) عن جابر, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بمعناه.

واتە: لە جابرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

## باسی دەربارەی ئەوکەسەی کە تێیدا وتویەتی: لەدوای خۆشی بۆ نەوەکانی.

## ٨٨ - باب مَنْ قَالَ فِيهِ: وَلِعَقِبِهِ.

٣٥٥٣ - عن جابر بن عبد الله, أن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم قال: (أَيُّمَا رَجُلٍ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَإِنَّهَا لِلَّذِي يُعْطَاهَا لاَ تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا, لأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەخششێکی بۆ ماوەی تەمەن بەخشی بە کەسێك ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە بە زیندوویی واتە دەبێتە خاوەنی هەروەها نەوەکانی لەدوای خۆی، ناگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی بەخشیویەتی، لەبەرئەوەی شتێکی بەخشیوە میراتی تێ دەکەوێت).

٣٥٥٤ - عن ابن شهاب, بإسناده, ومعناه.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٣٥٥٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: إِنَّمَا الْعُمْرَى الَّتِي أَجَازَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَقُولَ: هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ. فَأَمَّا إِذَا قَالَ: هِيَ لَكَ مَا عِشْتَ. فَإِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (ئەو (عمری)یەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی پێ داوە ئەوەیە کە بڵێ: ئەوە بۆ خۆت و نەوەکانت، بەڵام ئەگەر وتی: ئەوە بۆ تۆ هەتا لەژیاندا ماوی، ئەوە لەدوای مردنی دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

٣٥٥٦ - (صحيح) عن جابر، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُرْقِبوا, وَلاَ تُعْمِرُوا, فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئًا أَوْ أُعْمِرَهُ فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((رقبى)بەخششی چاودێری مەکەن، بەخشین بۆ ماوەی تەمەن(عمری) مەکەن، کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێکی تر بڵێ ئەم شتە بۆ تۆ، ئەگەر من پێش تۆ مردم ئەوە بۆ خۆت، ئەگەر لەدوای تۆش مردم ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆم ئەمە پێی دەوترێت (رقبى) لەبەرئەوەی هەردوکیان چاودێری مردنی یەکتر دەکەن، (عمری)ش بەخشینە بۆ ماوەی تەمەن، هەرکەس شتێ لەو دوانە بکات ئەوە بۆ میراتبەرانیەتی).

٣٥٥٧ - (ضعيف الإسناد) عن جابر بن عبد الله قال: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي امْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ أَعْطَاهَا ابْنُهَا حَدِيقَةً مِنْ نَخْلٍ, فَمَاتَتْ, فَقَالَ ابْنُهَا: إِنَّمَا أَعْطَيْتُهَا حَيَاتَهَا, وَلَهُ إِخْوَةٌ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هِيَ لَهَا حَيَاتَهَا وَمَوْتَهَا). قَالَ: كُنْتُ تَصَدَّقْتُ بِهَا عَلَيْهَا. قَالَ: (ذَلِكَ أَبْعَدُ لَكَ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژنێکی ئەنصاری کوڕەکەی باخێکی دار خورمای پێ بەخشی بوو، ژنەکە مرد، کوڕەکەی وتی:

ـن داومەتێ بەدرێژایی تەمەنی لەدوای مردنی من شایستەترم، برای تری ـەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری داو فەرمووی: (ئەو باخە ـۆ ئەوە لە ژیانداو لەدوای مردنیشی). وتی: من ئەو باخە خورمایەم بەخێر و ـەدەقە پێ بەخشیبوو، فەرمووی: (دەی پاشگەزبوونەوە لە خێرو سەدەقە دورترە ـە پاشگەزبوونەوە لە دیاری هەر بۆ تۆ نابێ).

## باسی سەبارەت بە بەخششی چاودێری.

## ٨٩ - باب فِي الرُّقْبَى.

٣٥٥٨ - (صحيح) عن جابر قال, قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم: (الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لأَهْلِهَا وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لأَهْلِهَا).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((عمری)بەخشین بۆ ماوەی تەمەن دروستە بۆ خاوەنی خۆی، (رقبی)بەخششی چاودێری دروستە بۆ خاوەنی خۆی).

٣٥٥٩ - (حسن صحيح الإسناد) عن زيد بن ثابت قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَعْمَرَ شَيْئًا فَهُوَ لِمُعْمَرِهِ مَحْيَاهُ وَمَمَاتَهُ, وَلاَ تُرْقِبُوا فَمَنْ أَرْقَبَ شَيْئًا فَهُوَ سَبِيلُهُ).

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس شتێکی بەخشی بۆ ماوەی تەمەن ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە هەتا لە ژیاندایە لەدوای مردنیشی بۆ نەوەکانیەتی، (رقبی)بەخششی چاودێری مەکەن هەرکەس ئەوە بکات ئەوە بەرەو میراتگرانی ئەو دەچێت ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی).

٣٥٦٠ - (صحيح الإسناد مقطوع) عن مجاهد قال: الْعُمْرَى أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: هُوَ لَكَ مَا عِشْتَ, فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ فَهُوَ لَهُ وَلِوَرَثَتِهِ, وَالرُّقْبَى هُوَ أَنْ يَقُولَ الإِنْسَانُ: هُوَ لِلآخِرِ: مِنِّي وَمِنْكَ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ((عمری)بەخشین بۆ ماوەی تەمەن بریتیە لەوەی کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێکی تر بڵێ ئەو شتە بۆ تۆ هەتا لەژیاندا ماوی، ئەگەر ئەوەی پێ وت ئەوە ئەو کەسە دەبێتە خاوەنی هەتا لەژیاندایە لەدوای مردنیشی بۆ نەوەو میراتگرەکانیەتی، (رقبى)بەخشینی چاودێری بریتیە لەوەی کەسێ بە کەسێکی تر بڵێ ئەم شتە بۆ تۆ، ئەگەر پێش تۆ مردم ئەوە بۆ تۆ، ئەگەر تۆش پێش من مردی ئەوە بۆ خۆم، ئیتر هەریەکێ لەوان چاودێری مردنی ئەوی تریان دەکات هەتا بۆ ئەو بێت.

## باسی سەبارەت زامنکردنی خواستن.

## ٩٠ - باب فِي تَضْمِينِ الْعَارِيَةِ.

٣٥٦١ - (ضعيف) عن الحسن, عن سمرة : عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَ). ثُمَّ إِنَّ الْحَسَنَ نَسِيَ فَقَالَ: هُوَ أَمِينُكَ. لاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ

واتە: لە حەسەنەوە، لە سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (زامنکردنی ئەو ماڵەی کە براوە لەسەر دەست پێویستە تاوەکو دەیگێڕێتەوە) لەپاشدا حەسەن لەیادی چو وتی: ئەو کەسەی کە وەری دەگرێت دەستپاکە، زامنکردنی لەسەر نیە.

٣٥٦٢ - (صحيح) عن أمية بن صفوان بن أمية, عن أبيه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعَارَ مِنْهُ أَدْرَاعًا يَوْمَ حُنَيْنٍ, فَقَالَ أَغَصْبٌ يَا مُحَمَّدُ؟ فَقَالَ: (لاَ, بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ).

واتە: لە ئومەییەی کوڕی صەفوانی کوڕی ئومەییەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی حونەیندا چەند قەڵغانێکی لێ خواست، ئەویش وتی: ئەی موحەممەد داگیریان دەکەیت؟ فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو خوازراوێکی زامنکراوە).

٣٥٦٣ - (صحيح) عن أناس من آل عبد الله بن صفوان: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (يَا صَفْوَانُ هَلْ عِنْدَكَ مِنْ سِلاَحٍ؟). قَالَ: عَارِيَةً أَمْ غَصْبًا؟ قَالَ (لاَ بَلْ عَارِيَةً). فَأَعَارَهُ مَا بَيْنَ الثَّلاَثِينَ إِلَى الأَرْبَعِينَ دِرْعًا, وَغَزَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُنَيْنًا, فَلَمَّا هُزِمَ الْمُشْرِكُونَ جُمِعَتْ دُرُوعُ صَفْوَانَ فَفَقَدَ مِنْهَا أَدْرَاعًا, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِصَفْوَانَ: (إِنَّا قَدْ فَقَدْنَا مِنْ أَدْرَاعِكَ أَدْرَاعًا, فَهَلْ نَغْرَمُ لَكَ؟). قَالَ: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ, لأَنَّ فِي قَلْبِي الْيَوْمَ مَا لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَكَانَ أَعَارَهُ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ ثُمَّ أَسْلَمَ.

واتە: لە کەسانێك لەخزم و کەسوکاری (عبد الله)ی کوڕی صەفوانەوە، دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی صەفوان ئایا چەکت هەیە؟) وتی: بە خواستن یان بە داگیرکردن؟ فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو خواستن)، جا صەفوان لەنێوان سی تا چل قەڵغانی دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم غەزای حونەینی کرد، کاتێ کە هاوبەش بۆ خوا دانەران شکان قەڵغانەکانی صەفوان کۆکرانەوە، قەڵغانێ ون بوو بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە صەفوانی فەرموو: (یەکێ لە قەڵغانەکانی تۆمان ونکردوە، ئایا بۆت نەبژێرین؟)، صەفوان وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەرئەوەی ئەوەی ئەمڕۆ لەدڵمدایە کە موسوڵمان بووم جیاوازە لەوەی ئەوکاتە لەدڵمدا بوو کە بێ باوەڕ بووم. ئەبو داود دەڵێ: لێی خواست پێش ئەوەی موسلمان بێت، لە پاشان موسلمان بوو.

٣٥٦٤ - عن ناس من آل عبد الله بن صفوان قال: اسْتَعَارَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: کەسانێ لە خزم و کەسوکاری (عبد الله)ی کوڕی صەفوان، دەگێڕنەوە. کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چەند قەڵغانێکی خواست .... ج راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە.

٣٥٦٥ - (صحيح) عن أبو ئومامة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِى حَقٍّ حَقَّهُ, فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ, وَلاَ تُنْفِقُ الْمَرْأَةُ شَيْئًا مِنْ بَيْتِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الطَّعَامَ؟ قَالَ: (ذَلِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا). ثُمَّ قَالَ: (الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ, وَالْمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ, وَالدَّيْنُ مَقْضِىٌّ وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خوای گەورەو پەروەردگار هەقی هەموو خاوەن هەقێکی داوە، ئیتر وەسیەت نیە بۆ میراتگران لەبەرئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا بەشی میراتگرانی دیاریکردوە، دروست نیە بۆ ئافرەت شتێ لەماڵەکەی ببەخشێت بەبێ رەزامەندی مێردەکەی، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنیش؟ فەرمووی: (ئەوە باشرینی ماڵەکانمانە)، لەپاشدا فەرمووی: (خواستن دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی، بۆ نمونە کەسێ ئاژەڵێ دەبەخشێت بە کەسێکی تر سود لە شیرەکەی ببینێ یان درختێ دەدات بە کەسێ سود لە بەرەکەی ببینێ ئەوە پێی دەوترێت (منحە) پێویستە لەپاشدا ئەو ئاژەڵە یان ئەو درەختە بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی، قەرز دەبێ ببژێردرێت و بدرێتەوە، کەفیلیش زامنە).

٣٥٦٦ - (صحيح) عن صفوان بن يعلى, عن أبيه قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَتَتْكَ رُسُلِى فَأَعْطِهِمْ ثَلاَثِينَ دِرْعًا وَثَلاَثِينَ بَعِيرًا). قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعَارِيَةً مَضْمُونَةً أَوْ عَارِيَةً مُؤَدَّاةً؟ قَالَ: (بَلْ مُؤَدَّاةً).

واتە: لە صەفوانی کوڕی یەعلاوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەگەر نێردراوەکە

هات بۆ لات سی قەڵغان و سی وشتری بدەرێ)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا خوازراوێکی زامنکراوە یان خوازراوێکە دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی؟ فەرمووی: (دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی).

## باسی سەبارەت بە کەسێ شتێ خراپ بکات دەبێ وەك خۆی بیبژێرێتەوە.

## ٩١ - باب فِيمَنْ أَفْسَدَ شَيْئًا يَغْرَمُ مِثْلَهُ.

٣٥٦٧ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ مَعَ خَادِمِهَا بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ, قَالَ: فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا فَكَسَرَتِ الْقَصْعَةَ. قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: فَأَخَذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْكِسْرَتَيْنِ, فَضَمَّ إِحْدَاهُمَا إِلَى الأُخْرَى فَجَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ وَيَقُولُ: (غَارَتْ أُمُّكُمْ). زَادَ ابْنُ الْمُثَنَّى: (كُلُوا). فَأَكَلُوا حَتَّى جَاءَتْ قَصْعَتُهَا الَّتِي فِي بَيْتِهَا. ثُمَّ رَجَعْنَا إِلَى لَفْظِ حَدِيثِ مُسَدَّدٍ, وَقَالَ: (كُلُوا). وَحَبَسَ الرَّسُولَ وَالْقَصْعَةَ حَتَّى فَرَغُوا, فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ إِلَى الرَّسُولِ, وَحَبَسَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلای یەکێ لە هاوسەرەکانی بوو، یەکێ لە دایکانی ئیمانداران واتە یەکێ لە هاوسەرانی بە نۆکەرێکیدا لەگەنێکی بۆ ناردن خواردنی تێدابوو، راوی وتی: ئەو هاوسەرەی کە ئەو لەماڵیان بوو کێشای بە دەستی نۆکەرەکەدا لەگەنەکە شکا، (ابْنُ الْمُثَنَّى) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو درزی شکاویەکەی گرت و لکاندنی پێکەوەو خواردنەکەی تێدا کۆکردەوە، فەرمووی: (دایکتان بۆت دەبژێرێت). (ابْنُ الْمُثَنَّى) ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بخۆن). ئەوانیش خواردیان هەتا لەماڵی خۆیانەوە لەگەنەکەی بۆ هات، لەپاشدا گەڕاینەوە بۆ

دەربڕین(لفظ)ی فەرموودەکەی موسەددەد، وە فەرمووی: (بخۆن). نێردراوەکەو لەگەنەکەی گیردا هەتا خاڵی بوو، لەگەنە ساغەکەی دا بە نێردراوەکە، لەگەنە شکاوەکەی گلدایەوە لە ماڵی خۆیان.

٣٥٦٨ - (ضعيف) عن عائشة رضى الله عنها قالت: مَا رَأَيْتُ صَانِعًا طَعَامًا مِثْلَ صَفِيَّةَ, صَنَعَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا فَبَعَثَتْ بِهِ, فَأَخَذَنِي أَفْكَلٌ فَكَسَرْتُ الإِنَاءَ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كَفَّارَةُ مَا صَنَعْتُ؟ قَالَ (إِنَاءٌ مِثْلُ إِنَاءٍ, وَطَعَامٌ مِثْلُ طَعَامٍ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی هیچ کەسێکم نەدیوە وەك صەفیە خواردنی خۆش دروست بکات، خواردنێکی دروست کرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆی نارد، کاتێ کە لێم گرت قاپەکەم شکاندو خواردنەکەم ڕژاند، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەفارەتی ئەو کارە چیە کە کردم؟ فەرمووی: (قاپێکی ساغ وەك قاپەکەی. خواردنێك وەك خواردنەکەی واتە دەبێ قاپەکەی بۆ ببژێری و قاپێکی ساغی بۆ بنێریتەوەو خواردنێکی وەك ئەو خواردنە دروست بکەی).

## باسی سەبارەت بە لەناوبردنی کشتوکاڵی خەڵك لەلایەن ئاژەڵانەوە.

## ٩٢ - باب الْمَوَاشِي تُفْسِدُ زَرْعَ قَوْمٍ.

٣٥٦٩ - (صحيح) عن حرام بن محيصة, عن أبيه: أَنَّ نَاقَةً لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ دَخَلَتْ حَائِطَ رَجُلٍ فَأَفْسَدَتْهُ عَلَيْهِمْ فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَهْلِ الأَمْوَالِ حِفْظَهَا بِالنَّهَارِ وَعَلَى أَهْلِ الْمَوَاشِي حِفْظَهَا بِاللَّيْلِ.

واتە: لە حەرامی كوڕی موحەییصەوە، لەباوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وشترێكی بەرائی كوڕی عازیب چوە ناو باخی پیاوێكەوە كە چواردەوری دیوار بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری بۆدان كە خاوەن ماڵەكان بەڕۆژدا ماڵەكانی خۆیان بپارێزن و خاوەن ئاژەڵانیش بەشەودا ئاژەڵەكانیان بپارێزن و بەرەڵایان نەكەنە ناو كشتوكاڵ و باخ و باخاتی خەڵكەوە.

٣٥٧٠ - (صحيح) عن البراء بن عازب قال: كَانَتْ لَهُ نَاقَةٌ ضَارِيَةٌ, فَدَخَلَتْ حَائِطًا فَأَفْسَدَتْ فِيهِ, فَكُلِّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا, فَقَضَى أَنَّ حِفْظَ الْحَوَائِطِ بِالنَّهَارِ عَلَى أَهْلِهَا وَأَنَّ حِفْظَ الْمَاشِيَةِ بِاللَّيْلِ عَلَى أَهْلِهَا, وَأَنَّ عَلَى أَهْلِ الْمَاشِيَةِ مَا أَصَابَتْ مَاشِيَتُهُمْ بِاللَّيْلِ.

واتە: لە بەرائی كوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: وشترێكی دڕندەی هەبوو، چوە ناو باخێكەوە كە چواردەوری دیوار بوو زیانێكی زۆری گەیاند بە باخەكە، لەوبارەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دوان بڕیاری دا كە خاوەن باخ و باخاتەكان بەڕۆژدا باخ و باخاتەكانیان بپارێزن و پاسەوانیان بكەن، خاوەن ئاژەڵەكانیش ئاژەڵەكانیان بەشەودا بپارێزن و بەرەڵایان نەكەنە ناو كشتوكاڵ و باخ و باخاتی خەڵكەوە، خاوەن ئاژەڵەكان زامنی ئەو زیانانەن كە ئاژەڵەكانیان بەشەودا دەیگەیەنن بە كشتوكاڵ و باخ و باخاتی خەڵك و دەبێ بۆیان قەرەبوو بكەنەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای پەرتوکی دادوەری

## ١٨ – أول كتاب القضاء.

### باسی سەبارەت بە داواکردنی دادوەری.

### ١ - باب فِي طَلَبِ الْقَضَاءِ.

٣٥٧١ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ وَلِيَ الْقَضَاءَ, فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس دادوەری بگرێتەخۆ، ئەوە بەبێ چەقۆ سەربڕاوە).

٣٥٧٢ - (صحيح) عن أبو هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ, فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس کرایە دادوەر(قازی) لەنێوان خەڵکدا، ئەوە بەبێ چەقۆ سەربڕاوە).

## باسی سەبارەت بە دادوەر هەڵە دەكات

## ٢ - باب فِي الْقَاضِي يُخْطِئُ.

٣٥٧٣ - (صحيح) عن ابن بريدة, عن أبيه: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ: وَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ, وَاثْنَانِ فِي النَّارِ, فَأَمَّا الَّذِى فِي الْجَنَّةِ فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ, وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَجَارَ فِي الْحُكْمِ فَهُوَ فِي النَّارِ, وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ).

واته: لە بوورەیدەوە، لەباوكیەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قازیەكان سیانن: یەكێكیان لە بەهەشتدایەو، دوانیان لە ئاگری دۆزەخدان، ئەوەیان كە لە بەهەشتدایە ئەوەیە كە زانیویەتی كامە هەقەو بەوشێوەیە حوكمی كردوە، ئەوەشی كە لە ئاگری دۆزەخدایە ئەوەیە كە زانیویەتی كامە هەقەو زوڵم و ستەمی تێدا كردوەو بەوشێوەیە حوكمی نەكردوە، ئەو قازیەش كە بە نەزانین حوكمی كردوە لەنێوان خەڵكدا ئەوە لەئاگری دۆزەخدایە).

٣٥٧٤ - (صحيح) عن عمرو بن العاص قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ, وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ).

واته: لە عەمری كوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر حاكم حوكمێكی دەركرد بە ئیجتیهادی خۆی هەوڵی پێكانی هەقی داو هەقی پێكا ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادی كردو هەقی نەپێكا ئەوە یەك پاداشتی بۆ هەیە).

٣٥٧٥ - (ضعيف) عن أبو هريرة: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال (مَنْ طَلَبَ قَضَاءَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى يَنَالَهُ, ثُمَّ غَلَبَ عَدْلُهُ جَوْرَهُ فَلَهُ الْجَنَّةُ, وَمَنْ غَلَبَ جَوْرُهُ عَدْلَهُ فَلَهُ النَّارُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ هەوڵ بدات ببێتە دادوەری موسوڵمانان و داوای بکات هەتا بەدەستی دەهێنێت، ئەگەر دادپەروەری بەسەر زوڵم و ستەمیدا زاڵ بوو واتە ئەگەر دادپەروەری زیاتر بوو ئەوە بەهەشتی بۆ دەبێت، بەڵام ئەگەر زوڵم و ستەمی زاڵ بوو بەسەر دادپەروەریدا واتە ئەگەر زوڵم و ستەمی زیاتر بوو ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ دەبێت).

٣٥٧٦ - (حسن صحيح الإسناد) عن ابن عباس قال: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) إِلَى قَوْلِهِ (الْفَاسِقُونَ): هَؤُلَاءِ الآيَاتُ الثَّلَاثُ نَزَلَتْ فِي الْيَهُودِ خَاصَّةً فِي قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾. سورە المائدە: ٤٤. واتە: وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێ باوەڕن و موسڵمان نین. هەتا دەگاتە (الْفَاسِقُونَ): ئەم سێ ئایەتە بەتایبەتی دەربارەی جولەکەکانی (بنی قريظه) و (بنی نظير) دابەزین.

## باسی سەبارەت بە داواکردن و هەڵپەکردن بۆ دادوەری.

## ٣ - باب فِي طَلَبِ الْقَضَاءِ وَالتَّسَرُّعِ إِلَيْهِ.

٣٥٧٧ - (ضعيف الإسناد) عن عبد الرحمن بن بشر الأنصاري الأزرق قال: دَخَلَ رَجُلَانِ مِنْ أَبوابِ كِنْدَةَ - وَأَبو مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ جَالِسٌ فِي حَلْقَةٍ - فَقَالاَ: أَلاَ رَجُلٌ يُنَفِّذُ بَيْنَنَا, فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْحَلْقَةِ: أَنَا, فَأَخَذَ أَبو مَسْعُودٍ كَفًّا مِنْ حَصًى فَرَمَاهُ بِهِ, وَقَالَ: مَهْ, إِنَّهُ كَانَ يُكْرَهُ التَّسَرُّعُ إِلَى الْحُكْمِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی بیشری ئەنصاری ئەزرەقەوە دەگێڕنەوە، کە

وتویەتی: دوو پیاو لە دەرگاكانی كیندەوە چونەژوورەوە بۆ ناو شاری مەدینە - ئەبو مەسعودی ئەنصاری لەناو هەڵقەیەكدا دانیشتبوو - وتیان: ئەوە كەسێ نیە حوكم بكات لەنێوانماندا، پیاوێ لەناو هەڵقەكەدا وتی: من، ئەبو مەسعود مشتێ وردە بەردی هەڵگرت و تێی گرت، لێی توڕەبوو وتی: (مَهْ)، وس بە لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەردەمی خۆیدا هەڵپەكردنی بۆ دادوەری پێ ناخۆش بوو.

٣٥٧٨ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (مَنْ طَلَبَ الْقَضَاءَ وَاسْتَعَانَ عَلَيْهِ وُكِلَ إِلَيْهِ, وَمَنْ لَمْ يَطْلُبْهُ وَلَمْ يَسْتَعِنْ عَلَيْهِ أَنْزَلَ اللَّهُ مَلَكًا يُسَدِّدُهُ).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەسێ هەوڵ بدات بۆ دادوەری و خۆی داوای بكات بە تكای تكاكار بەدەستی بێنێ ئەوە دەدرێتە دەستی خۆی پشتیوانی ناكرێت و خوای گەورە یارمەتی نادات، هەركەس داوای نەكات و بە تكای تكاكار بەدەستی نەهێنێ خوای گەورە مەلائیكەیەكی بۆ دادەبەزێنێ راستی نیشان دەدات و رێنمایی دەكات).

٣٥٧٩ - (صحيح) عن أبوو موسى قال: قال النبي صلى الله عليه و سلم: (لَنْ نَسْتَعْمِلَ, أَوْ لاَ نَسْتَعْمِلُ, عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ).

واتە: لە ئەبوو موساوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو فەرموویەتی: (ئەو كەسانە ناكەینە سەركاری كارەكانمان كە خۆیان داوای دەكەن و هەڵپەی بۆ دەكەن).

## باسی سەبارەت بە ناپەسەندی بەرتیل وەرگرتن.

## ٤ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الرِّشْوَةِ.

٣٥٨٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرەتی کردوە لەوەی بەرتیل دەدات و لەوەشی بەرتیل وەرگردەگرێت.

## باسی سەبارەت بە دیاری سەرکارەکان.

## ٥ - باب فِي هَدَايَا الْعُمَّالِ.

٣٥٨١ - (صحيح) عن عدي بن عميرة الكندي، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ لَنَا عَلَى عَمَلٍ فَكَتَمَنَا مِنْهُ مِخْيَطًا فَمَا فَوْقَهُ، فَهُوَ غُلٌّ يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، أَسْوَدُ - كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ - فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ اقْبَلْ عَنِّي عَمَلَكَ، قَالَ: (وَمَا ذَاكَ؟). قَالَ: سَمِعْتُكَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: (وَأَنَا أَقُولُ ذَلِكَ، مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَلْيَأْتِ بِقَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، فَمَا أُوتِيَ مِنْهُ أَخَذَهُ وَمَا نُهِيَ عَنْهُ انْتَهَى).

واتە: لە عەدی کوڕی عەمیرەی کیندیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەی خەڵکینە کەسێ لەئێوە بیکەینە سەرکار لەسەر کارێك لە دەرزیەکەوە بیگرە هەتا زیاتری بشارێتەوەو نەیداتەوە دەستمان، ئەوە دادەنرێ بە گزی و غەش و ناپاکی لەڕۆژی قیامەتدا بە کۆڵ دەیهێنێ)، پیاوێکی ڕەشی ئەنصاری هەستا — ئێستا ئەڵێی سەیری دەکەم و بە

بەرچاومەوەیە - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کارەکەتم لێ وەرگروە من ئەو کارەم ناوێ - ئەیوست خۆی بپارێزێ و نەکەوێتە مەترسیەوە -، فەرمووی: (بۆچی لەبەرچی واها دەڵێی؟). وتی: گوێم لەو فەرمایشتەی تۆ بوو کە ئاواو ئاوات فەرموو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڵێ من ئاوا دەڵێم، هەرکەسێ لەئێوە بیکەین بە سەرکار لەسەر کارێك با کەم و زۆریمان بۆ بهێنێ، ئەوەی کە دەیدرێتێ لەلایەن فەرمانڕەواوە چ وەك موچە چی وەك بەخشش ئەوە با وەری بگرێت، ئەوەی رێگری لێ دەکرێت کە وەری نەگرێت با وەری نەگرێت).

## باسی سەبارەت بە چۆنیەتی دادوەری.

### ٦ - باب كَيْفَ الْقَضَاءُ.

٣٥٨٢ - (حسن) عن علي عليه السلام, قال: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْيَمَنِ قَاضِيًا, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُرْسِلُنِي وَأَنَا حَدِيثُ السِّنِّ وَلاَ عِلْمَ لِي بِالْقَضَاءِ؟ فَقَالَ (إِنَّ اللَّهَ سَيَهْدِي قَلْبَكَ وَيُثَبِّتُ لِسَانَكَ, فَإِذَا جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْكَ الْخَصْمَانِ فَلاَ تَقْضِيَنَّ حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الآخَرِ كَمَا سَمِعْتَ مِنَ الأَوَّلِ, فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يَتَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ). قَالَ: فَمَا زِلْتُ قَاضِيًا, أَوْ: مَا شَكَكْتُ فِي قَضَاءٍ بَعْدُ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردمی بۆ یەمەن و کردمی بە قازی ئەوێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تۆ من دەنێری من لاوێکی تازە پێگەیشتوم و بێ ئەزمونم و شارەزاییم نیە لە دادوەری دا؟ فەرمووی: (خوای گەورە دڵت شارەزا دەکات و ڕێنمایی دەکات و زمانت رادەهێنێ و دامەزراوی دەکات، کاتێ کە خاوەن کێشەکان لەبەردەمتدا دادەنیشن حوکم و بڕیار مەدەو گوێ بگرە هەتا لایەنی بەرامبەریش قسەی خۆی دەکات وەك چۆن لایەنی یەکەم قسەی خۆی کردو گوێت بۆ گرت، لەبەرئەوەی بەو شێوەیە

چاکتر راستی رووداوەکەت بۆ رون دەبێتەوەو حاڵی دەبیت). پێشەوا عەلی وتی: ئیتر لەوکاتەوە بووم بە قازی تا ئێستا، یان وتی: ئیتر لەوکاتەوە کە پێغەمبەری خو صلی الله علیه وسلم بۆم پاڕایەوە لە دادوەری دا گومانم بۆ پەیدا نەبووە.

## باسی سەبارەت بە ئەگەر قازی هەڵەی کرد لەدادوەری دا.

## ٧ - باب فِي قَضَاءِ الْقَاضِي إِذَا أَخْطَأَ.

٣٥٨٣ - (صحيح) عن أم سلمة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ, وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ, وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ, فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ مِنْهُ, فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ بِشَيْءٍ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا, فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان منیش مرۆڤێکم، ئێوە سکاڵاو شکاتی خۆتان هێناوە بۆلام، رەنگە هەندێکتان زمان پاراوتر بێت لە هەندێکی دیکەتان و بە توانا تر بێت لەدەربڕینداو بەڵگەی بەهێز بهێنێتەوە، بۆیە منیش بەگوێرەی ئەوە بڕیار دەدەم کە دەیبیستم، جا هەرکەس هەقی براکەیم بۆ دابڕی کە مافی خۆی نەبوو ئەوە با وەرینەگرێت، چونکە من پارچەیەك لە ئاگری بۆ دادەبڕم).

٣٥٨٤ - (ضعيف) عن أم سلمة قالت: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاَنِ يَخْتَصِمَانِ فِي مَوَارِيثَ لَهُمَا لَمْ تَكُنْ لَهُمَا بَيِّنَةٌ إِلاَّ دَعْوَاهُمَا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ مِثْلَهُ, فَبَكَى الرَّجُلاَنِ وَقَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: حَقِّي لَكَ. فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا إِذْ فَعَلْتُمَا مَا فَعَلْتُمَا فَاقْتَسِمَا وَتَوَخَّيَا الْحَقَّ, ثُمَّ اسْتَهِمَا, ثُمَّ تَحَالاَّ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوو پیاو سکاڵاو شکاتی خۆیان لەسەر میرات هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەبوو جگە لە سکاڵاکە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی، جا ڕاوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەی پێشو، هەردو پیاوەکە دەستیان کرد بە گریان و هەر یەکەیان وتی: هەقی من بۆ تۆ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموون: (مادەم ئەو کارەتان کرد ئەوا بیکەن بەدوو بەشەوە بە یەکسانی و بەهەق بەشی بکەن، لەپاشدا قورعەی بۆ بکەن هەریەکە بەشی خۆی ببات، ئینجا لەیەکتر خۆش ببن و گەردنی یەکتر ئازاد بکەن و بە ڕەزامەندی و خۆشحاڵیەوە لەیەکتر جیاببنەوە).

٣٥٨٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن رافع قال: قَالَ سَمِعْتُ أُمَّ سَلَمَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: يَخْتَصِمَانِ فِي مَوَارِيثَ وَأَشْيَاءَ قَدْ دَرَسَتْ فَقَالَ (إِنِّي إِنَّمَا أَقْضِي بَيْنَكُمْ بِرَأْيِي فِيمَا لَمْ يُنْزَلْ عَلَيَّ فِيهِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە ئوممو سەلەمە بوو، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، وتی: دوو پیاو هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کێشەیان هەبوو لەسەر میرات کە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕی بوو هیچیان بەڵگەو شایەتیان نەبوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من بە ڕاوبۆچونی خۆم بڕیارتان بۆ دەدەم و حوکمتان دەکەم لەوەدا کە دەربارەی لەلایەن خوای گەورەوە هیچم بۆ نەهاتۆتەخوارەوە).

٣٥٨٦ - (ضعيف مقطوع) عن ابن شهاب: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ الرَّأْيَ إِنَّمَا كَانَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُصِيبًا، لأَنَّ اللَّهَ كَانَ يُرِيهِ، وَإِنَّمَا هُوَ مِنَّا الظَّنُّ وَالتَّكَلُّفُ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای

خواى لىٚ بىٚ لەسەر مینبەر وتى: راو بۆچون لەلایەن پێغەمبەرى خواوە صلى الله علیه وسلم راستى پێكانە، لەبەرئەوەى خواى گەورە وەحى بۆ دەنێرێ و راستى ئەوەى بۆ رون دەكاتەوە كە بڕیارى لەسەر داوە، بەڵام لەلایەن ئێمەوە شت و گومان و قورسى و بارگرانیە.

٣٥٨٧ - (صحيح مقطوع) عن معاذ بن معاذ قال: أَخْبَرَنِي أَبو عُثْمَانَ الشَّامِيُّ. وَلاَ إِخَالُنِي رَأَيْتُ شَامِيًّا أَفْضَلَ مِنْهُ. يَعْنِي: حَرِيزَ بْنَ عُثْمَانَ.

واتە: لە (معاذ)ى كوڕى (معاذ)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتى: ئەبو (عثمان)ى شامى پێى راگەیاندم، پێ نازانم هیچ شامیەكم دى بێت لە ئەبوو (عثمان) چاكتر بێت. واتە: حەریزەى كوڕى (عثمان).

## باسى سەبارەت بە خاوەن كێشەكان لەبەردەم قازى دا چۆن دابنیشن

## ٨ - باب كَيْفَ يَجْلِسُ الْخَصْمَانِ بَيْنَ يَدَيِ الْقَاضِي.

٣٥٨٨ - (ضعيف الإسناد) عن عبد الله بن الزبير, قال: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ الْخَصْمَيْنِ يَقْعُدَانِ بَيْنَ يَدَيِ الْحَكَمِ.

واتە: لە (عبد الله)ى كوڕى زوبێرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم بڕیارى داوە خاوەن كێشەكان لەبەردەم قازى دا دابنیشن.

## باسی سەبارەت بە قازی لەکاتی دادوەری دا توڕەبێت.

## ٩ - باب الْقَاضِي يَقْضِي وَهُوَ غَضْبَانُ.

٣٥٨٩ - عن عبد الرحمن بن أبي بكرة, عن أبيه, أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى ابْنِهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ يَقْضِي الْحَكَمُ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ).

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبوو بکرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە نوسیویەتی بۆ کوڕەکەی وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەس لەنێوان دوو کەسدا دادوەری نەکات لەکاتی توڕەیی دا).

## باسی سەبارەت بە حوکم کردن لەنێوان ئەو خاوەن نامە ئاسمانیانەی لەسایەی ئیسلامدان.

## ١٠ - باب الْحُكْمِ بَيْنَ أَهْلِ الذِّمَّةِ.

٣٥٩٠ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: (فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ) فَنُسِخَتْ قَالَ: (فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەم ئایەتە: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ﴾ سورە المائدە:٤٢. واتە: ئەگەر ئەوانە هاتن بۆلات ئەوە (بەویستی خۆت) بڕیار بدە لە نێوانیاندا، یان وازیان لێ بهێنە. - واتە نامەدارەکان -. نەسخ بۆتەوە بەم ئایەتە: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ﴾. سورە المائدە:٤٨. حوکم و بڕیاربدە لەناو نامەدارەکاندا بەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە.

٣٥٩١ - (حسن صحيح الإسناد) عن ابن عباس قال: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ) (وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ). قَالَ: كَانَ بَنُو النَّضِيرِ إِذَا قَتَلُوا مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ أَدَّوْا نِصْفَ الدِّيَةِ, وَإِذَا قَتَلَ بَنُو قُرَيْظَةَ مِنْ بَنِي النَّضِيرِ أَدَّوْا إِلَيْهِمُ الدِّيَةَ كَامِلَةً, فَسَوَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾سورە المائدە:٤٢. واتە: ئەگەر ئەوانە هاتن بۆلات ئەوە (بەویستی خۆت) بڕیار بدە لە نێوانیاندا، یان وازیان لێ بهێنە. - واتە نامەدارەکان -. ﴿وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ سورە المائدە:٤٢. واتە: وە ئەگەر بڕیارت دا لەنێوانیاند ئەوا بە دادوەری بڕیار بدە، چونکە بەڕاستی خوا دادگەرانی خۆش دەوێ.
ئیبنو عەباس وتی: ئەگەر (بَنُو النَّضِير) لە (بَنِي قُرَيْظَةَ)یان بکوشتایە نیوەی خوێنەکەیان دەدا، بەڵام ئەگەر (بَنِي قُرَيْظَةَ) لە (بَنُو النَّضِير)یان بکوشتایە هەموو خوێنەکەیان بە تەواوی دەدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیاری دا کە (بَنِي قُرَيْظَةَ) و (بَنُو النَّضِير) وەك یەك خوێن بدەن بەبێ جیاوازی.

## باسی سەبارەت بە ئیجتیهادکردن لەدادوەری دا.

## ١١ - باب اجْتِهَادِ الرَّأْيِ فِي الْقَضَاءِ.

٣٥٩٢ - (ضعيف) عن أناس من أهل حمص من أصحاب معاذ بن جبل: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ (كَيْفَ تَقْضِي إِذَا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ؟). قَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّهِ. قَالَ: (فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟). قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ: (فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟). قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي

وَلاَ آلُو. فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدْرَهُ وَقَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ لِمَا يُرْضِى رَسُولَ اللَّهِ).

واتە: لە چەند کەسانێك لە خەڵکی حیمصەوە لە هاوەڵانی (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی (معاذ) ڕەوانە بکات بۆ یەمەن بۆ ئەوەی ببێتە قازی و کاربەدەستیان، فەرمووی: (ئەگەر دادوەری هاتەپێش چۆن دادوەری دەکەیت؟). وتی: بە کتێبەکەی خوای گەورە واتە بە قورئان حوکم دەکەم، فەرمووی: (ئەگەر لە قورئاندا وەڵامت دەست نەکەوت؟). وتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حوکم دەکەم، فەرمووی: (ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم وەڵامت دەست نەکەوت؟). وتی: بە ئیجتیهادی خۆم ئەوپەڕی توانای خۆم دەخەمەگەڕ و کۆشش دەکەم بۆ دۆزینەوەی هەق و سستی نانوێنم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەسەر سنگیداو فەرمووی: (سوپاس بۆ خوای گەورە کە نێرراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتو کردوە بۆ شتێك کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی ڕازی یە).

٣٥٩٣ - (ضعيف) عن معاذ بن جبل: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە هاتوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕەوانەی کرد بۆ یەمەن، جا ڕاوی فەرموودەکەی بە هەمان مانا گێڕایەوە وەك فەرموودەی پێشو.

## باسی سەبارەت بە ئاشتەوایی و ڕێکەوتن.

## ١٢ - باب فِي الصُّلْحِ.

٣٥٩٤ - عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ). زَادَ أَحْمَدُ (إِلاَّ صُلْحًا أَحَلَّ حَرَامًا أَوْ حَرَّمَ حَلاَلاً). وَزَادَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ, وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاشتەوایی و ڕێکەوتن کارێکی دروستە لەنێوان موسوڵمانان دا). ئەحمەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: (مەگەر ڕێکەوتنێ کە حەڵاڵ حەرام بکات و حەرام حەڵاڵ بکات). سولەیمانی کوڕی داود ئەمەی بۆ زیاد کرد، وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (موسوڵمانان لەسەر مەرجی خۆیانن و لەسەری دامەزراون و لێی پاشگەزنابنەوە).

٣٥٩٥ - (صحيح) عن كعب بن مالك: أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ, فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ, فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ, وَنَادَى كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فَقَالَ: (يَا كَعْبُ). فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَشَارَ لَهُ بِيَدِهِ أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ مِنْ دَيْنِكَ, قَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ, قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قُمْ فَاقْضِهِ).

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم قەرزێکی لەلای ئیبنو ئەبی حەدرەد بوو لەمزگەوت داوای لێ کردەوە، بە هۆیەوە دەنگیان بەرزبوویەوە هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵی خۆیانەوە گوێی لێ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە کە بڕوات بۆ لایان پەردەی هۆدەکەی خۆی لادا،

کەعبی کوڕی مالیکی بانگ کرد وتی: (ئەی کەعب)، کەعب وتی: (لَبَّيْكَ) ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ کەعب کە لەنیوەی قەرزەکەی خۆش بێت و نیوەی نیّ وەرگرێتەوە، کەعب وتی: ئەوا ئەو کارە دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنیوەی قەرزەکە خۆش بووم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە ئیبنو ئەبی حەدرەدی فەرموو: (تۆش هەستە بڕۆ نیوەی قەرزەکەی بدەرەوە).

## باسی سەبارەت بە شایەتی.

## ١٣ - باب فِي الشَّهَادَاتِ.

٣٥٩٦ - (صحيح) عن زيد بن خالد الجهني, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ أَوْ يُخْبِرُ بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا). شَكَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ أَيَّتَهُمَا قَالَ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: قَالَ مَالِكٌ: الَّذِي يُخْبِرُ بِشَهَادَتِهِ وَلاَ يَعْلَمُ بِهَا الَّذِي هِيَ لَهُ. قَالَ الْهَمْدَانِيُّ: (وَيَرْفَعُهَا إِلَى السُّلْطَانِ). قَالَ ابْنُ السَّرْحِ: (أَوْ يَأْتِي بِهَا الإِمَامَ).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا پێتان بڵێم چاکترین شایەت کامەیە: ئەو کەسەیە کە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای شایەتی لیّ بکرێت). (عبد الله)ی کوڕی ئەبو بەکر گومانی هەبوو لەوەی کە ئایا فەرمووی: (يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ) یان فەرمووی: (يُخْبِرُ بِشَهَادَتِهِ). ئەبو داود دەڵێت: مالیك وتی: ئەو کەسەی کە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای لیّ بکرێت نازانیّ بۆ کیّ شایەتی دەدات واتە شایەتی هەقی خۆی دەدات. هەمەدانی دەڵێت: (ئەو کەسەیە کە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای شایەتی لیّ بکرێت لەلایەن (سلطان) دەسەڵاتدارەوە) واتە قازی. ئیبنو سەرح دەڵێت: (ئەو کەسەیە کە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای شایەتی لیّ بکرێت لەلایەن پێشەواوە).

# باسی سەبارەت بە کەسێ یارمەتیدەری کێشەیە بێت بەبێ ئەوەی بزانێ ئەو کێشەیە هەقە یان ناهەق.

## ١٤ - باب فِي الرَّجُل يُعِينُ عَلَى خُصُومَةٍ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَعْلَمَ أَمْرَهَا.

٣٥٩٧ - (صحيح) عن يحيى بن راشد قال: جَلَسْنَا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ, فَخَرَجَ إِلَيْنَا فَجَلَسَ, فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ فَقَدْ ضَادَّ اللَّهَ, وَمَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهُوَ يَعْلَمُهُ لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ حَتَّى يَنْزِعَ عَنْهُ, وَمَنْ قَالَ فِي مُؤْمِنٍ مَا لَيْسَ فِيهِ أَسْكَنَهُ اللَّهُ رَدْغَةَ الْخَبَالِ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ).

واتە: لە یەحیای کوڕی ڕاشیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دانیشتبووین چاوەڕێی (عبد الله)ی کوڕی عومەرمان دەکرد، ئەویش هاتەدەرەوە بۆ لامان دانیشت، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (تکای هەرکەس ببێتە هۆی بەجێنەهێنانی سزایە(حەددێ) لە سزا شەرعیەکان (حەددەکان)ی خوای گەورە ئەوە ئەو کەسە دژایەتی فەرمانی خوای گەورەی کردوە، وە هەرکەسێ لەسەر شتێکی ناهەق لەکاتێکدا کە خۆیشی بزانێ ئەو شتە ناهەقە کێشە بنێتەوەو ململانێ بکات، ئەوە لەناو خەشم و تووڕەیی خوای گەورەدایە هەتا واز ئەهێنێ، هەرکەسێ قسەیەك بەناهەق بە باوەڕدارێك بڵێت ئەوە خوای گەورە لە قوڕی خەبالدا نیشتەجێی دەکات هەتا واز ئەهێنێ).

٣٥٩٨ - (ضعيف) عن ابن عمر, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَمَنْ أَعَانَ عَلَى خُصُومَةٍ بِظُلْمٍ: فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (هەرکەس بە زوڵم و ستەم یارمەتی دەری کێشەیەك بێت: بە خەشم و تووڕەیی خوای گەورەوە دەگەڕێتەوە).

# باسی سەبارەت بە شایەتی درۆ.

## ١٥ - باب فِي شَهَادَةِ الزُّورِ.

٣٥٩٩ - (ضعيف) عن خريم بن فاتك قال: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الصُّبْحِ, فَلَمَّا انْصَرَفَ قَامَ قَائِمًا فَقَالَ: (عُدِلَتْ شَهَادَةُ الزُّورِ بِالإِشْرَاكِ بِاللَّهِ). ثَلَاثَ مِرَارٍ, ثُمَّ قَرَأَ: (فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ. حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ).

واتە: لە خورەیمی کوڕی فاتیکەوە دەگێرنەوە، کە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانی دەکرد کاتێ کە لێ بوویەوە هەستا سێ جار فەرمووی: (شایەتی درۆ هاوتایە لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانان)، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ﴾. سورە الحج: ٣٠ - ٣١. واتە: خۆتان دوور بخەنەوە لەو پیسیە کە بتەکانتانە هەروەها خۆتان بپارێزن لەقسەی درۆو نارەوا. گەردن کەچ بن بۆ خوا (خۆتان لە هەموو بیرو باوەڕێکی لار دووربگرن) هاوبەش بڕیاردەر مەبن بۆ خوا.

## باسی سەبارەت بە کێ شایەتی لێ وەرناگیرێت.

## ١٦ - باب مَنْ تُرَدُّ شَهَادَتُهُ.

٣٦٠٠ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَدَّ شَهَادَةَ الْخَائِنِ وَالْخَائِنَةِ, وَذِى الْغِمْرِ عَلَى أَخِيهِ, وَرَدَّ شَهَادَةَ الْقَانِعِ لأَهْلِ الْبَيْتِ وَأَجَازَهَا لِغَيْرِهِمْ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شایەتی ئەمانەی ڕەت دەکردەوەو قبوڵی نەدەکرد: ژن و پیاوی ناپاك، کەسێ ڕق و قینی لەدڵدا بێ بەرامبەر بە برا موسوڵمانەکەی و شایەتی لێ بدات، دەست و پێوەند بۆ خاوەن ماڵ، بەڵام شایەتی دەست و پێوەندی بۆ خەڵکانی تر قبووڵ دەکرد.

٣٦٠١ - (حسن) عن سليمان بن موسى قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ وَلاَ خَائِنَةٍ, وَلاَ زَانٍ وَلاَ زَانِيَةٍ, وَلاَ ذِى غِمْرٍ عَلَى أَخِيهِ).

واتە: لە سولەیمانی کوڕی موساوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شایەتی ئەمانە دروست نین: ژن و پیاوی خائین و ناپاك، ژن و پیاوی زیناکەر و داوێن پیس، کەسێ ڕق و قینی لەدڵدا بێ بەرامبەر بە برا موسوڵمانەکەی و شایەتی لەسەر بدات).

## باسی سەبارەت بە شایەتی کۆچەری لەسەر خەڵکی شار و دێهاتەکان.

## ١٧ - باب شَهَادَةِ الْبَدَوِيِّ عَلَى أَهْلِ الأَمْصَارِ.

٣٦٠٢ - (صحيح) عن أبي هريرة أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ بَدَوِيٍّ عَلَى صَاحِبِ قَرْيَةٍ).

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شایەتی کۆچەری دروست نیە لەسەر خەڵکی شار و دێهاتەکان).

## باسی سەبارەت بە شایەتی لەسەر شیرخواردن.

## ١٨ - باب الشَّهَادَةِ على الرَّضَاعِ.

٣٦٠٣ - (صحيح) عن عقبة بن الحارث قال: تَزَوَّجْتُ أُمَّ يَحْيَى بِنْتَ أَبِي إِهَابٍ, فَدَخَلَتْ عَلَيْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ, فَزَعَمَتْ أَنَّهَا أَرْضَعَتْنَا جَمِيعًا, فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَأَعْرَضَ عَنِّى, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا لَكَاذِبَةٌ, قَالَ: (وَمَا يُدْرِيكَ وَقَدْ قَالَتْ مَا قَالَتْ, دَعْهَا عَنْكَ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی (حارث)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دایکی یەحیا کچی ئەبوو ئیهابم مارەکرد، ژنێکی رەشتاڵە هاتەژوورەوە بۆلامان، پێی وابوو کە شیری داوە بە هەردوکمان، بۆیە منیش چومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، پشتی تێ کردم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوە درۆدەکات، فەرمووی: (بەچی دا ئەزانی ئەوەی ئەو ئافرەتە دەیڵێ راستە یان نا بۆیە واز لەو ژنە بێنە لەبەرئەوەی ئەو ئافرەتە رەشتاڵە شایەتی دەدا کە شیری پێ داون).

٣٦٠٤ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي شُعَيْبٍ الْحَرَّانِيُّ, حَدَّثَنَا الْحَارِثُ بْنُ عُمَيْرٍ الْبَصْرِيُّ. ح وَحَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ, كِلاَهُمَا عَنْ أَيُّوبَ, عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ, عَنْ عُبَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ, عَنْ عُقْبَةَ [بْنِ الْحَارِثِ], وَقَدْ سَمِعْتُهُ مِنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ, وَلَكِنِّى لِحَدِيثِ عُبَيْدٍ أَحْفَظُ, فَذَكَرَ مَعْنَاهُ. [قَالَ أَبوو دَاوُدَ: نَظَرَ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ إِلَى الْحَارِثِ بْنِ عُمَيْرٍ, فَقَالَ: هَذَا مِنْ ثِقَاتِ أَصْحَابِ أَيُّوبَ].

## باسی سەبارەت بە شایەتی (أهل الذمة) بۆ وەسیەت لەسەفەردا.

## ١٩ - باب شَهَادَةِ أَهْلِ الذِّمَّةِ وَفِى الْوَصِيَّةِ فِى السَّفَرِ.

٣٦٠٥ - (صحيح الإسناد ان كان الشعبي سمعه من أبي موسى) عن الشعبي: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ بِدَقُوقَاءَ هَذِهِ, وَلَمْ يَجِدْ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُشْهِدُهُ عَلَى وَصِيَّتِهِ, فَأَشْهَدَ رَجُلَيْنِ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ, فَقَدِمَا الْكُوفَةَ, فَأَتَيَا أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِىَّ, فَأَخْبَرَاهُ, وَقَدِمَا بِتَرِكَتِهِ وَوَصِيَّتِهِ, فَقَالَ الأَشْعَرِىُّ: هَذَا أَمْرٌ لَمْ يَكُنْ بَعْدَ الَّذِى كَانَ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَحْلَفَهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ بِاللَّهِ مَا خَانَا وَلاَ كَذِبَا وَلاَ بَدَّلاَ وَلاَ كَتَمَا وَلاَ غَيَّرَا, وَإِنَّهَا لَوَصِيَّةُ الرَّجُلِ وَتَرِكَتُهُ, فَأَمْضَى شَهَادَتَهُمَا.

واتە: لە شەعبییەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە موسوڵمانان لەمردن نزیك بوویەوەو کەوتە حاڵەتی سەرەمەرگەوە لەدەقوقادا، هیچ موسوڵمانێکی دەستنەکەوت بیکات بە شایەت لەسەر وەسیەتەکەی، دوو پیاوی ئەهلی کیتابی کردە شایەت، ئەوانیش هاتنە کوفەو، چونە لای ئەبو موسای ئەشعەری، هەواڵەکایان پێ ڕاگەیاند، وەسیەتەکەی و چی بەجێ هێشتبوو هێنایان، ئەبوو موسای ئەشعەری وتی: ئەمە شتێکە دوای ئەوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خودا صلی اللە علیە وسلم ڕووینەداوەو نەبووە، جا لەدوای نوێژی عەسر سوێندیدان کە نە خیانەت و ناپاکیان کردوە، نەدرۆیان کردوە، نە گۆڕیویانەو، نە هیچیان شاردۆتەوە، ئەمە وەسیەت و میراتی ئەو پیاوەیە. کاتێ کە سوێندیان خوارد ئەبو موسا شایەتی لێ وەرگرتن.

٣٦٠٦ - (صحيح) عن ابن عباس قال: خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ مَعَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَعَدِيِّ بْنِ بَدَّاءَ فَمَاتَ السَّهْمِيُّ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ, فَلَمَّا قَدِمَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامَ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا بِالذَّهَبِ, فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ وُجِدَ الْجَامُ بِمَكَّةَ, فَقَالُوا: اشْتَرَيْنَاهُ مِنْ تَمِيمٍ وَعَدِيٍّ, فَقَامَ رَجُلَانِ مِنْ أَوْلِيَاءِ السَّهْمِيِّ فَحَلَفَا لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَإِنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ. قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيهِمْ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ) الآيَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە بەنی سەهم لەگەڵ تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەددائدا دەرچوون بۆ سەفەرێ - تەمیم و عەدی هەردوکیان گاور بوون لەپاشدا تەمیم موسوڵمان بوو - سەهمی لە خاکێکدا وەفاتی کرد هیچ موسوڵمانێکی لێ نەبوو، کاتێ کە هاتنەوە میراتەکەیان هێنایەوە جامێکی زیوی دیارنەمابوو جامەکە بە زێڕ ڕوکەش کرابوو لەشێوەی گەڵا(خوص)ی خورمادا، پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم سوێندیدان، لەپاشدا جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە، وتیان: لە تەمیم و عەدیمان کڕیوە، دوو پیاو لە دۆستانی سەهمی هەستانەوە سوێندیان خوارد کە بەڕاستی شایەتیەکەی ئێمە ڕاستترە لە شایەتیەکەی ئەوان، جامەکە هی

هاورێکەیانە. وتی: ئەم ئایەتە لەوبارەوە هاتەخوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾ . سوره المائدة: ١٠٦. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە شایەتی بدەن لە نێوانتاندا کاتێ کەمردنی هەرکامتان نزیک بوویەوە، لەکاتی وەسیەت کردنتاندا دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان (موسولمـ بن)، یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافربن) ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوو بە وولاتداو بەلای مردنتان تووش هات.

## باسی سەبارەت بە ئەگەر حاکم زانی شایەتێ ڕاستگۆیە ئەوە دروستە بۆی بە قسەی ئەو شایەتە حوکم بکات.

## ٢٠ - باب إِذَا عَلِمَ الْحَاكِمُ صِدْقَ الشَّاهِدِ الْوَاحِدِ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَحْكُمَ بِهِ.

٣٦٠٧ - (صحيح) عن عمارة بن خزيمة, أن عمه حدثه, وهو من أصحاب النبي صلى الله عليه وآله وسلم: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْتَاعَ فَرَسًا مِنْ أَعْرَابِيٍّ, فَاسْتَتْبَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَقْضِيَهُ ثَمَنَ فَرَسِهِ, فَأَسْرَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَشْيَ وَأَبْطَأَ الأَعْرَابِيُّ, فَطَفِقَ رِجَالٌ يَعْتَرِضُونَ الأَعْرَابِيَّ فَيُسَاوِمُونَهُ بِالْفَرَسِ, وَلاَ يَشْعُرُونَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْتَاعَهُ, فَنَادَى الأَعْرَابِيُّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ مُبْتَاعًا هَذَا الْفَرَسَ وَإِلاَّ بِعْتُهُ, فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ سَمِعَ نِدَاءَ الأَعْرَابِيِّ فَقَالَ: (أَوَلَيْسَ قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ؟). فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: لاَ وَاللَّهِ مَا بِعْتُكَهُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَلَى قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ). فَطَفِقَ الأَعْرَابِيُّ يَقُولُ: هَلُمَّ شَهِيدًا!, فَقَالَ خُزَيْمَةُ بْنُ ثَابِتٍ: أَنَا أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَايَعْتَهُ.فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى خُزَيْمَةَ فَقَالَ: (بِمَ تَشْهَدُ؟). فَقَالَ: بِتَصْدِيقِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهَادَةَ خُزَيْمَةَ بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ.

واتە: لە عومارەی کوڕی خوزەیمەوە دەگێڕنەوە، کە مامی بۆی گێڕاوەتەوە.

مامی عومارە یەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەسپێکی کڕی لە عەرەبێکی دەشتەکی، داوای لێ کرد کە دوای بکەوێت بۆ ئەوەی پارەی ئەسپەکەی بداتێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پەلە ڕێی دەکرد، دەشتەکیەکە تەمەڵ بوو لەڕۆشتنداو دواکەوت، چەند کەسێ نەیان زانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەسپەکەی لێ کڕیوە سەوداو مامەڵەی ئەسپەکەیان کردو زیاتریان دایە، کابرای دەشتەکی هاواری کردو پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بانگ کرد وتی: ئەگەر تۆ ئەم ئەسپەت نەکڕیوە ئەوا دەیفرۆشم، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لە هاواری کابرای دەشتەکی بوو هەستایەوە، فەرمووی: (ئایا ئەسپەکەم لێ نەکڕیت؟)، وتی: نەخێر، سوێند بە (الله) تۆ ئەو ئەسپەت نەکڕیوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڵێ ئەسپەکەم لێ کڕیویت)، دەشتەکیەکە وتی: شایەت بێنە، خوزەیمە کە ئامادەی سەوداو مامەڵەکەش نەبوو وتی: من شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو ئەسپەت لێ کڕیوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕوی کردە خوزەیمەو فەرمووی: ( لەسەرچی شایەتی دەدەی لەکاتێکدا کە تۆ ئامادەی ئەو سەوداو مامەڵە نەبوویت؟ ) خوزەیمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ڕاستگۆیی تۆ شایەتی دەدەم لەبەرئەوەی تۆ هەواڵی ئاسمانمان بۆ دێنی و کەسێکی ڕاستگۆیت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شایەتیەکەی خوزەیمەی بە دوو شایەت وەرگرت.

## باسی سەبارەت بە بڕیار بە شایەتێك و سوێندێ.

## ٢١ - باب الْقَضَاءِ بِالْيَمِينِ وَالشَّاهِدِ.

٣٦٠٨ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە شایەتێك و سوێندێ بڕیاری داوە.

٣٦٠٩ - (صحيح مقطوع) عن عمرو بن دينار بإسناده ومعناه.

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان مانا هاتوە.

٣٦١٠ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ. قَالَ أبو دَاوُدَ: وَزَادَنِي الرَّبِيعُ بْنُ سُلَيْمَانَ الْمُؤَذِّنُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ: انا الشَّافِعِيُّ, عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسُهَيْلٍ, فَقَالَ: أَخْبَرَنِي رَبِيعَةُ - وَهُوَ عِنْدِي ثِقَةٌ - أَنِّي حَدَّثْتُهُ إِيَّاهُ, وَلاَ أَحْفَظُهُ. قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَدْ كَانَ أَصَابَتْ سُهَيْلاً عِلَّةٌ أَذْهَبَتْ بَعْضَ عَقْلِهِ, وَنَسِيَ بَعْضَ حَدِيثِهِ, فَكَانَ سُهَيْلٌ بَعْدُ يُحَدِّثُهُ عَنْ رَبِيعَةَ, عَنْهُ, عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە شایەتێك و سوێندێ بڕیاری داوە. (عبد العزيز) وتی: سوهەیل توشی نەخۆشیەك بوو، عەقڵی لاواز بوو، هەندێ لە فەرموودەکەی خۆی لەیاد چو، جا سوهەیل بۆی دەگێڕایەوە، لە ڕەبیعەوە، لە سوهەیل خۆیەوە. لەباوکیەوە.

٣٦١١ - (صحيح) عن سليمان بن بلال, عن ربيعة بإسناد أبي مصعب ومعناه, قَالَ سُلَيْمَانُ: فَلَقِيتُ سُهَيْلاً فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ, فَقَالَ: مَا أَعْرِفُهُ. فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ رَبِيعَةَ أَخْبَرَنِي بِهِ عَنْكَ. قَالَ: فَإِنْ كَانَ رَبِيعَةُ أَخْبَرَكَ عَنِّى فَحَدِّثْ بِهِ عَنْ رَبِيعَةَ عَنِّى.

واتە: لە ڕەبیعەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان سەنەدی ئەبوو موصعەب و بەهەمان

مانا هاتوە.سولەیمان وتی: گەیشتم بە سوهەیل دەربارەی ئەم فەرموودە پرسیارم نێ کرد، وتی: نایناسم، پێم وت: رەبیعە لەلایەن تۆوە هەواڵی پێداوم، ئەگەر رەبیعە هەواڵی پێداوی ئەوا باسی بکە لە رەبیعەوە لەمنەوە لەبەرئەوەی جێگەی متمانی منە.

٣٦١٢ - (ضعيف) عن زبيب العنبري قال: بَعَثَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَيْشًا إِلَى بَنِى الْعَنْبَرِ, فَأَخَذُوهُمْ بِرُكْبَةٍ - مِنْ نَاحِيَةِ الطَّائِفِ - فَاسْتَاقُوهُمْ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَرَكِبْتُ, فَسَبَقْتُهُمْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ, أَتَانَا جُنْدُكَ فَأَخَذُونَا, وَقَدْ كُنَّا أَسْلَمْنَا وَخَضْرَمْنَا آذَانَ النَّعَمِ, فَلَمَّا قَدِمَ بَلْعَنْبَرُ قَالَ لِي نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ لَكُمْ بَيِّنَةٌ عَلَى أَنَّكُمْ أَسْلَمْتُمْ قَبْلَ أَنْ تُؤْخَذُوا فِي هَذِهِ الأَيَّامِ؟). قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: (مَنْ بَيِّنَتُكَ؟). قُلْتُ: سَمُرَةُ - رَجُلٌ مِنْ بَنِى الْعَنْبَرِ - وَرَجُلٌ آخَرُ سَمَّاهُ لَهُ, فَشَهِدَ الرَّجُلُ, وَأَبَى سَمُرَةُ أَنْ يَشْهَدَ, فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ أَبَى أَنْ يَشْهَدَ لَكَ, فَتَحْلِفُ مَعَ شَاهِدِكَ الآخَرِ). قُلْتُ: نَعَمْ, فَاسْتَحْلَفَنِى, فَحَلَفْتُ بِاللَّهِ لَقَدْ أَسْلَمْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا وَخَضْرَمْنَا آذَانَ النَّعَمِ, فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اذْهَبوا فَقَاسِمُوهُمْ أَنْصَافَ الأَمْوَالِ, وَلاَ تَمَسُّوا ذَرَارِيَهُمْ, لَوْلاَ أَنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ ضَلاَلَةَ الْعَمَلِ مَا رَزَيْنَاكُمْ عِقَالاً). قَالَ الزُّبَيْبُ: فَدَعَتْنِى أُمِّى فَقَالَتْ: هَذَا الرَّجُلُ أَخَذَ زِرْبِيَّتِى فَانْصَرَفْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْنِى فَأَخْبَرْتُهُ, فَقَالَ لِي: (احْبِسْهُ). فَأَخَذْتُ بِتَلْبِيبِهِ, وَقُمْتُ مَعَهُ مَكَانَنَا, ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْنَا نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمَيْنِ فَقَالَ: (مَا تُرِيدُ بِأَسِيرِكَ؟). فَأَرْسَلْتُهُ مِنْ يَدِى, فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لِلرَّجُلِ: (رُدَّ عَلَى هَذَا زِرْبِيَّةَ أُمِّهِ الَّتِى أَخَذْتَ مِنْهَا). فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ, إِنَّهَا خَرَجَتْ مِنْ يَدِى. قَالَ: فَاخْتَلَعَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَيْفَ الرَّجُلِ, فَأَعْطَانِيهِ. وَقَالَ لِلرَّجُلِ: (اذْهَبْ فَزِدْهُ آصُعًا مِنْ طَعَامٍ). قَالَ: فَزَادَنِى آصُعًا مِنْ شَعِيرٍ.

واتە: لە زوبەیبی عەنبەریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوپایەکی نارد بۆ سەر بەنی عەنبەر، سوپاکە بەنی عەنبەریان گرت لە شیوی روکبە کە شوێنێکە لە دەوروبەری (طائف)، رەوانەیان کردن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سواری وڵاغەکەم بووم، پێشیان کەوتم چومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتم: سڵاو بەرەکەت و رەحمەتی خوات لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم. سەربازەکانت هاتون و گرتوینیان لەکاتێکدا کە ئێمە موسوڵمان بووین و، بەشێ لە گوێی وشترەکانمان بڕیوە نیشانەی ئەوە بوو کە موسوڵمان بوون، کاتێ کە بەنی عەنبەر گەیشتنە بەرەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (بەڵگەتان هەیە کە موسوڵمان بووبن پێش ئەوەی لەم رۆژانەدا بتانگرن؟)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (بەڵگەت چی یە؟)، وتم: سەموره شایەتە کە پیاوێ بوو لەهۆزی عەنبەر لەگەڵ پیاوێکی تر ناوی برد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پیاوەکە شایەتی دا کە موسوڵمان بوون، بەڵام سەموره رێگری کردو شایەتی نەدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە سەموره شایەتیت بۆ نادات ئایا سوێند دەخۆیت لەگەڵ شایەتەکەی تردا؟)، وتم: بەڵێ. سوێندی دام، منیش سوێندم بە (الله) خوارد کە لەفڵانە رۆژو فڵانە رۆژدا موسوڵمان بووین و، بەشێ لە گوێی وشترەکانمان بڕیوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە هاوەڵانی فەرموو: (بڕۆن نیوەی ماڵەکانیان بەرن و نیوەیان بۆ بگێڕنەوە، بەڵام دەست بۆ منداڵ و ئافرەتەکانیان مەبەن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوای گەورە لەناوچون و نەمانی سودی لە کردار و رەفتاردا خۆش ناوێت ئەوا حەبلێکم لێ کەم نەدەکرد)، زوبەیب وتی: دایکم بانگی کردم وتی: ئا ئەوە ئاماژەی کرد بۆ سەربازێ لە سوپاکە بەڕەکەی بردوم، منیش چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - واتە هەواڵەکەم پێ راگەیاند -، فەرمووی: (ئەو سەربازە حەبس بکە)، منیش پۆشاکەکەیم لەئاست ملی دا گرت و لە جێگایەکدا راوەستاین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەیری کردین راوەستاوین، فەرمووی: (چیت دەوێ لە دیلەکەت؟)، منیش بەرەڵام کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا بە سەربازەکەی فەرموو: (بەڕەکەی دایکی بۆ بۆ بگێڕەوە)، سەربازەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم لەدەستم دەرچوەو لەلای من نەماوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شمشێرەکەی لە سەربازەکە کردەوەو پێی دا لەجیاتی بەرەکەی دایکی، بە سەربازەکەی فەرموو: (برۆ چەند مەنێ خۆراکی بۆ زیاد بکە)، وتی: ئەویش چەند مەنێ جۆی بۆ زیاد کردم.

## باسی سەبارەت بە دوو کەس داواکاریان هەبێت لەسەر شتێك بەڵگەشیان نەبێت.

## ٢٢ - باب الرَّجُلَيْنِ يَدَّعِيَانِ شَيْئًا وَلَيْسَتْ لَهُمَا بَيِّنَةٌ.

٣٦١٣ - (ضعيف) عن أبي موسى الأشعري: أَنَّ رَجُلَيْنِ ادَّعَيَا بَعِيرًا, أَوْ دَابَّةً, إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْسَتْ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ, فَجَعَلَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا.

واتە: لە ئەبوو موسای ئەشعەریەوە دەگێرنەوە، کە دوو پیاو لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم داواکاریان هەبوو لەسەر وشترێ یان وڵاخێ هیچ کامیان شایەتی نەبوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دابەشی کرد لەنێوانیاندا کامیان هەڵی بگرێتەوە نیوەی قیمەتەکەی بدات بەوی تریان.

٣٦١٤ - عن سعيد, بإسناده ومعناه.

واتە: لە سەعیدەوە فەرموودەکەی پێشو بەهەمان مانا هاتوە.

٣٦١٥ - (ضعيف) عن قتادة: أَنَّ رَجُلَيْنِ ادَّعَيَا بَعِيرًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَبَعَثَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا شَاهِدَيْنِ, فَقَسَمَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە دوو پیاو لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم داواکاریان هەبوو لەسەر وشترێ، داوایان لێ کرا هەریەك لەوان دوو شایەت ئامادە بکات، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دابەشی کرد لەنێوانیاندا کامیان هەڵی بگرێتەوە نیوەی قیمەتەکەی بدات بەوی تریان.

٣٦١٦ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا فِي مَتَاعٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اسْتَهِمَا عَلَى الْيَمِينِ مَا كَانَ أَحَبَّا ذَلِكَ أَوْ كَرِهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە دوو پیاو لای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم کێشەیان هەبوو لەسەر کەلوپەلێ هیچ کامیان شایەتی نەبوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تیروپشك بکرێت بۆ سوێند خواردنەکەیان ئیتر پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێت).

٣٦١٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا كَرِهَ الِاثْنَانِ الْيَمِينَ, أَوِ اسْتَحَبَّاهَا فَلْيَسْتَهِمَا عَلَيْهَا). قَالَ سَلَمَةُ: قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ, وَقَالَ: إِذَا أُكْرِهَ الِاثْنَانِ عَلَى الْيَمِينِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر دوو کەس سوێندخواردنەکەیان پێ ناخۆش بێت، یان پێیان خۆش بێت دەبێ تیروپشك بکرێت بۆ سوێند خواردنەکەیان)، سەلەمە وتی: راوی وتی: مەعمەر هەواڵی پێداین وتی: ئەگەر دوو کەس سوێندخواردنەکەیان پێ ناخۆش بێت.

٣٦١٨ - (صحيح بما قبله) عن سعيد بن أبو عروبة بإسناد ابن منهال, مثله, قَالَ: فِي دَابَّةٍ وَلَيْسَ لَهُمَا بَيِّنَةٌ, فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَسْتَهِمَا عَلَى الْيَمِينِ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبوو عروبەوە بە سەنەدەکەی ئەبوو مینهال فەرموودەکەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە.سەبارەت بە ولاخێ کە دوو کەس بوو بە کێشەیان لەسەری هیچ کامیان و بەڵگەیان نەبوو لەسەری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردن بەوەی کە تیروپشك بکرێت بۆ سوێند خواردنەکەیان.

## باسی سەبارەت بە سوێندخواردن لەسەر داوالێکراوە.

## ٢٣ - باب الْيَمِينِ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ.

٣٦١٩ - (صحيح) عن ابن أبي مليكة قال: كَتَبَ إِلَيَّ ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالْيَمِينِ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عەباس بۆی نوسیم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیاری داوە کە سوێندخواردن لەسەر داوالێکراوە.

## باسی سەبارەت بە چۆنیەتی سوێندخواردنی داوالێکراو.

## ٢٤ - باب كَيْفَ الْيَمِينُ؟

٣٦٢٠ - عن ابن عباس: أن النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم قال:- يعني لرجل حلفه-: (احْلِفْ بِاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ مَا لَهُ عِنْدَكَ شَيْءٌ). يَعْنِى لِلْمُدَّعِى.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: - واتە بە پیاوێ کە سوێندی دا - : (سوێند بخۆ بەو خوایەی کە لەو زیاتر هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە: کە هیچی ئەو لەلای تۆ نیە). واتە هیچی داواکار لەلای تۆ نیە.

# باسی ئەگەر داوالێکراو (ذمي)[1] بوو سوێند دەدرێت؟

## ٢٥ - باب إِذَا كَانَ الْمُدَّعَى عَلَيْهِ ذِمِّيًّا أَيَحْلِفُ

٣٦٢١ - (صحيح) عن أشعث قال: كَانَ بَيْنِى وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ أَرْضٌ. فَجَحَدَنِى, فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟). قُلْتُ: لاَ. قَالَ لِلْيَهُودِيِّ: (احْلِفْ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذاً يَحْلِفَ وَيَذْهَبَ بِمَالِي. فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ). إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واتە: لە (أشعث)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پارچەیە زەویم هەبوو لە نێوان من و پیاوێکی جولەکەدا بوو، کێشە کەوتە نێوانمانەوە لەسەری جولەکەکە ئینکاری دەکردم و نکوڵی لیێ کرد زەویەکەی بە هی خۆی دەزانی، منیش سکاڵام بەرزکردەوە بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جولەکەکە بردە خزمەتی، پێی فەرمووم: (بەڵگەت هەیە؟). وتم: نەخێر، بە جولەکەکەی فەرموو: (سوێند بخۆ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەواتە سوێند دەخوات وماڵەکەی من دەبات بۆ خۆی، خوای پەروەردگار لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ سورە آل عمران: ٧٧.

واتە: بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم، ئەوانە بێبەشن لە (بەهرەی خوا) لەرۆژی دوایی داو، خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و، تەماشایان ناکات لەرۆژی قیامەتدا، وە لە گوناهیان خۆش نابێت، وە بۆ ئەوان هەیە سزای بە ئازار.

---

(١) (ذمي) بەو خاوەن نامە ئاسمانیانە دەوترێت کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا دەژین و پەنادراون و سەر و ماڵیان پارێزراوە.

## باسی کەسێ بە سوێند دەدرێت بە زانیاری خۆی دەربارەی شتێ کە نایزانێت.

## ٢٦ - باب الرَّجُلِ يَحْلِفُ عَلَى عِلْمِهِ فِيمَا غَابَ عَنْهُ.

٣٦٢٢ - (صحيح) عن الأشعث بن قيس: أَنَّ رَجُلاً مِنْ كِنْدَةَ وَرَجُلاً مِنْ حَضْرَمَوْتَ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَرْضٍ مِنَ الْيَمَنِ, فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّ أَرْضِي اغْتَصَبَنِيهَا أَبو هَذَا, وَهِيَ فِي يَدِهِ. قَالَ: (هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟). قَالَ: لاَ, وَلَكِنْ أُحَلِّفُهُ: وَاللَّهِ مَا يَعْلَمُ أَنَّهَا أَرْضِي اغْتَصَبَنِيهَا أَبوهُ, فَتَهَيَّأَ الْكِنْدِيُّ, يعني لِلْيَمِينِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَقْتَطِعُ أَحَدٌ مَالاً بِيَمِينٍ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ أَجْذَمُ). فَقَالَ الْكِنْدِيُّ: هِيَ أَرْضُهُ [١] .

واتە: لە (أشعث)ی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە هۆزی کیندە و پیاوێکی خەڵکی (حضرموت) لەخاکی یەمەن لەسەر پارچە زەوی یە کێشەو هەرا کەوتە نێوانیانەوە، سکاڵایاند گەیاندە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پیاوە (حَضْرَمِیُّ)ەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، باوکی ئەمە زەوییەکەی لێ داگیرکردوم و ئێستە بەدەست ئەمەوەیە، فەرمووی: (بەڵگەت هەیە؟). وتی: نەخێر، بەڵام سوێندی بۆ دەخۆم، کە نازانێ زەوی منەو باوکی داگیرکردوە لێم، پیاوە کیندیەکە خۆی ئامادەکرد بۆ سوێند خواردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەسێ ماڵێ بە سوێندی درۆ بیچرێت بۆ خۆی، کاتێ کە دەگات بە دیداری خوای پەروەردگار دوابڕاوەو هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیەو بە زمانیش ناتوانێ بەرگری لەخۆی بکات). پیاوە کیندیەکە وتی: زەوییەکە هی ئەوە.

---

(١) ئەم فەرمودەیە پێشتر هاتوە بە ژمارە: (٣٢٤٤).

٣٦٢٣ - (صحيح) عن علقمة بن وائل بن حجر الحضرمي, عن أبيه قال: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ وَرَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا غَلَبَنِي عَلَى أَرْضٍ كَانَتْ لأَبِي, فَقَالَ الْكِنْدِيُّ: هِيَ أَرْضِي فِي يَدِي أَزْرَعُهَا لَيْسَ لَهُ فِيهَا حَقٌّ, قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْحَضْرَمِيِّ: (أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَلَكَ يَمِينُهُ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ فَاجِرٌ لاَ يُبَالِي مَا حَلَفَ عَلَيْهِ لَيْسَ يَتَوَرَّعُ مِنْ شَيْءٍ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ لَكَ مِنْهُ إِلاَّ ذَاكَ) [1].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلی کوڕی حوجری (حَضْرَمِيُّ)ەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە خەڵکی (حضرموت) و پیاوێ لە هۆزی کیندە لەسەر کێشەی زەوی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پیاوە (حَضْرَمِيُّ)ەکە وتی: ئەم پیاوە زەوییەکی لێ داگیرکردوم بە زوڵم و ستەم کە هی باوکمە بۆی بەجێهێشتوم، پیاوە کیندیەکە وتی: موڵکی منەو بەدەست خۆمەوەیەو کشتوکاڵی تێدا دەکەم، ئەم پیاوە هیچ مافێکی بەو زەوییەوە نیە، وائیل وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پیاوە (حَضْرَمِيُّ)ەکەی فەرموو: (بەڵگەت هەیە؟). وتی: نەخێر، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە پیاوە کیندیەکەی فەرموو: (کەواتە سوێند خواردن لەسەر تۆیە دەبێ سوێندی بۆ بخۆی). پیاوە (حَضْرَمِيُّ)ەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم پیاوە پیاوێکی خراپکارە گوێ ناداتێ سوێندی لەسەر دەخوات خۆی لە هیچ شتێکی حەرام ناپارێزێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەر ئەوەندەی لەسەرە کە سوێند بخوات).

(١) ئەم فەرمودەیە پێشتر هاتوە بە ژمارە: (٣٢٤٥).

# باسی (ذمي) چۆن سوێند دەدرێت.

## ٢٧ - باب كَيْفَ يَحْلِفُ الذِّمِّيُّ.

٣٦٢٤ - (ضعيف) عن أبص هريرة قال: قال النبي صلى الله عليه و سلم - يعني لليهود - : (أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى مَا تَجِدُونَ فِى التَّوْرَاةِ عَلَى مَنْ زَنَى؟). وَسَاقَ الْحَدِيثَ فِى قِصَّةِ الرَّجْمِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم - بە جولەکەکانی - فەرموو: (سوێندتان دەدەم بەو(الله)یەی کە تەوراتی ناردەخوارەوە بۆسەر موسا لە تەواراتدا حوکمی کەسێ کە زینا بکات چی یە؟). جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە لە (قصه الرجم)بەسەرهاتی بەردەبارانکردن دا.

٣٦٢٥ - (ضعيف) عن الزهري: بِهَذَا الْحَدِيثِ وَبِإِسْنَادِهِ: قَالَ: حَدَّثَنِى رَجُلٌ مِنْ مُزَيْنَةَ مِمَّنْ كَانَ يَتَّبِعُ الْعِلْمَ وَيَعِيهِ يُحَدِّثُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ, وَسَاقَ الْحَدِيثَ بِمَعْنَاهُ.

٣٦٢٦ - (صحيح) عن عكرمة: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ يَعْنِى لاِبْنِ صُورِيَا (أُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى نَجَّاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ, وَأَقْطَعَكُمُ الْبَحْرَ, وَظَلَّلَ عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ, وَأَنْزَلَ عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى, وَأَنْزَلَ عَلَيْكُمُ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى, أَتَجِدُونَ فِى كِتَابِكُمُ الرَّجْمَ؟). قَالَ ذَكَّرْتَنِى بِعَظِيمٍ وَلاَ يَسَعُنِى أَنْ أَكْذِبَكَ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە عیکریمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم - بە ئیبنو (صوریا)ی - فەرمووی: (سوێندتان دەدەم بەو (الله)یەی کە رزگاری کردن لەدەست ئالی فیرعەون و، دەریای بۆ لەتکردن و لێیەوە پەڕینەوەو، هەوری بۆ کردن بەسێبەرو، تەوراتی ناردەخوارەوە بۆسەر موسا، لە کتێبەکەتاندا - واتە تەورات - حوکمی بەردەبارنکردن هاتوە). وتیان: بە گەورەو شکۆمەند سوێندت داین بۆیە درۆت لەگەڵ ناکەم. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

## باسی کەسێ سوێند بخوات لەسەر هەقی خۆی.

## ٢٨ - باب الرَّجُلِ يَحْلِفُ عَلَى حَقِّهِ.

٣٦٢٧ - (ضعيف) عن عوف بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ, فَقَالَ الْمَقْضِيُّ عَلَيْهِ لَمَّا أَدْبَرَ: حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ يَلُومُ عَلَى الْعَجْزِ, وَلَكِنْ عَلَيْكَ بِالْكَيْسِ, فَإِذَا غَلَبَكَ أَمْرٌ فَقُلْ: حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دادوەری کرد لەنێوان دوو کەسدا لەکاتێکدا لەسەر قەرز کێشە کەوتبووە نێوانیانەوە، ئەو کەسەی کە حوکمەکەی بەسەردا درا وتی: (حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ). واتە: خودام بەسە باشترین پشت و پەنامەو بەس، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (خوای گەورە لۆمەو سەرزەنشت لەسەر تەمەڵی دەکات، بەڵام تۆ لەسەرتە کارو کاسبی بکەیت، جا کاتێ کە شتێکی قورس و گرانت هاتەپێش ئەوکاتە بڵێ: (حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ).

## باسی سەبارەت بە قەرزارەند دەکرێت لەسەری.

## ٢٩ - باب فِي الدَّين هَل يُحبَس بِهِ.

٣٦٢٨ - (حسن) عن عمرو بن الشريد عن أبيه: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ). قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: (يُحِلُّ عِرْضَهُ): يُغَلَّظُ لَهُ, وَعُقُوبَتَهُ: يُحْبَسُ لَهُ.

واتە: لە عەمری کوڕی شەریدەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی: (قەرزکوێری دەوڵەمەند ئابڕووبردنی و سزادانی ڕەوا دەکات). ئیبنو موبارەك دەڵێت: (يُحِلُّ عِرْضَهُ) لەسەری توند دەکرێت، (وَعُقُوبَتَهُ) بەند کردنیەتی.

٣٦٢٩ - (ضعيف) هرماس بن حبيب - رجل من أهل البادية - عن أبيه, عن جده قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِغَرِيمٍ لِي, فَقَالَ لِي: (الْزَمْهُ). ثُمَّ قَالَ لِي: (يَا أَخَا بَنِي تَمِيمٍ مَا تُرِيدُ أَنْ تَفْعَلَ بِأَسِيرِكَ؟).

واتە: لە هیرماسی کوڕی حەبیبەوە کە پیاوێکی دەشتەکی بوو، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: قەرزارێکم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێی فەرمووم: (لای خۆت بیهێڵەرەوە). لەپاشدا فەرمووی: (ئەی برای بەنی تەمیم دەتەوێ چی لە دیلەکەت بکەیت؟).

٣٦٣٠ - (حسن) عن بهز بن حكيم, عن أبيه, عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَبَسَ رَجُلاً فِي تُهْمَةٍ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پیاوێکی لەسەر تۆمەت بەند کرد.

٣٦٣١ - (حسن الإسناد) عن بهز بن حكيم, عن أبيه, عن جده, قال ابن قدامة: إن أخاه أو عمه, وقال مؤمل: إِنَّهُ قَامَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَخْطُبُ, فَقَالَ: جِيرَانِي بِمَا أَخَذُوا, فَأَعْرَضَ عَنْهُ, مَرَّتَيْنِ, ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَلُّوا لَهُ عَنْ جِيرَانِهِ). لَمْ يَذْكُرْ مُؤَمَّلٌ: وَهُوَ يَخْطُبُ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە - موعاویە - دەگێڕنەوە، ئیبنو قودامە وتی: برکەی یان مامی موعاویە، مونەممەل وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتاری دەخوێندەوە موعاویە هەستا قسەی لەگەڵ کرد وتی: دراوسێکانی منتان بۆچی گرتون؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم روی لێ وەرگێڕا، دوو جار، لەپاشدا موعاویە باسی شتێکی کرد. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دراوسێکانی بۆ بەرەڵا بکەن). مونەممەل باسی ئەوەی نەکرد کە وتاری دەخوێندەوە.

## باسی سەبارەت بە وەکالەت.

## ٣٠ - باب فِي الْوَكَالَةِ.

٣٦٣٢ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله, قال: أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ, فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ, وَقُلْتُ لَهُ: إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ, فَقَالَ: (إِذَا أَتَيْتَ وَكِيلِي فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وَسْقًا, فَإِنِ ابْتَغَى مِنْكَ آيَةً, فَضَعْ يَدَكَ عَلَى تَرْقُوَتِهِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەمویست دەرچم بۆ خەیبەر، چومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلامم لێ کرد، پێم وت: دەمەوێت دەرچم بۆ خەیبەر، فەرمووی: (ئەگەر چویتە لای وەکیلەکەم پانزە وەسق خورما یان جۆی لێ وەربگرە، ئەگەر داوای بەڵگەو نیشانەی لێ کردی، دەست بخەرە بینە قاقای).

## باسی سەبارەت بە دادوەری.

## ٣١ - باب فِي الْقَضَاءِ.

٣٦٣٣ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا تَدَارَأْتُمْ فِي طَرِيقٍ فَاجْعَلُوهُ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەسەر ڕێگەیەك کێشەو ناکۆکی کەوتە نێوانتانەوە حەوت باڵ دابنێن بۆ ئەوەی وشترەکان بە بارەوە بە ئاسانی ڕێ بکەن). - بۆ ئێستا دەبێ بەگوێرەی پێویست بێت -.

٣٦٣٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ فَلاَ يَمْنَعْهُ). فَنَكَسُوا, فَقَالَ: مَا لِي أَرَاكُمْ قَدْ أَعْرَضْتُمْ؟ لأُلْقِيَنَّهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَهَذَا حَدِيثُ ابْنِ أَبِي خَلَفٍ وَهُوَ أَتَمُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە برایەکی لەکاتی دارڕادا مۆڵەتی لێ خواست سەری دارەکان لەسەر دیواری دابنێت با ڕێگری لێ نەکات). سەریان ڕاوەشاند، ئەبو هورەیرە وتی: ئەوە بۆچی دەتانبینم پشتتان لێ وەرگێڕاوە؟ سوێند بە (الله) فڕێی دەدەمە سەرشانتان.

٣٦٣٥ - (حسن) عن أبي صرمة صاحب النبي صلى الله عليه وسلم, عن النبي صلى الله عليه وآله وسلم أنه قال: (مَنْ ضَارَّ أَضَرَّ اللَّهُ بِهِ, وَمَنْ شَاقَّ شَاقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ).

واتە: لە ئەبوو صیرمەی هاوەڵی پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەوکەسەی زیان بگەیەنێت خوای گەورە زیانی پێ دەگەیەنێت بە هەمان شێوە تۆڵەی لێ دەکاتەوە، ئەوکەسەی کێشە دروست بکات بۆ برا موسوڵمانەکەی بە ناڕەوا باری سەرشانی قورس و گران بکات خوای گەورە بە هەمان شێوە تۆڵەی لێ دەکاتەوەو باری سەرشانی قورس و گران دەکات).

٣٦٣٦ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب: أَنَّهُ كَانَتْ لَهُ عَضُدٌ مِنْ نَخْلٍ فِي حَائِطِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ, قَالَ: وَمَعَ الرَّجُلِ أَهْلُهُ, قَالَ: فَكَانَ سَمُرَةُ يَدْخُلُ إِلَى نَخْلِهِ, فَيَتَأَذَّى بِهِ وَيَشُقُّ عَلَيْهِ, فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يَبِيعَهُ, فَأَبَى, فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يُنَاقِلَهُ, فَأَبَى, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ, فَطَلَبَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعَهُ, فَأَبَى, فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يُنَاقِلَهُ, فَأَبَى. قَالَ: (فَهَبْهُ لَهُ, وَلَكَ كَذَا وَكَذَا). أَمْرًا رَغَّبَهُ فِيهِ, فَأَبَى, فَقَالَ: (أَنْتَ مُضَارٌّ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلأَنْصَارِيِّ: (اذْهَبْ فَاقْلَعْ نَخْلَهُ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە پەڵە دارخورمایەکی لەناو باخی دارخورمای کابرایەکی ئەنصاریدا هەبوو، راوی وتی: کابرای ئەنصاری لەگەڵ خێزانەکەی لەناو باخەکەدا بوو، سەمورە دەچوە ناوی، ئەویش پێی ناخۆش بوو ئازاری پێ دەگەیشت و قورس و گران بوو لەسەری، داوای لێ کرد پێی بفرۆشێت، رازی نەبوو پێی نەفرۆشت، داوای لێ کرد بیان گوێزێتەوە، رازی نەبوو نەیگوێزانەوە، کابرای ئەنصاری چو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم داوای لێ کرد پێی بفرۆشێت، رازی نەبوو پێی نەفرۆشت، داوای لێ کرد بیان گوێزێتەوە، رازی نەبوو نەیگوێزانەوە، فەرمووی: (ئەو شتەو ئەو شتەت دەدەمێ)، هەر رازی نەبوو، فەرمووی: (دەی تۆ کەسێکی زیانبەخشی). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە کابرای ئەنصاری فەرموو: (بڕۆ دارخورماکانی سەمورە هەڵکێشە).

٣٦٣٧ - (صحيح) عن عبد الله بن الزبير: أَنَّ رَجُلاً خَاصَمَ الزُّبَيْرَ فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا, فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ, فَأَبَى عَلَيْهِ الزُّبَيْرُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلزُّبَيْرِ: (اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلْ إِلَى جَارِكَ). قال: فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ قَالَ: (اسْقِ, ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ). فَقَالَ الزُّبَيْرُ: فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ) الآيَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی ئەنصاری لەگەڵ باوکم بوو بە کێشەو هەرایان لەسەر سەرەی ئاو کە لە ئاوەڕۆکانی ئەلحەرڕەوە دەهات، باخە خورمایان پێ ئاو دەدا، پیاوە ئەنصاریەکە وتی: ئاوەکە بەردە با بڕوات بۆ ناو باخەکانی ئێمەش، زوبێر رازی نەبوو بەری نەدا، بۆ ئەو کێشەیە چونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە زوبێری فەرموو: (ئەی زوبێر باخەکەت ئاو بدە ئینجا ئاوەکە بەرەڵابکە بۆ دراوسێکەت). (عبد الله) وتی: پیاوە ئەنصاریەکە توڕە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە پورزای خۆتە، رووی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گۆڕاو رەنگی توڕەیی پێوە دیار بوو، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی زوبێر باخەکەت ئاو بدە، ئینجا ئاوەکە بگرەوە هەتا ئاوەکە دەدا لە قەدیان ئەوسا ئاوەکەش بگرەوە). زوبێر وتی: سوێند بە (الله) وا ئەزانم ئەم ئایەتە لەو بارەوە هاتە خوارەوە:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ سورە النساء: ٦٥.

واتە: نەخێر (وانی یە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن) سوێند بەپەروەردگارت بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا، لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزاری یەك لەو بڕیارەی تۆ داوتەو مل کەچ نەکەن بەملکەچی یەکی تەواو.

٣٦٣٨ - (صحيح) عن ثعلبة بن أبي مالك: أَنَّهُ سَمِعَ كُبَرَاءَهُمْ يَذْكُرُونَ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ قُرَيْشٍ كَانَ لَهُ سَهْمٌ فِي بَنِى قُرَيْظَةَ, فَخَاصَمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَهْزُورٍ يَعْنِى السَّيْلَ الَّذِى يَقْتَسِمُونَ مَاءَهُ, فَقَضَى بَيْنَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ الْمَاءَ إِلَى الْكَعْبَيْنِ لاَ يَحْبِسُ الأَعْلَى عَلَى الأَسْفَلِ.

واتە: (ثعلبة)ی کوڕی ئەبوو مالیك لە پیاوە گەورەکانیانی بیستوە گێڕاویانەتەوە: کە پیاوێ لە ( بَنِى قُرَيْظَةَ) بەشە باخێکی هەبوو، کێشەی دابەشکردنی ئاوی ئەو جۆگانەی کە باخ و باخاتەکانیان پێ دەدێرا گەیاندە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری بۆدان دوای ئەوەی ئاوەکە گەیشتە ئاستی قولە پێکان ئیتر نابێ لەسەرەوە بۆ خوارەوە بگیرێنەوە دەبێ بەربدرێنەوە.

٣٦٣٩ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي السَّيْلِ الْمَهْزُورِ أَنْ يُمْسَكَ حَتَّى يَبْلُغَ الْكَعْبَيْنِ, ثُمَّ يُرْسِلُ الأَعْلَى عَلَى الأَسْفَلِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بە ئاوی ئەو جۆگانەی کە باخ و باخاتیان پێ دەدێررێت بڕیاری داوە هەتا ئاوەکە دەگاتە ئاستی قولەپێکان دەبێ بگیرێنەوە، لەپاشدا دەبێ لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەربدرێنەوە.

٣٦٤٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: اخْتَصَمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاَنِ فِي حَرِيمِ نَخْلَةٍ - فِي حَدِيثِ أَحَدِهِمَا: فَأَمَرَ بِهَا فَذُرِعَتْ فَوُجِدَتْ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ, وَفِي حَدِيثِ الآخَرِ: فَوُجِدَتْ خَمْسَةَ أَذْرُعٍ - فَقَضَى بِذَاكَ. قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: فَأَمَرَ بِجَرِيدَةٍ مِنْ جَرِيدِهَا فَذُرِعَتْ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دوو پیاو سەبارەت بەو پەرژینی دارخورما لەکاتێکدا کە زەویەکە هی خاوەن دار خورماکە نەبێت کێشەیان گەیاندە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - لە فەرمووەدەی یەکێك لە راویەکاندا: فەرمانی کرد پێوانەی بکەن هەتا حەوت باڵ لەچواردەوری دارخورماکە بۆ ئەوەی بەرەکەی تێکەڵاوی بەری دارخوارمای دراوسێکەی نەبێت یان نەکەوێتە زەوی دراوسێکانی و ببێ بە کێشەو هەرایان لەسەری، لە فەرمودەکەی ئەوی تریاندا: هەتا پێنج باڵ - (عبد العزیز) وتی: فەرمانی کرد بە لقێ لە لقی دارخورماکە پێوانەی بکەن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوكی زانست و زانیاری

# ١٩ - أول كتاب العلم

## باسی هاندان لەسەر فێربوونی زانست و زانیاری.

## ١ - باب الْحَثِّ عَلَى طَلَبِ الْعِلْمِ.

٣٦٤١ - (صحيح) عن كثير بن قيس قال: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي الدَّرْدَاءِ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ, فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا الدَّرْدَاءِ, إِنِّي جِئْتُكَ مِنْ مَدِينَةِ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحَدِيثٍ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, مَا جِئْتُ لِحَاجَةٍ. قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا مِنْ طُرُقِ الْجَنَّةِ, وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ, وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالْحِيتَانُ فِي جَوْفِ الْمَاءِ, وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ, وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ, وَإِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ, فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ).

واتە: لە (كثیر)ی كوڕی قەیسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لە مزگەوتی دیمەشق لەگەڵ ئەبوو دەرداء دانیشتبووین، پیاوێ هات وتی: ئەی ئەبو دەرداء. من لەشارەكەی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتوم بۆ لات هیچ پێویستیەكم نیە تەنها ئەوەندە نەبێت بۆ فەرموودەیەك هاتوم كە پێم گەیشتوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم گێڕاوتەتەوە، ئەبو دەرداء وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە دەفەرموو: (هەر كەسێك

ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ئەوا خوای گەورە ڕێگەیە لە ڕێگاکانی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، مەلائیکەکان باڵیان رادەخەن بۆ ئەو کەسەی دەگەڕێت بە دوای زانستی شەرعیدا لەبەر ئەوەی رازین بەوەی بۆی دەگەڕێن، هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان داوای لێ خۆشبوون دەکەن بۆ شەرع زانەکان تەنانەت ماسیش لە دەریادا، گەورەیی و چاکێتی شەرع زان بە سەر بەندەی خوا پەرستدا وەك چاکێتی و جوانی مانگ وایە بە سەر هەموو ئەستێرەکانەوە، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و درهەمیان بە میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو تەنها زانستی شەرعیان بەجێ هێشتووە، جا هەرکەسێ بەدەستی خات ئەوا بەشێکی زۆری بەدەست خستووە).

٣٦٤٢ - عن أبو الدرداء, بمعناه - يعني عن النبي صلى الله عليه و سلم - .

واتە: لە ئەبو دەردائەوە فەرمودەی پێشو بەهەمان مانا هاتوە، واتە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم.

٣٦٤٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ رَجُلٍ يَسْلُكُ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا إِلاَّ سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقَ الْجَنَّةِ, وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕێگەی زانست بگرێ و عەوداڵی زانست و زانیاری بێ ئیللا خوای گەورە بە هۆی ئەوەوە ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، هەرکەسێ کار و کردەوەی دوای بخات، رەچەڵەك و نەسەبی پێشی ناخات).

# باسی ریوایەتی فەرموودەی خاوەن نامە ئاسمانیەکان.

## ٢ - باب رِوَايَةِ حَدِيثِ أَهْلِ الْكِتَابِ.

٣٦٤٦ - (ضعيف) عن أبو نملة الأنصاري: أَنَّهُ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ مُرَّ بِجَنَازَةٍ, فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ هَلْ تَتَكَلَّمُ هَذِهِ الْجَنَازَةُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُ أَعْلَمُ). فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: إِنَّهَا تَتَكَلَّمُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا حَدَّثَكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَلاَ تُصَدِّقُوهُمْ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ, وَقُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ فَإِنْ كَانَ بَاطِلاً لَمْ تُصَدِّقُوهُ, وَإِنْ كَانَ حَقًّا لَمْ تُكَذِّبُوهُ).

واتە: لە ئەبو نەملەی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە جارێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتوە، لەو کاتەدا پیاوێکی جولەکەی لێ بووە، تەرمێ بە لایاندا رەت بوو، جولەکەکە وتی: ئەی موحەممەد ئایا ئەو تەرمە قسە دەکات - لەگەڵ دوو مەلائیکەکەی ناو گۆڕ نەکیر و مونکیر - ؟ فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی دەیزانێت)، جولەکەکە وتی: بێگومان قسە دەکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر خاوەن نامە ئاسمانیەکان واتە جولەکەو گاورەکان شتێکیان بۆ باس کردن نە باوەڕیان پێ بکەن و نە بەدرۆشیان بخەنەوە، بڵێن باوەڕمان هەیە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، جا ئەگەر قسەکەیان ناهەق بوو ئەوا بەراستیان نازانن، خۆ ئەگەر قسەکەشیان هەق و راست بوو بەدرۆیان ناخەنەوە).

٣٦٤٥ - (حسن صحيح) عن زيد بن ثابت قال: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَعَلَّمْتُ لَهُ كِتَابَ يَهُودَ, وَقَالَ: (إِنِّي وَاللَّهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابِي). فَتَعَلَّمْتُهُ, فَلَمْ يَمُرَّ بِي إِلاَّ نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى حَذَقْتُهُ, فَكُنْتُ أَكْتُبُ لَهُ إِذَا كَتَبَ, وَأَقْرَأُ لَهُ إِذَا كُتِبَ إِلَيْهِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردم کە فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی جولەکە ببم منیش فێری زمانی جولەکە بووم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەمین نیم لە جولەکەکان نامەم بۆ بنوسن بۆ جولەکەکان یان نامەی جولەکەکانم بەڕاستی بۆ بخوێننەوە دەترسم شتێکی بۆ زیادو کەم بکەن)، ماوەی نیو مانگ تێ نەپەڕی بە باشی فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی جولەکە بووم و بەدڵنیاییەوە لێی تێ دەگەیشتم، ئەگەر بیویستایە نامە بنێرێ بۆ جولەکەکان من بۆم دەنوسی، هەروەها ئەگەر نامەشی بۆ بهاتایە لەلایەن جولەکەکانەوە ئەوا من بۆم دەخوێندەوە.

## باسی سەبارەت بە نوسینەوەی زانست.

## ٣ - باب فِي كِتَابَةِ الْعِلْمِ.

٣٦٤٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال:كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ حِفْظَهُ, فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا؟! فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ, فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَى فِيهِ, فَقَالَ: (اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلاَّ حَقٌّ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەر شتێکم لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ببیستایە هەموویم دەنوسیەوە هەتا لەبەری بکەم و بیپارێزم لە فەوتان، قورەیش ڕێگریان لێ کردم وتیان: تۆ هەموو شتێك دەنوسیتەوە کە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دەبیستی لەکاتێکدا کە ئەویش مرۆڤێکە لەکاتی توڕەبوون و ئارامی و ئاسایی دا قسە دەکات؟! ئیتر منیش وازم لە نوسین هێنا، باسەکەم بۆ

پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە پەنجەی دەستی ئاماژەی کرد بۆ دەمی خۆی و فەرمووی: (بنوسە سوێند بە (الله) ئەوەی هەق و ڕاست نەبێ لەم دەمە دەرناچێت).

٣٦٤٧ - (ضعيف الإسناد) عن المطلب بن عبد الله بن حنطب قال: دَخَلَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ عَلَى مُعَاوِيَةَ, فَسَأَلَهُ عَنْ حَدِيثٍ, فَأَمَرَ إِنْسَانًا يَكْتُبُهُ, فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَنَا أَنْ لاَ نَكْتُبَ شَيْئًا مِنْ حَدِيثِهِ, فَمَحَاهُ.

واتە: لە (مطلب)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (حنطب)ەوە دەگێڕنەوە. کە وتویەتی: زەیدی کوڕی (ثابت) چوەژوورەوە بۆلای موعاویە، دەربارەی فەرمودەیە لێی پرسی، فەرمانی کرد بە کەسێك فەرمودەکە بنوسێتەوە، زەید وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردوین هیچ شتێ لەفەرمودەکانی نەنوسینەوە، ئیتر موعاویە سڕییەوە.

٣٦٤٨ - (شاذ) عن أبو سعيد الخدري قال: مَا كُنَّا نَكْتُبُ غَيْرَ التَّشَهُّدِ وَالْقُرْآنِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە جگە لە تەحیات و قورئان هیچ شتێکی ترمان نەدەنوسیەوە.

٣٦٤٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: لَمَّا فُتِحَتْ مَكَّةُ قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ الْخُطْبَةَ خُطْبَةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ أَبوو شَاهٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اكْتُبووا لِي. فَقَالَ: (اكْتُبووا لأَبِي شَاهٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوای ئەوەی کە شاری مەککە رزگار کرا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا وتاری بۆدان، باسی وتارەکەی کرد، وتارەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ڕاوی وتی: پیاوێ

لە خەڵکی یەمەن کە پێیان دەوت ئەبو شاە هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمان بدە کە ئەم وتارەم بۆ بنوسنەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بینوسنەوە بۆ ئەبو شاە).

٣٦٥٠ - (صحيح مقطوع) عن الوليد قال: قُلْتُ لأَبِي عَمْرٍو: مَا يَكْتُبوهُ؟ قَالَ: الْخُطْبَةَ الَّتِى سَمِعَهَا يَوْمَئِذٍ مِنْهُ.

واتە: لە وەلیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم بە ئەبو عەمر — واتە پێشەوا ئەوزاعی - : ئەبو شاە چ پرسیارێکی کرد هەتا بۆی بنوسنەوە، وتی: ئەو وتارە بوو کە لەوکاتەدا بیستی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

## باسی سەبارەت بە هەڕەشەی توند لەو کەسانەی کە بە ناوی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم درۆ دەکەن.

## ٤ - باب فِي التَّشْدِيدِ فِي الْكَذِبِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

٣٦٥١ - (صحيح) عن عامر بن عبد الله بن الزبير, عن أبيه قال: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قُلْتُ لِلزُّبَيْرِ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تُحَدِّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا يُحَدِّثُ عَنْهُ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كَانَ لِي مِنْهُ وَجْهٌ وَمَنْزِلَةٌ, وَلَكِنِّى سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبوأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە عامیری کوڕی (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم بە زوبێر: چی ڕێگری ئەوەی لێ کردوی فەرموودە بگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم وەك چۆن هاوڕێکانت فەرموودەی لێوە دەگێڕنەوە؟ زوبێر وتی: سوێند بە (الله) من لە ئەو نزیکم و خزمایەتی

و رێزم هەیە بەڵام ئەوەندە هەیە کە من لێم بیستوە دەیفەرموو: (هەرکەسێ بە ئەنقەست درۆ بەناوی منەوە بکات با جێگەیە لە ئاگری دۆزەخ دا بۆ خۆی دابنێ).

## باسی قسەکردن لەبارەی قورئانەوە بەبێ زانست.

## ٥ - باب الْكَلاَمِ فِي كِتَابِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ.

٣٦٥٢ - (ضعيف) عن جندب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَالَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِرَأْيِهِ فَأَصَابَ فَقَدْ أَخْطَأَ).

واتە: لە جوندوبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بە راوبۆچونی خۆی بدوێ لەبارەی دەربڕین و مانای ئایەتەکانی قورئانەوە ئەگەر بیشی پێکێ هەر نەی پێکاوەو هەڵەدەکات).

## باسی دووپاتکردنەوەی فەرمودە.

## ٦ - باب تَكْرِيرِ الْحَدِيثِ.

٣٦٥٣ - (ضعيف الاسناد) عن أبو سلام, عن رجل خدم النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا حَدَّثَ حَدِيثًا أَعَادَهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

واتە: لە ئەبو سەلامەوە، لە پیاوێکەوە کە خزمەتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەکرد دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمودەیەکی دەگێڕایەوە سێ جار دووپاتی دەکردەوە.

## باسی گێڕانەوەی فەرموودە بە پەلە.

## ٧ - باب فِي سَرْدِ الْحَدِيثِ.

٣٦٥٤ – (صحيح) عن عروة قال: جَلَسَ أَبو هُرَيْرَةَ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا, وَهِيَ تُصَلِّي, فَجَعَلَ يَقُولُ: اسْمَعِي يَا رَبَّةَ الْحُجْرَةِ, مَرَّتَيْنِ, فَلَمَّا قَضَتْ صَلاَتَهَا قَالَتْ: أَلاَ تَعْجَبُ إِلَى هَذَا وَحَدِيثِهِ! إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُحَدِّثُ الْحَدِيثَ لَوْ شَاءَ الْعَادُّ أَنْ يُحْصِيَهُ أَحْصَاهُ.

واتە: لە عورووەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەبو هورەیرە لە تەنیشت هۆدەکەی عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دانیشتبوو، لەوکاتەدا عائیشە نوێژی دەکرد، ئەبوو هورەیرە دوو جار لەسەریەك وتی: ئەی خاوەن هۆدە گوێم لێ بگرە، کاتێ کە عائیشە لەنوێژ بوویەوە وتی: ئەوە سەرت سوڕنامێنێ لەو پیاوەو لە فەرموودەکەی کە چۆن بە پەلە دەیگێڕێتەوە! کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمایشتێکی بفەرموایە ئەوەندە لەسەرخۆ و بە شێنەیی دەیفەرموو ئەگەر کەسێ بیویستایە قسەکانی بژمێرێ دەیژماردن.

٣٦٥٥ - (صحيح) عن عروة بن الزبير: أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: أَلاَ يُعْجِبُكَ أَبو هُرَيْرَةَ؟ جَاءَ فَجَلَسَ إِلَى جَانِبِ حُجْرَتِي يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْمِعُنِي ذَلِكَ, وَكُنْتُ أُسَبِّحُ, فَقَامَ قَبْلَ أَنْ أَقْضِيَ سُبْحَتِي, وَلَوْ أَدْرَكْتُهُ لَرَدَدْتُ عَلَيْهِ, إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيثَ مِثْلَ سَرْدِكُمْ.

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە عائیشەی خێزانی رەزای خوای لێ بێ وتی: سەرت سوڕنامێنێ لە ئەبو هورەیرە؟ هاتوە لەتەنیشت هۆدەکەی مندا دانیشتوەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگێڕێتەوە، دەنگ بەرزدەکاتەوە بۆ ئەوەی من گوێم لێی بێ، من لەوکاتەدا نوێژی سوننەتم

دەكرد، پێش ئەوەى نوێژەكەم تەواو بكەم ئەو هەستابوو رۆيشتبوو، ئەگينا بەربەرچم دەدايەوەو تێم دەگەياند، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لە قسەكردندا وەك ئێوە نەبوو لەسەرخۆ بە رونى و بە رەوانى فەرمايشتى دەفەرموو ئەگەر كەسێ بيويستايە قسەكانى بژمێرێ دەيژماردن.

## باسى خۆپاراستن لە فەتوادان.

## ٨ - باب التَّوَقِّي فِي الْفُتْيَا.

٣٦٥٦ - (ضعيف) عن معاوية: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْغَلُوطَاتِ.

واتە: لە موعاويەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم رێگرى كردوە لەو پرسيارانەى كە قورس و ناواقيعين و زانايان دەخەنە هەڵەوە يان بۆ ئەوەى بۆرِيان بدەن.

٣٦٥٧ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ). زَادَ سُلَيْمَانُ الْمَهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ: (وَمَنْ أَشَارَ عَلَى أَخِيهِ بِأَمْرٍ يَعْلَمُ أَنَّ الرُّشْدَ فِي غَيْرِهِ فَقَدْ خَانَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێرنەوە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (هەركەسێ يەكێ بە نەزانى بەبێ زانست فەتواى بۆ بدات ئەوە گوناهى بە ئەستۆى ئەو كەسەيە كە بە نەزانى فەتواى بۆ داوە). سولەيمانى مەهرى لە فەرمودەكەيدا ئەمەى بۆ زياد كرد: (هەركەسێ ئاماژە بدات بە برايەكى موسوڵمانى كە فلانە كار بكات باشە، لەهەمان كاتدا بزانێ كە ئەو كارە باش نيە، ئەوە ناپاكى و خيانەتى لەو برايە كردوە).

## باسی ناپەسەندی و خراپی ڕێگریکردن لە زانست.

## ٩ - باب كَرَاهِيَةِ مَنْعِ الْعِلْمِ.

٣٦٥٨ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك پرسیارێکی دەربارەی زانستی شەرعی لێ بکرێت بەڵام ئەو بیشارێتەوە ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا لەغاوی ئاگرینی لەدەم دەکات).

## باسی فەزڵ و گەورەیی بڵاوکردنەوەی زانست.

## ١٠ - باب فَضْلِ نَشْرِ الْعِلْمِ.

٣٦٥٩ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (تَسْمَعُونَ, وَيُسْمَعُ مِنْكُمْ, وَيُسْمَعُ مِمَّنْ سَمِعَ مِنْكُمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە فەرمودە دەبیستن و خەڵکیش لەئێوە دەبیستێ و خەڵکانی تریش لەوانەوە دەبیستن کە لەئێوەیان بیستوە).

٣٦٦٠ - (صحيح) عن زيد بن ثابت قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ, فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ, وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ لَيْسَ بِفَقِيهٍ).

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خوای گەورە ڕووی ئەو کەسە سپی بکات کە فەرموودەیەکی لە ئێمە بیستوەو لەبەری کردوە تا بیگەیەنێت بە کەسانی تر، لەبەرئەوەی هەندێ جار هەڵگری (فقه)زانستی شەرعی لەوانەیە بیگەیەنێت بە کەسێك کە باشتر و شارەزاتر بێت لەخۆی و زیاتر لێی حاڵی بێت. هەروەها هەندێ جار هەڵگری (فقه)زانستی شەرعی لەوانەیە فەقیهـ(فەقیە) نەبێت و باش لێی حاڵی نەبێت).

٣٦٦١ - (صحيح) عن سهل بن سعد, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَاللَّهِ لأَنْ يُهْدَى بِهُدَاكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ).

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) ئەگەر خوای گەورە بە هۆی ڕێنمویی و هیدایەتی تۆوە کەسێ ڕێنمویی و هیدایەت بدات چاکترە بۆ تۆ لە گەلە وشتری سور). - لەو سەردەمەدا گەلە وشتری سور بە بەهاترین ە بەنرخترین ماڵ و سامانی عەرەب بووە -.

## باسی قسەکردن لەبارەی گەلی جولەکەوە.

## ١١ - باب الْحَدِيثِ عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ.

٣٦٦٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (حَدِّثُوا عَنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەواڵی ڕاست و دروستی لەبارەی گەلی جولەکە بگێڕنەوە گوناهتان ناگات).

٣٦٦٣ - (صحيح الإسناد) عن عبد الله بن عمرو قال: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُنَا عَنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ حَتَّى يُصْبِحَ مَا يَقُومُ إِلاَّ إِلَى عُظْمِ صَلاَةٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی گەلی جولەکەوە هەتا نوێژی بەیانی قسەی بۆ کردین ئەگەر لەبەر فەرزی نوێژی بەیانی نەبووایە هەر بەردەوام دەبوو.

## باسی فێربوونی زانست بۆ غەیری خوای گەورە.

## ١٢ - باب فِى طَلَبِ الْعِلْمِ لِغَيْرِ اللَّهِ تَعَالَى.

٣٦٦٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَتَعَلَّمُهُ إِلاَّ لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنَ الدُّنْيَا: لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ زانستێکی شەرعی فێر ببێ خۆی دەبێ مەبەست لە فێربوونی ئەو زانستە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێ، بەڵام ئەم بۆ ئەوە خۆی فێر بکات شتێ لەماڵ و سامانی دنیای دەستکەوێت، ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەت دا بۆنی بەهەشت ناکات).

# باسی سەبارەت بە کێ شایەنترە بە ئامۆژگاریکردن و داستان و بەسەرهات گێڕانەوە بۆ خەڵك.

## ١٣ - باب فِي الْقَصَصِ.

٣٦٦٥ - (حسن صحيح) عن عوف بن مالك الأشجعي رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (لاَ يَقُصُّ إِلاَّ أَمِيرٌ أَوْ مَأْمُورٌ أَوْ مُخْتَالٌ).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە دەگێرنەوە،کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (کەس هەقی ئامۆژگاریکردنی خەڵکی نیە جگە لە فەرمانڕەوا یان کەسێ کە فەرمانڕەوا رێگەی بدات، یا کەسێك کە خۆی بە گەورە بزانێ و داوای گەورەیی و پلەو پایە بکات).

٣٦٦٦ - (ضعيف الا جملة دخول الجنة؛ فصحيحة) عن أبو سعيد الخدري قال: جَلَسْتُ فِي عِصَابَةٍ مِنْ ضُعَفَاءِ الْمُهَاجِرِينَ, وَإِنَّ بَعْضَهُمْ لَيَسْتَتِرُ بِبَعْضٍ مِنَ الْعُرْيِ, وَقَارِئٌ يَقْرَأُ عَلَيْنَا, إِذْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ عَلَيْنَا, فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَكَتَ الْقَارِئُ, فَسَلَّمَ, ثُمَّ قَالَ: (مَا كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّهُ كَانَ قَارِئٌ لَنَا يَقْرَأُ عَلَيْنَا, فَكُنَّا نَسْتَمِعُ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى جَعَلَ مِنْ أُمَّتِى مَنْ أُمِرْتُ أَنْ أَصْبِرَ نَفْسِى مَعَهُمْ). قَالَ: فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَطَنَا لِيَعْدِلَ بِنَفْسِهِ فِينَا, ثُمَّ قَالَ: بِيَدِهِ هَكَذَا, فَتَحَلَّقُوا, وَبَرَزَتْ وُجُوهُهُمْ لَهُ, قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرَفَ مِنْهُمْ أَحَدًا غَيْرِى, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَبْشِرُوا يَا مَعْشَرَ صَعَالِيكِ الْمُهَاجِرِينَ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ, تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَاءِ النَّاسِ بِنِصْفِ يَوْمٍ, وَذَاكَ خَمْسُ مِئَةِ سَنَةٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە،کە وتویەتی: دانیشتبووم لەناو کۆمەڵێ لە هەژارانی موهاجرین دا ئەوەندە روت و رەجاڵ بوون هەندێکیان بە هەندێکی تریان خۆیان داپۆشیبوو بۆ ئەوەی جەستەیان دەرنەکەوێت، قورئان خوێنێ قورئانی بۆ دەخوێندینەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات لەسەرمان راوەستا، کاتێ کە لەسەرمان راوەستا قورئان خوێنەکە بێ دەنگ بوو، جا سڵاوی کرد، لەپاشدا فەرمووی: (ئەوە چی دەکەن؟)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە قورئان خوێنمانە قورئانمان بۆ دەخوێنێ، ئێمەش گوێمان گرتوە لە قورئانەکەی خوای گەورە، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوپاس بۆ خوای گەورە لەناو گەلەکەی مندا کەسانێك هەن کە فەرمانم پێ کراوە لەگەڵیان خۆم رابگرم)، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناوەراستماندا دانیشت، لەپاشدا بە پەنجەی ئاماژەی کرد، هەڵقەببەستن، هەموویان رووبان لێیەوە دیاربوو، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ کام لەو کەسانەی وەك من نەدەناسی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (موژدەتان لێ بێ ئەی کۆمەڵی هەژار و نەدارای موهاجرین بە نور و روناکیەکی تەواو لە رۆژی قیامەتدا، بە نیو رۆژ پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە، کە دەکاتە پێنج سەد ساڵ).

٣٦٦٧ - (حسن) عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَعَالَى مِنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أَرْبَعَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ, وَلأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللَّهَ مِنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أَرْبَعَةً).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێ دانیشم لەنوێژی بەیانیەوە هەتا خۆر هەڵدێ یادی خوای گەورە بکەن ئەوە لەلام خۆشەویسترە

لەوەی کە چوار کۆیلە لە نەوەکانی ئیسماعیل رزگار بکەم، ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێ دانیشم یادی خوای گەورە بکەن لەنوێژی عەسرەوە هەتا خۆر ئاوا دەبێ ئەوە لەلام خۆشەویستره لەوەی کە چوار کۆیلە رزگار بکەم).

٣٦٦٨ - (صحيح) عن عبد الله قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (اقْرَأْ عَلَيَّ سُورَةَ النِّسَاءِ). قَالَ: قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟! قَالَ: (إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي). قَالَ: فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ حَتَّى إِذَا انْتَهَيْتُ إِلَى قَوْلِهِ: (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ) الآيَةَ, فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا عَيْنَاهُ تَهْمِلاَنِ.

واتە: لە (عبد الله)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (سورەتی (النساء)م بۆ بخوێنە). (عبد الله) وتی: وتم: ئەی من بۆتی بخوێنم لەکاتێکدا کە بۆ تۆ دابەزیوە؟! فەرمووی: (حەزدەکەم گوێم لەغەیری خۆم بێت کە بیخوێنێ)، (عبد الله) وتی: منیش بۆم خوێند هەتا گەیشتمە ئەم ئایەتە:

﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾. سوره النساء:٤١.

واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە)، تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بەشایەت بەسەر ئائەوانەوە.

(عبد الله) وتی: سەرم هەڵبڕی سەیردەکەم چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دێتەخوارەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرتای پەرتوکی شت خواردنەوە.

## ٢٠ – أول كتاب الأشربة

### باسی سەبارەت بە حەرامکردنی ئارەق و مەی.

### ١ - باب فِي تَحْرِيمِ الْخَمْرِ.

٣٦٦٩ - (صحيح) عن عمر رضي الله عنه قال: نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ يَوْمَ نَزَلَ وَهِيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: مِنَ الْعِنَبِ, وَالتَّمْرِ, وَالْعَسَلِ, وَالْحِنْطَةِ, وَالشَّعِيرِ, وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ, وَثَلاَثٌ وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا فِيهِنَّ عَهْدًا نَنْتَهِي إِلَيْهِ: الْجَدُّ, وَالْكَلاَلَةُ, وَأَبووابٌ مِنْ أَبوواب الرِّبَا.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: حەرامکردنی مەی دابەزی لەو رۆژەدا کە دابەزی مەی لەم پێنج شتە دروست دەکرا: ترێ، خورما، هەنگوین، گەنم، جۆ، مەی ئەوەیە مرۆڤ سەرخۆش بکات و عەقڵ و هۆش نەهێڵێ، خۆزگە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش ئەوەی بەجێمان بێڵێ و وەفات بکات ئەم سێ شتەی بۆ رون کردینایەتەوە: پشکی باپیرەو، کەلالەو، چەند بابەتێکی (ربا)سود.

٣٦٧٠ - (صحيح) عن عمر بن الخطاب قال: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شِفَاءً, فَنَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِى فِي الْبَقَرَةِ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ) الآيَةَ, قَالَ: فَدُعِيَ عُمَرُ, فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ, قَالَ:

اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شِفَاءً, فَنَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِي فِي النِّسَاءِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى). فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ يُنَادِي أَلاَ لاَ يَقْرَبَنَّ الصَّلاَةَ سَكْرَانُ, فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ, فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شِفَاءً, فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ) قَالَ عُمَرُ: انْتَهَيْنَا.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە. کە وتویەتی: سەرەتا کە حەرامکردنی مەی دابەزی پێشەوا عومەر وتی: خودایە لەبارەی عارەق و مەیەوە ڕونکردەوەیەکی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بکە. ئیتر ئەم ئایەتەی سورەتی (البقرە) دابەزی:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴾ سورە البقرە: ٢١٩.

واتە: وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ لەم دووانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێك هەیە بۆ خەڵکی، بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان.
پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا عومەری بانگ کردو ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە، پێشەوا عومەر وتی: خودایە لەبارەی عەرەق و مەیەوە ڕونکردەوەیەکی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بکە، ئیتر ئەم ئایەتەی سورەتی (النساء) دابەزی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾. النساء: ٤٣.

واتە: ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سەرخۆش بن هەتا بزانن چی دەڵێن.
جا جاڕچیەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی نوێژدا بانگەوازی کرد وتی: ئاگادارین با کەسی سەرخۆش نزیکی نوێژ نەبێتەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا عومەری بانگ کردو ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە، پێشەوا عومەر وتی: خودایە لەبارەی عەرەق و مەیەوە ڕونکردەوەیەکی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بکە، ئیتر ئەم دوو ئایەتە دابەزی و بە یەکجاری حەرامی کرد:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ سوره المائده: ٩٠ - ٩١.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بیگومان بن کە ئارەق و قومارو ئەو بەردانەی کە کراون بەبت و، ئەو دارانەی (کە بەکاردەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنوس) ئەوانە پیسن و لە کردەوە ناشیرینەکانن، کەواتە دوورکەونەوە لێی تا رزگارین، بێگومان شەیتان ئەوەی دەوێت کە دوژمنایەتی بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارق و قومارەوە بەرگریتان بکات لە یادی خواو نوێژکردن، دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن؟.
پێشەوا عومەر وتی: بەڵێ واز دەهێنن.

٣٦٧١ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ دَعَاهُ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ, فَسَقَاهُمَا قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ, فَأَمَّهُمْ عَلِيٌّ فِي الْمَغْرِبِ فَقَرَأَ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) فَخَلَطَ فِيهَا, فَنَزَلَتْ: (لاَ تَقْرَبوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی ئەنصاری ئەو و (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفی دەعوەت کرد پێش ئەوەی مەی حەرام بکرێت مەیی دەرخوارد دان، بۆ نوێژی مەغریب پێشەوا عەلی بەرنوێژی بۆ کردن ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ خوێند، هەڵەی تێدا کرد، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾. النساء: ٤٣.

واتە: ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سەرخۆش بن هەتا بزانن چی دەڵێن.

٣٦٧٢ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى) وَ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ) نَسَخَتْهُمَا الَّتِى فِى الْمَائِدَةِ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصَابُ ...) الآيَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەم دوو ئایەتە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾. سورە النساء: ٤٣.

﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا ﴾ سورە البقرە: ٢١٩.

نەسخ کرانەوە بەم دوو ئایەتەی سورەتی (المائدە):

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾.

سورە المائدە: ٩٠ - ٩١.

٣٦٧٣ - (صحيح) عن أنس قال: كُنْتُ سَاقِىَ الْقَوْمِ حَيْثُ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ فِى مَنْزِلِ أَبِى طَلْحَةَ, وَمَا شَرَابُنَا يَوْمَئِذٍ إِلاَّ الْفَضِيخُ, فَدَخَلَ عَلَيْنَا رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ, وَنَادَى مُنَادِى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْنَا: هَذَا مُنَادِى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەکاتێدا کە مەی حەرام کرا من ساقی هۆزێك بووم واتە مەیم بۆ دەگێڕان لەماڵی ئەبوو (طَلْحَة)، خواردنەوەی ئێمە لەوکاتەدا جگە لە (فَضِیخ) هیچ شتێکی تر نەبوو - (فَضِیخ) جۆرە شەرابێك بووە -، پیاوێ هاتە ژورەوە وتی: بێگومان مەی حەرام کراوە، جاڕچیەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بانگەوازی کرد کە هۆشیاربن مەی حەرام کراوە، ئێمەش وتمان: ئەوە جاڕچیەکەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

## باسی ترێ دەگوشرێت بۆ عەرەق و مەی.

## ٢ - باب الْعِنَبِ يُعْصَرُ لِلْخَمْرِ.

٣٦٧٤ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَعَنَ اللَّهُ الْخَمْرَ, وَشَارِبَهَا, وَسَاقِيَهَا, وَبَائِعَهَا, وَمُبْتَاعَهَا, وَعَاصِرَهَا, وَمُعْتَصِرَهَا, وَحَامِلَهَا, وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە مەی و عەرەق، نەفرەتی کردووە لەوەی دەیخواتەوە، لەوەی مەی گێڕە، ئەوەی دەیفرۆشێت، ئەوەی دەیکڕێت، ئەوەی دەیگوشێت و ئامادەی دەکا، ئەوەی بۆی دەگوشن و بۆی ئامادە دەکەن، ئەوەی هەڵی دەگرێت و دەیگوێزێتەوە، ئەوەی بۆی دەگوێزنەوە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی مەی بکرێتەوە بە سرکە.

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي الْخَمْرِ تُخَلَّلُ.

٣٦٧٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَيْتَامٍ وَرِثُوا خَمْرًا, قَالَ: (أَهْرِقْهَا). قَالَ: أَفَلاَ أَجْعَلُهَا خَلاًّ؟ قَالَ: (لاَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبوو (طَلْحَة) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەبارەت بە چەند هەتیوێك کە مەی و عەرەقیان بە میرات بۆ مابێتەوە؟ فەرمووی: (بیڕژێنە)، وتی: ئەی نەیکەمەوە بە سرکە؟ فەرمووی: (نەخێر).

## باسی مەی لەچی دروست دەکرێت.

## ٤ - باب الْخَمْرِ مِمَّا هِيَ؟

٣٦٧٦ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ مِنَ الْعِنَبِ خَمْرًا, وَإِنَّ مِنَ التَّمْرِ خَمْرًا, وَإِنَّ مِنَ الْعَسَلِ خَمْرًا, وَإِنَّ مِنَ الْبُرِّ خَمْرًا, وَإِنَّ مِنَ الشَّعِيرِ خَمْرًا).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە ترێ مەی دروست دەکرێت، لە خورما دروست دەکرێت، لە هەنگوین مەی دروست دەکرێت، لە گەنم مەی دروست دەکرێت، لە جۆ مەی دروست دەکرێت).

٣٦٧٧ - (صحيح) عن النعمان بن بشير قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنَّ الْخَمْرَ مِنَ الْعَصِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ وَالْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالذُّرَةِ, وَإِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (مەی دروست دەکرێت لە: دۆشاوی ترێ و مێوژو خورماو گەنم و جۆ و زەڕات، بەڵام من ڕێگریتان لێ دەکەم لە هەموو سەرخۆشکەرێك لەبەرئەوەی هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە).

٣٦٧٨ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ: النَّخْلَةِ, وَالْعِنَبَةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەی لەم دوو درەختە دروست دەکرێت: دار خورما و مێو واتە لە خورماو ترێ دروست دەکرێت کە بەری ئەو دوو درەختەن).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی مادە سەرخۆشکەرەکان.

## ٥ - باب ما جاء في السكر.

٣٦٧٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ, وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ, وَمَنْ مَاتَ وَهُوَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ يُدْمِنُهَا لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الآخِرَةِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو سەرخۆشکەرێك عەرەق و مەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە، هەرکەس لە دنیادا بەردەوام بێت لەسەر خواردنەوەی مەی و تەوبەی لێ نەکات و لەسەر ئەو حاڵە بمرێ لەرۆژی قیامەتدا نایخواتەوەو بێ بەش دەکرێت لێی).

٣٦٨٠ - (صحيح) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (كُلُّ مُخَمِّرٍ خَمْرٌ, وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ, وَمَنْ شَرِبَ مُسْكِرًا بُخِسَتْ صَلاَتُهُ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا, فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ, فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ). قِيلَ: وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (صَدِيدُ أَهْلِ النَّارِ, وَمَنْ سَقَاهُ صَغِيرًا لاَ يَعْرِفُ حَلاَلَهُ مِنْ حَرَامِهِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو سەرخۆشکەرێك عەرەق و مەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە، هەرکەس مادەی سەرخۆشکەر بخواتەوە تا چل رۆژ نوێژی قبووڵ نابێ، بەڵام ئەگەر تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە

خوای گەورە تەوبەی قبووڵ دەکات، ئەگەر بۆ جاری چوارەم دەستی کردەوە بە مەی خواردنەوە دەبێ بە هەق لەسەر خوای گەورە کە (طِينَةِ الْخَبَالِ)ی دەرخوارد بدات، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (طِينَةِ الْخَبَالِ) چیە؟ فەرمووی: (کێم و زوخاوی دۆزەخیەکانە، هەرکەس مەی دەرخواردی منداڵێ بدات لەکاتێکدا کە ئەو منداڵە حەڵاڵ و حەرام لەیەك جیاناکاتەوە دەبێ بە هەق لەسەر خوای گەورە کە کێم و زوخاوی دۆزەخیەکان دەرخواردی ئەو کەسە بدات).

٣٦٨١- (حسن صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرشتێك زۆرێك لێی مرۆڤ سەرخۆش بکات، کەمەکەشی هەر حەرامە).

٣٦٨٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْبِتْعِ فَقَالَ (كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ). عَنِ الزُّهْرِيِّ بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ زَادَ وَالْبِتْعُ نَبِيذُ الْعَسَلِ كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَشْرَبُونَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مَا كَانَ أَثْبَتَهُ مَا كَانَ فِيهِمْ مِثْلُهُ يَعْنِي فِي أَهْلِ حِمْصَ يَعْنِي الْجُرْجُسِيَّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە (بتع) کە حەرامە یان نا؟ (بتع) شەرابی خەڵکی یەمەن بوو لە هەنگوین دروست دەکرا، فەرمووی: (هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ مەست و سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە).

(بتع) شەرابی خەڵکی یەمەن بوو لە هەنگوین دروست دەکرا، فەرمووی: (هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ مەست و سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە).

٣٦٨٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْبِتْعِ، فَقَالَ: (كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە (بتع) کە حەرامە یان نا؟ (بتع) شەرابی خەڵکی یەمەن بوو لە هەنگوین دروست دەکرا، فەرمووی: (هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ مەست و سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە).

عن الزوهرى بِهَذَا الْحَدِيثِ, بِإِسْنَادِهِ, زَادَ: وَالْبِتْعُ نَبِيذُ الْعَسَلِ, كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَشْرَبونَهُ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مَا كَانَ أَثْبَتَهُ مَا كَانَ فِيهِمْ مِثْلُهُ يَعْنِى فِي أَهْلِ حِمْصَ يَعْنِى الْجُرْجُسِىَّ.

واتە: لە زوهریەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بتع) دۆشاوی هەنگوینە، خەڵکی یەمەن دەیاخواردەوە. ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو دەیوت: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، بۆی ناسەلمێنرێت، شتی لەو جۆرەیان نەبوو واتە لەناو خەڵکی حیمص دا کەسی وەك یەزیدی کوڕی عبد ربەی جورجوسی نەبوو جێگەی دڵنیایی و متمانە بێت.

٣٦٨٣ - (صحيح) عن ديلم الحميري قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّا بِأَرْضٍ بَارِدَةٍ نُعَالِجُ فِيهَا عَمَلاً شَدِيدًا, وَإِنَّا نَتَّخِذُ شَرَابًا مِنْ هَذَا الْقَمْحِ نَتَقَوَّى بِهِ عَلَى أَعْمَالِنَا وَعَلَى بَرْدِ بِلاَدِنَا, قَالَ: (هَلْ يُسْكِرُ). قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ (فَاجْتَنِبوهُ). قَالَ: قُلْتُ: فَإِنَّ النَّاسَ غَيْرُ تَارِكِيهِ! قَالَ: (فَإِنْ لَمْ يَتْرُكُوهُ فَقَاتِلُوهُمْ).

واتە: لە دەیلەمی حیمیەرییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله

علیه وسلم ئێمە لەولاتێکی سارد و سەرماو سۆڵەدا دەژین بەهێزی بازوو کاری تێدا دەکەین، جۆرە خواردنەوەیە لەم گەنمە دروست دەکەین، یارمەتیمان دەدات بۆ کارکردن و چارەسەری سەرماو سۆڵەی ولاتەکەشمان دەکات، فەرمووی: (ئایا مرۆڤ سەرخۆش دەکات؟)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (لێی دووربکەوەرەوە)، وتی: وتم: خەڵکەکە تەرکی ناکەن و دەستی لێ هەڵناگرن، فەرمووی: (ئەگەر هەر وازیان نەهێناو تەرکیان نەکرد جەنگیان لەگەڵ بەرپا بکەن).

٣٦٨٤ - (صحيح) عن أبي موسى قال: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَرَابٍ مِنَ الْعَسَلِ, فَقَالَ: (ذَاكَ الْبِتْعُ). قُلْتُ: وَيُنْتَبَذُ مِنَ الشَّعِيرِ وَالذُّرَةِ. فَقَالَ: (ذَاكَ الْمِزْرُ). ثُمَّ قَالَ (أَخْبِرْ قَوْمَكَ أَنَّ كُلَّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).

واتە: لە ئەبوو موساوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەبارەت بەو شەرابەی کە لەهەنگوین دروست دەکرێت، فەرمووی: (ئەوە (بتع)ە)، وتم: دۆشاوێکە لە جۆ و زەرات دروست دەکرێت، فەرمووی: (ئەوە (مزر)ە)، لەپاشدا فەرمووی: (بە قەومەکەت رابگەیەنە کە هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە ئیتر لەهەرچی دروست دەکرێت).

٣٦٨٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَالْكُوبَةِ وَالْغُبَيْرَاءِ, وَقَالَ (كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە مەی و قومار و (كُوبَة) دەڵێن تەپڵە یان هەر ئالەتێکە ژەنینە لە نادی و مەلهاکاندا دەیژەنن، وە (غبيراء) جۆرێکە لە شەراب حەبەشیەکان لە زەرات دروستیان دەکرد. هەروەها فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە)،

٣٦٨٦ - (ضعيف) عن أم سلمة قالت: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ وَمُفَتِّرٍ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی كردوە لە هەموو سەرخۆشكەرێك و (مفتر)ێك هەر شەرابێ مرۆڤ لەسەر حاڵەتی ئاسایی خۆی نەهێێڵێ.

٣٦٨٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ, وَمَا أَسْكَرَ مِنْهُ الْفَرْقُ فَمِلْءُ الْكَفِّ مِنْهُ حَرَامٌ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەموو سەرخۆشكەرێ حەرامە، هەرشتێك (فرق)ێك لێی حەرام بێت ئەوە پڕی مشتێكیشی حەرامە).

## باسی سەبارەت بە (الداذي).

### ٦ - باب فِي الدَّاذِيِّ.

٣٦٨٨ - (صحيح) عن مالك بن أبو مريم قال: دَخَلَ عَلَيْنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَنْمٍ فَتَذَاكَرْنَا الطِّلَاءَ فَقَالَ حَدَّثَنِي أَبو مَالِكٍ الأَشْعَرِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا).

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەبو مەریەمەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: (عبد الرحمن)ی كوڕی غەنم هاتەژوورەوە بۆ لامان لەوكاتەدا باسی (طِّلَاء)مان دەكرد - (طِّلَاء) بریتیە لە دۆشاوی ترێ ئەوەندە دەكوڵێنرێت هەتا دوو بەش لەسێ بەشی دەڕوات و خەست دەبێتە - وتی: ئەبو مالیكی ئەشعەری بۆی گێڕامەوە كە گوێی لە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە دەیفەرموو: (خەڵکانێك لە ئوممەتی من عەرەق و مەی دەخۆنەوەو ناوی تری لێ دەنێن).

٣٦٨٩ - (صحيح) عن الحارث بن منصور قال: سمعت سفيان الثوري وسئل عن الداذي فقال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا). قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَقَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: الدَّاذِيُّ شَرَابُ الْفَاسِقِينَ.

واتە: لە (حارث)ی کوڕی مەنصورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە سوفیانی (پوری) بوو لەکاتێکدا کە پرسیاریان لێ کرد دەربارەی (الداذي) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکانێك لە ئوممەتی من عەرەق و مەی دەخۆنەوەو ناوی تری لێ دەنێن). ئەبو داود دەڵێت: وە سوفیانی (پوری) وتی: (الداذي) شەرابی فاسقەکانە.

## باسی سەبارەت بە دەفرەکان.

## ٧ - باب فِي الأَوْعِيَةِ.

٣٦٩٠ - (صحيح) عن ابن عمر و ابن عباس قالا: نَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ وَالنَّقِيرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباس و ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویانە: شایەتی دەدەین کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە خواردنەوەی خۆشاوی ناو ئەم دەفرانە چونکە زوو دەترشێن و دەبن بە مەی: کولەکە، کوپەڵەو گۆزەی قیردراو، زفت دراو واتە شتێ بە زفت روکەش کرابێت، هەروەها هەڵکۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما.

٣٦٩١ - (صحيح) عن سعيد بن جبير قال: سمعت عبد الله بن عمر يقول عن عبد الله بن عمر قال: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيذَ الْجَرِّ, فَخَرَجْتُ فَزِعًا مِنْ قَوْلِهِ حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيذَ الْجَرِّ, فَدَخَلْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: أَمَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ ابْنُ عُمَرَ قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ قُلْتُ: قَالَ حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيذَ الْجَرِّ. قَالَ صَدَقَ حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيذَ الْجَرِّ. قُلْتُ: مَا الْجَرُّ؟ قَالَ: كُلُّ شَيْءٍ يُصْنَعُ مِنْ مَدَرٍ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە (عبد الله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەربەتی گۆزەو مەرکانەی حەرام کردوە، لەبەر وتەکەی لەو شوێنە بە ترس و لەرزەوە دەرچوم، رۆشتم بۆ خزمەت ئیبنو عەباس وتم: گوێت لێ نیە ئیبنو عومەر دەڵێ چی؟ وتی: دەڵێ چی؟ وتم: دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەربەتی گۆزەو مەرکانەی حەرام کردوە، وتی: راست دەکات، وتم: (جَرِّ) چیە؟ وتی: هەرشتێ لە گڵ دروست بکرێت.

٣٦٩٢ - (صحيح) عن سليمان قال: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا هَذَا الْحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ, قَدْ حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارُ مُضَرَ, وَلَسْنَا نَخْلُصُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي شَهْرٍ حَرَامٍ, فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذُ بِهِ وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا. قَالَ: (آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ, وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ, الإِيمَانُ بِاللَّهِ: وَشَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). وَعَقَدَ بِيَدِهِ وَاحِدَةً. وَقَالَ مُسَدَّدٌ: (الإِيمَانُ بِاللَّهِ) ثُمَّ فَسَّرَهَا لَهُمْ: شَهَادَةَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ, وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ, وَإِقَامُ الصَّلاَةِ, وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ, وَأَنْ تُؤَدُّوا الْخُمُسَ مِمَّا غَنِمْتُمْ, وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ, وَالْحَنْتَمِ, وَالْمُزَفَّتِ, وَالْمُقَيَّرِ). وَقَالَ ابْنُ عُبَيْدٍ: النَّقِيرِ, مَكَانَ الْمُقَيَّرِ. وَقَالَ مُسَدَّدٌ: وَالنَّقِيرِ, وَالْمُقَيَّرِ, وَلَمْ يَذْكُرِ الْمُزَفَّتِ.

واتە: لە سولەیمانەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْسِ) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم تیرەیە لەهۆزی زەبیعەن، لەنێوان ئێمەو تۆدا كافرەكانی (مُضَرَ) هەن بۆیە بە ئاسانی ناتوانین بگەینە خزمەتت مەگەر لە مانگەكانی حەرام دا ئەو چوار مانگەی كە جەنگ تیایاندا حەرامەو كافرەكان جەنگمان لەگەڵ ناكەن، لەبەرئەوە شتێكمان فێربكە دەستی پێوە بگرین و خزمان و خەڵكی دەوروبەرمانی بۆ بانگ بكەین، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فەرمانتان پێ دەكەم بە چوار شت، وە چوار شتیشتان لێ قەدەغەدەكەم: (باوەڕ بە خوای گەورەو شایەتیدان بەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله). واتە: باوەڕ و ئیسلام یەك شتن نەیوت: دوو بەشن بەڵكو یەك بەشن، موسەددەد راوی فەرموودەكە وتی: (باوەڕ بە خوای گەورە) لەپاشدا راڤەی كرد بۆیان و فەرمووی: شایەتومان: كە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە لەلایەن خواوە رەوانەكراوە، نوێژكردن و، زەكات دەركردن و، پێنج یەك لە دەستكەوتی جەنگی دەربكەن، خواردنەوەی خۆشاوی ناو ئەمانەشتان لێ قەدەغەدەكەم: كولەكە، كوپەڵەو گۆزەی قیردراو، زفت دراو واتە شتێ بە زفت روكەش كرابێت، هەروەها هەڵكۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما.

٣٦٩٣ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال لوفد عبد القيس: (أَنْهَاكُمْ عَنِ النَّقِيرِ, وَالْمُقَيَّرِ, وَالْحَنْتَمِ, وَالدُّبَّاءِ, وَالْمَزَادَةِ الْمَجْبوبَةِ, وَلَكِنِ اشْرَبْ فِي سِقَائِكَ وَأَوْكِهْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْسِ)ی فەرموو: (خواردنەوەی خۆشاوی ناو ئەمانەشتان لێ قەدەغەدەكەم: زفت دراو واتە شتێ بە زفت روكەش كرابێت، بنی دار خورما تونكڵەكەی لێ دەكەنەوەو ناوەڕاستەكەی هەڵدەكۆڵرێت و شەرابی تێ دەكرێت، كوپەڵە، كولەكە، جەوەندەیەكی گەورە كە لە پێستی ئاژەڵ دروست دەكرا، بەڵام

لە كوندەدا بخۆنەوە دەمەكەی ببەستنەوە بۆ ئەوەی جانەوەر و مار و مێروی تێ نەچێت).

٣٦٩٤ - (صحيح) عن ابن عباس في قصة وفد عبد القيس قالوا: فِيمَ نَشْرَبُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (عَلَيْكُمْ بِأَسْقِيَةِ الأَدَمِ الَّتِى يُلاَثُ عَلَى أَفْوَاهِهَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ بە سەرهاتی نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْسِ) دەگێرنەوە، كاتێ كە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە چی دا بخۆینەوە ؟ فەرمووی: (ئاگاداربن لە پێستەی خۆشەكراودا بخۆنەوە بەڵام با دەمەكەی توند بەسترابێتەوە).

٣٦٩٥ - (صحيح) رجل كان من الوفد الذين وفدوا إلى النبي صلى الله عليه وسلم من عبد القيس يحسب عوف أن اسمه قيس بن النعمان فقال: (لاَ تَشْرَبوا فِي نَقِيرٍ, وَلاَ مُزَفَّتٍ, وَلاَ دُبَّاءٍ, وَلاَ حَنْتَمٍ, وَاشْرَبوا فِي الْجِلْدِ الْمُوكَإِ عَلَيْهِ, فَإِنِ اشْتَدَّ فَاكْسِرُوهُ بِالْمَاءِ, فَإِنْ أَعْيَاكُمْ فَأَهْرِيقُوهُ).

واتە: لە پیاوێكەوە كە یەكێ بووە لە نوێنەرەكانی (عَبْدِ الْقَيْسِ) كە چونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم عەوف پێی وابوو ناوی قەیسی كوڕی نوعمان بوو وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خۆشاو لەمانەدا مەخۆنەوە: هەڵكۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما، زفت دراو واتە شتێ بە زفت روكەش كرابێت، كولەكە، كوپەڵە، جەوەندەیەكی گەورە كە لە پێستی ئاژەڵ دروست دەكرا، بەڵام لە كوندەدا بخۆنەوە بە مەرجێ دەمەكەی بەسرابێتەوە، ئەگەر خۆشاوەكە خەست و توند بوو نەگەیشتبووە رادەی سەرخۆشكەر ئاوی تێ بكەن و بیخۆنەوە، بەڵام ئەگەر سەرخۆشی كردن بیرێژن).

٣٦٩٦ - (صحيح) عَن ابن عبَّاس: أَنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ فِيمَ نَشْرَبُ؟ قَالَ: (لاَ تَشْرَبُوا فِي الدُّبَّاءِ, وَلاَ فِي الْمُزَفَّتِ, وَلاَ فِي النَّقِيرِ, وَانْتَبِذُوا فِي الأَسْقِيَةِ). قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنِ اشْتَدَّ فِي الأَسْقِيَةِ؟ قَالَ: (فَصُبُّوا عَلَيْهِ الْمَاءَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ لَهُمْ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: (أَهْرِيقُوهُ). ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيَّ أَوْ حُرِّمَ الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْكُوبَةُ). قَالَ: (وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْسِ) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە چی دا بخۆینەوە؟ فەرمووی: (لەم دەفرانەدا خۆشاو مەخۆنەوە: کولەکە، زفت دراو واتە شتێ بە زفت روکەش کرابێت، هەڵکۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما، لە کوندەو جەوەندەدا بخۆنەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر لەوانەدا تەندو خەست بوویەوە؟ فەرمووی: (ئاوی تێ بکەن با رون بێتەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، سێیەم جار یان چوارەم جار پێی فەرموون: (بیرێژن) لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە حەرامی کردوە لەسەرم، یان مەی و قومار و دەهۆڵی حەرامکردوە). جا فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە).

٣٦٩٧ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالنَّقِيرِ وَالْجِعَةِ.

واتە: لە : لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خواردنەوەی خۆشاوی لەمانەدا لێ قەدەغەکردین: کولەکە، کوپەڵە، هەڵکۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما، خۆشاوی جۆ.

٣٦٩٨ - (صحيح) عن ابن بريدة عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (نَهَيْتُكُمْ عَنْ ثَلاَثٍ, وَأَنَا آمُرُكُمْ بِهِنَّ: نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبوورِ فَزُورُوهَا, فَإِنَّ فِي زِيَارَتِهَا تَذْكِرَةً, وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الأَشْرِبَةِ, أَنْ تَشْرَبووا إِلاَّ فِي ظُرُوفِ الأَدَمِ,

فَاشْرَبُوا فِي كُلِّ وِعَاءٍ غَيْرَ أَنْ لاَ تَشْرَبُوا مُسْكِرًا, وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِي أَنْ تَأْكُلُوهَا بَعْدَ ثَلاَثٍ, فَكُلُوا وَاسْتَمْتِعُوا بِهَا فِي أَسْفَارِكُمْ).

واتە: لە ئیبنو بوورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێشتر سێ شتم لێ قەدەغەكردوون، ئێستا من فەرمانتان پێ دەكەم بە كردنی: سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغەكردون لە ئێستا بەدواوە سەردانی گۆڕستان بكەن، لەبەرئەوەی سەردانی گۆڕستان هۆكارێكە بۆ یادی مردن و پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرن، خۆشاو خواردنەوەم لێ قەدەغەكردون، كە خۆشاو نەخۆنەوە ئیللا لە پێستەی خۆشەكراودا نەبێت، لە ئێستە بەدواوە لە هەموو دەفرێكدا خۆشاو بخۆنەوە بەڵام مەی و سەرخۆشكەر مەخۆنەوە، خواردنی گۆشتی قوربانیم لێ قەدەغەكردون كە لەدوای سێ رۆژ لە گۆشتی قوربانی خۆتان نەخۆن، لە ئێستە بەدواوە لە گۆشتی قوربانی خۆتان بخۆن و بەشی سەفەر و رێگەو بانیشی لێ هەڵگرن).

٣٦٩٩ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: لَمَّا نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الأَوْعِيَةِ قَالَ: قَالَتِ الأَنْصَارُ: إِنَّهُ لاَ بُدَّ لَنَا. قَالَ: (فَلاَ إِذًا).

واتە: لە جابری كوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنەوەی خۆشاوی لەو دەفرانەدا قەدەغەكرد كە دیاری كردبوون، جابر وتی: ئەنصار وتیان: : ئێمە ناچارین لەو دەفرانەدا خۆشاو بخۆینەوە، فەرمووی: (كەواتە تێیاندا بخۆنەوە بەڵام سەرخۆشكەر نابێ).

٣٧٠٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما قال: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَوْعِيَةَ: الدُّبَّاءَ, وَالْحَنْتَمَ, وَالْمُزَفَّتَ, وَالنَّقِيرَ, فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: إِنَّهُ لاَ ظُرُوفَ لَنَا. فَقَالَ (اشْرَبُوا مَا حَلَّ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی خواردنەوەی خۆشاوی لەناو ئەم دەفرانەدا بۆ کردین: کولەکە، کوپەڵە، زفت دراو، هەڵکۆڵراو لە تەختەو بنی دار خورما، عەرەبێکی دەشتەکی وتی: جگە لەوانە دەفرو قاپ و قاچاغی ترمان نیە، فەرمووی: (ئەوەی حەڵاڵە بیخۆنەوە لەهەر دەفرێکدا بێت).

٣٧٠١ - (صحيح) عن شريك بإسناده قال: (اجْتَنِبُوا مَا أَسْكَرَ).

واتە: لە شەریکەوە بە سەنەدی خۆی هاتوە: کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆتان بەدوربگرن لە سەرخۆشکەرەکان).

٣٧٠٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, قال: كَانَ يُنْبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سِقَاءٍ, فَإِذَا لَمْ يَجِدُوا سِقَاءً نُبِذَ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە کونەو جەوەنەدا خۆشاویان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیخواردەوە، ئەگەر کونەو جەوەندە نەبووایە لە دەفرێکی بچوکدا بۆیان دەهێنا کە لە بەرد دروستکرابوو.

## باسی سەبارەت بە دوو مادەی تێکەڵکراو.

## ٨ - باب فِي الْخَلِيطَيْنِ.

٣٧٠٣ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْتَبَذَ الزَّبِيبُ وَالتَّمْرُ جَمِيعًا, وَنَهَى أَنْ يُنْتَبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعًا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتوە، کە خۆشاوی مێوژ و خورمای پێکەوە قەدەغەی کردوە بخورێنەوە،

هەروەها خۆشاوی فەریکە خوارماو خورمای تەڕی پێگەیشتوی قەدەغەی کردوە کە پێکەوە بخورێنەوە.

٣٧٠٤ - (صحيح) عن عبد الله بن أبو قتادة, عن أبيه: أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَلِيطِ الزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ, وَعَنْ خَلِيطِ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ, وَعَنْ خَلِيطِ الزَّهْوِ وَالرُّطَبِ, وَقَالَ: (انْتَبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ عَلَى حِدَةٍ).

واتە: لە (عبد الله)ی جابری کوڕی ئەبو قەتادەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمانەی قەدەغەکردوە: خۆشاوی مێوژ و خورما تێکەڵاو بکرێت لە دەفرێکدا پاشان بخورێتەوە، وە خۆشاوی فەریکە خوارماو خورمای پێگەیشتو تێکەڵاو بکرێت پاشان بخورێتەوە، هەروەها خۆشاوی خورما کاتێ کە زەرد یان سور دەبێ پێش ئەوەی خۆش بێت لەگەڵ خورمای پێگەیشتودا تێکەڵاو بکرێن و پاشان بخورێتەوە. وە فەرمووی: (هەر یەکێکیان بە جیا بخۆنەوە).

٣٧٠٥ - (صحيح) عن ابن أبو ليلى عن رجل - قال حفص: من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم- عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: نَهَى عَنِ الْبَلَحِ وَالتَّمْرِ, وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو لەیلاوە، لە پیاوێکەوە - حەفص وتی: یەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە خۆشاوی ئەمانەی قەدەغەکردوە تێکەڵاو بکرێن و بخورێتەوە: خۆشاوی فەریکە خورماو خورمای پێگەیشتو، هەروەها خۆشاوی ترێ و خورماش.

٣٧٠٦ - (ضعيف الإسناد) عن كبشة بنت أبو مريم قالت: سَأَلْتُ أُمَّ سَلَمَةَ مَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْهُ؟ قَالَتْ: كَانَ يَنْهَانَا أَنْ نَعْجُمَ النَّوَى طَبْخًا, أَوْ نَخْلِطَ الزَّبِيبَ وَالتَّمْرَ.

واتە: لە كەبشەی كچی ئەبو مەریەمەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لە ئوممو سەلەمەم پرسی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی لێ قەدەغەكردوی؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمانەی لێ قەدەغەكردوین: خورما ئەوەندە بكوڵێنین هەتا كاریگەری دەكاتە سەر ناوكەكەی و رەنگ و تامی دەگۆڕێت، یان خۆشاوی ترێ و خورما تێكەڵاو بكەین و بیخۆینەوە.

٣٧٠٧ - (ضعيف الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُنْبَذُ لَهُ زَبِيبٌ فَيُلْقِى فِيهِ تَمْرًا وَتَمْرٌ فَيُلْقِى فِيهِ الزَّبِيبَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە خۆشاوی خورمایان كردە ناو خۆشاوی مێوژ و هێنایان بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردیەوە هەروەها خۆشاوی مێوژیان كردە ناو خۆشاوی خورماو هێنایان بۆی خواردیەوە.

٣٧٠٨ - (ضعيف الإسناد) عن صفية بنت عطية قالت: دَخَلْتُ مَعَ نِسْوَةٍ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى عَائِشَةَ, فَسَأَلْنَاهَا عَنِ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ, فَقَالَتْ: كُنْتُ آخُذُ قَبْضَةً مِنْ تَمْرٍ وَقَبْضَةً مِنْ زَبِيبٍ فَأُلْقِيهِ فِي إِنَاءٍ, فَأَمْرُسُهُ, ثُمَّ أَسْقِيهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە صەفیەی كچی (عطية)وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەتەك كۆمەڵێ لە ئافرەتانی (عَبْدِ الْقَيْسِ) چوینە خزمەت دایكی باوەڕداران عائیشە رەزای خوای لێ بێ سەبارەت بە تێكەڵاوكردنی خۆشاوی خورماو مێوژ پرسیارمان لێ كرد، ئەویش وتی: مشتێ خورماو مشتێ مێوژم كردە ناو دەفرێكەوە بە پەنجە تێكەڵاوم كردن و دەرخواردی پێغەمبەری خوام دا صلی الله علیه وسلم.

## باسی سەبارەت بە سرکەی فەریکە خورما.

## ٩ - باب فِي نَبِيذِ الْبُسْرِ.

٣٧٠٩ - (صحيح الإسناد) عن جابر بن زيد و عكرمة: أَنَّهُمَا كَانَا يَكْرَهَانِ الْبُسْرَ وَحْدَهُ وَيَأْخُذَانِ ذَلِكَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَخْشَى أَنْ يَكُونَ الْمُزَّاءَ الَّذِى نُهِيَتْ عَنْهُ عَبْدُ الْقَيْسِ. فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: مَا الْمُزَّاءُ؟ قَالَ: النَّبِيذُ فِي الْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ.

واتە: لە جابری کوڕی زەید و لە عیکریمەوە دەگێڕنەوە، کە خواردنەوەی خۆشاوی فەریکە خورمایان بە تەنیا پێ ناخۆش بووە، جا ئەو حاڵەیان باس کرد بۆ ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ، ئەویش وتی: دەترسم ئەو (مُزَّاء) بێت کە نەهی لێ کراوە کاتێ کە نوێنەری (عَبْدِ الْقَيْسِ) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوبارەوە پرسیاریان لێ کرد، ئەویش نەهی لێ کردن، وتم بە قەتادە: (مُزَّاء) چی یە؟ وتی: خۆشاوی ناو کوپەڵەو زفت دراو و ڕوکەشکراوە. - لەپاشدا ڕێگەی دان کە بیخۆنەوە بە مەرجێ نەگاتە ڕادەی مەست کردن -.

## باسی سەبارەت بە چۆنیەتی خۆشاو.

## ١٠ - باب فِي صِفَةِ النَّبِيذِ.

٣٧١٠ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن الديلمي, عن أبيه قال: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَلِمْتَ مَنْ نَحْنُ, وَمِنْ أَيْنَ نَحْنُ, فَإِلَى مَنْ نَحْنُ, قَالَ (إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ). فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لَنَا أَعْنَابًا مَا نَصْنَعُ بِهَا؟ قَالَ: (زَبِّبُوهَا). قُلْنَا: مَا نَصْنَعُ بِالزَّبِيبِ؟ قَالَ: (انْبِذُوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ وَاشْرَبُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ, وَانْبِذُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ وَاشْرَبوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ, وَانْبِذُوهُ فِي الشِّنَانِ, وَلاَ تَنْبِذُوهُ فِي الْقُلَلِ, فَإِنَّهُ إِذَا تَأَخَّرَ عَنْ عَصْرِهِ صَارَ خَلاًّ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی دەیلەمییەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێگومان دەزانی ئێمە کێین و، لەکوێوە هاتوین و، کێ گەورەمانە؟ فەرمووی: (بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەرەکەی). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ترێکی زۆرمان هەیە چی لێ بکەین؟ فەرمووی: (بیکەن بە مێوژ)، وتمان: ئەی مێوژەکە چی لێ بکەین؟ فەرمووی: (بیکەن بە شەربەتی مێوژ). وتمان: ئەی شەربەتی مێوژەکە چی لێ بکەین؟ فەرمووی: (لەگەڵ نان خواردنەکانتاندا بیخۆنەوە، لەگەڵ نان خواردنەکانتاندا بیخۆنەوە، بیکەنە ناو کوندەو مەشکەوە، مەیکەنە ناو کوپەی گەورەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر لەکاتی خۆی دوابکەوێت دەبێتە سرکە).

٣٧١١ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ يُنْبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سِقَاءٍ يُوكَأُ أَعْلَاهُ, وَلَهُ عَزْلَاءُ, يُنْبَذُ غُدْوَةً فَيَشْرَبُهُ عِشَاءً وَيُنْبَذُ عِشَاءً فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە کونەیەکدا کە دەمەکەی توند بەسرابوو خۆشاویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردیەوە، لای خوارەوەی کونەکەش دەمی هەبوو، بەیانیان لێبان دەردەهێنا ئێواران دەیخواردەوە، ئێواران لێیان دەردەهێنا بەیانیان دەیخواردەوە.

٣٧١٢ - (حسن الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّهَا كَانَتْ تَنْبِذُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غُدْوَةً فَإِذَا كَانَ مِنَ الْعَشِيِّ فَتَعَشَّى شَرِبَ عَلَى عَشَائِهِ, وَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ صَبَبْتُهُ أَوْ فَرَغْتُهُ, ثُمَّ تَنْبِذُ لَهُ بِاللَّيْلِ, فَإِذَا أَصْبَحَ تَغَدَّى فَشَرِبَ عَلَى غَدَائِهِ, قَالَتْ: نَغْسِلُ السِّقَاءَ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً, فَقَالَ لَهَا أَبِي: مَرَّتَيْنِ فِي يَوْمٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بەیانیان خۆشاویان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نانی ئێوارەی دەخوارد لەگەڵ نان





خواردنەکەدا یان لەدوای نان خواردن خۆشاوەکەی دەخواردەوە، لەپاشدا لەشەودا خۆشاویان بۆ دەهێنا کاتێ کە بەیانی دەهات نانی بەیانی دەخوارد لەگەڵ نان خواردنەکەدا یان لەدوای نان خواردن خۆشاوەکەی دەخواردەوە، ئەوەی کە لێی دەمایەوە دەمرژاند، عائیشە وتی: بەیانیان و ئێواران ئەو جامە یان ئەو کاسەم دەشت کە پێی دەخواردەوە، باوکم پێی وت: لەرۆژێکدا دوو جار ئەو کارەت دەکرد؟ وتی: بەڵێ.

٣٧١٣ - (صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: كَانَ يُنْبَذُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الزَّبِيبُ فَيَشْرَبُهُ الْيَوْمَ وَالْغَدَ, وَبَعْدَ الْغَدِ إِلَى مَسَاءِ الثَّالِثَةِ, ثُمَّ يَأْمُرُ بِهِ فَيُسْقَى الْخَدَمَ أَوْ يُهَرَاقُ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: مَعْنَى يُسْقَى الْخَدَمَ يُبَادَرُ بِهِ الْفَسَادُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خۆشاوی مێوژیان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو ڕۆژە و بەیانی لێی دەخواردەوە هەروەها بۆ ڕۆژی دواتریش هەتا ئێوارەی سێیەم لێی دەخواردەوە، لەپاشدا ئەوەی کە لێی دەمایەوە فەرمانی دەکرد بیدەن بە خزمەتکارەکان یان بیرێژن. ئەبو داود دەڵێت: مانای بیدەن بە خزمەتکارەکان دەستپێشکەری بوو بۆ ئەوەی لەوە زیاتر نەمێنێتەوەو نەگاتە ڕادەی مەستکەر.

## باسی سەبارەت بە شەربەتی هەنگوین.

## ١١ - باب فِي شَرَابِ الْعَسَلِ.

٣٧١٤ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً, فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَيَّتُنَا مَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ, فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُنَّ فَقَالَتْ: لَهُ ذَلِكَ, فَقَالَ: (بَلْ

شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَلَنْ أَعُودَ لَهُ). فَنَزَلَتْ: (لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِى) إِلَى: (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ) لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ رضى الله عنهما: (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِىُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) لِقَوْلِهِ (بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر جار لەماڵی زەینەبی کچی جەحش کە هاوسەری بوو دەمایەوە، شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، من و حەفصە قسەمان کرد بەیەك وتمان: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەپێشدا هات بۆلای هەر کاممان پێی بڵێ: من بۆنی مەغافیرت لێ دەکەم - بێگومان مەغافیر بۆنێکی ناخۆشی هەیە -، جا تەشریفی برد بۆلای یەکێکیان ئەوەی پێ وت کە بڕیاریان لەسەردابوو، فەرمووی: (نەخێر بەڵکو لەلای زەینەبی کچی جەحش شەربەتی هەنگوینم خواردوە، سوێندم خواردوە ئیتر نەیخۆمەوە ئەم قسەیەی من بەکەس مەڵێ)، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتانە دابەزین:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٢ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ۝٣ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ۝٤﴾. سورە تحريم: ١-٠٤

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردویت، تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لەکاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان، خوا کارساز و دۆستی ئێوەیە، وە ئەو زانای کاردروستە. کاتێك کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەنهێنی لای هەندێ لەژنەکانی قسەیەکی درکاند، ئینجا کەئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی)، خواش پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم ئاگادار کرد، (پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەندێك (لەقسەکان)ی

بـسکرد و بێ دەنگ بوو لە هەندێکی تری، ئینجا کە پێ ی ووت (ژنەکەی) ووتی: کێ ئەمەی پێ گەیاندی، فەرمووی: خوای زانای ئاگادار پێ ی گەیاندم. (ئـەی حەفصە و عائیشــە) ئەگەر هــەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خودا (جێ ی خۆیەتی)، چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی)، وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لەدژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (سەرکەوتوو نابن)، چونکە بێگومان پشگیری ئەوە خواو جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون.
جا ئایەتی: (إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ) ئاماژەیە بۆ حەفصە و عائیشــە، وە ئایەتی: (وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا) ئاماژەیە بۆ ئەم وتەیەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم: (بەڵکو شەربەتی هەنگوینم خواردوه).

٣٧١٥ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ, فَذَكَرَ بَعْضَ هَذَا الْخَبَرِ. وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ أَنْ تُوجَدَ مِنْهُ الرِّيحُ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: وَفِي الْحَدِيثِ قَالَتْ سَوْدَةُ: بَلْ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ, قَالَ (بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً سَقَتْنِي حَفْصَةُ). فَقُلْتُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ, نَبْتٌ مِنْ نَبْتِ النَّحْلِ.
قَالَ أَبو دَاوُدَ: (الْمَغَافِيرُ) مُقْلَةٌ, وَهِيَ صَمْغَةٌ. (وَجَرَسَتْ): رَعَتْ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی لە حەڵواو هەنگوین بوو، جا ڕاوی باسی هەندێ لەم هەواڵەی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر لەلای قورس و زەحمەت بوو بۆنی ناخۆشی لێ بێت. ئەبو داود لە فەرموودەکەدا دەڵێت: سەودە وتی: بەڵکو تۆ مەغافیرت خواردوە، فەرمووی: (نەخێر بەڵکو شەربەتی هەنگوینم خواردوە، حەفصە دەرخواردی دام)، وتم: هەنگەکەی مەغافیری هەڵمژیوەو کردویەتی بە هەنگوین، (عُرْفُط) گیایەکە لە گیاکانی هەنگ.

٣٧١٦ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصُومُ, فَتَحَيَّنْتُ فِطْرَهُ بِنَبِيذٍ صَنَعْتُهُ فِي دُبَّاءٍ, ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِهِ فَإِذَا هُوَ يَنِشُّ, فَقَالَ: (اضْرِبْ بِهَذَا الْحَائِطَ فَإِنَّ هَذَا شَرَابُ مَنْ لاَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: زانیم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڕۆژووە، بۆ کاتی بەربانگ شەربەتێکم بۆ برد کە لەکولەکەدا دروستم کردبوو، کاتێ کە بۆم هێنا کوڵی دەدا، فەرمووی: (بیدە بەو دیوارەدا، چونکە ئەوە خواردنەوەی ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە).

## باسی سەبارەت بە خواردنەوە بە پێوە.

## ١٣ - باب فِي الشُّرْبِ قَائِمًا.

٣٧١٧ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَشْرَبَ الرَّجُلُ قَائِمًا.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کەسێك ئاو یان هەر شتێ بە پێوە بخواتەوە.

٣٧١٨ - (صحيح) عن النزال بن سبرة قال عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ أَنَّ عَلِيًّا دَعَا بِمَاءٍ فَشَرِبَهُ وَهُوَ قَائِمٌ, ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رِجَالاً يَكْرَهُ أَحَدُهُمْ أَنْ يَفْعَلَ هَذَا, وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُ مِثْلَ مَا رَأَيْتُمُونِي أَفْعَلُهُ.

واتە: لە نەزالی کوڕی سەبرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ داوای ئاوی کرد بۆیان هێنا بە پێوە ئاوەکەی خواردیەوە، لەپاشدا وتی: چەند پیاوێ هەن بە پێوە ئاو بخۆنەوە، بەڵام من بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دیوە بە پێوە ئاوی خواردۆتەوە، وەك چۆن ئێستا منتان دی بە پێوە ئاوم خواردەوە.

## باسی خواردنەوەی ئاو و شەربەت لەدەمی جەوەنەو کونەدا.

## ١٤ - باب الشَّرَابِ مِنْ فِي السِّقَاءِ.

٣٧١٩ - (صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فِي السِّقَاءِ وَعَنْ رُكُوبِ الْجَلاَّلَةِ وَالْمُجَثَّمَةِ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: الْجَلاَّلَةُ الَّتِى تَأْكُلُ الْعَذِرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەمانە: ئاوخواردنەوە لەدەمی کونەو مەشکە و جەوەنەدا واتە دەمی پێوە بنرێت، سواربوونی (جلالة)، ئەو ئاژەڵ ئاو بخورێتەوە، هەروەها ئەو ئاژەڵەی دەبەسرێتەوەو دەکرێتە نیشانە بۆ کوشتن. ئەبو داود دەڵێت: (جلالة) ئەو وڵاخە سواریەیە کە پیسایی مرۆڤ دەخوات.

## باسی سەبارەت بە هەڵگێڕانەوەی دەمی کونەو جەوەنە.

## ١٥ - باب فِي اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ.

٣٧٢٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لە هەڵگێڕانەوەی دەمی کونەو مەشکە و جەوەندە بۆ دەرەوەو ئاویان لێ بخورێتەوە.

٣٧٢١ - (منكر) عن عيسى بن عبد الله - رجل من الأنصار - عن أبيه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا بِإِدَاوَةٍ يَوْمَ أُحُدٍ, فَقَالَ: (اخْنُثْ فَمَ الإِدَاوَةِ). ثُمَّ شَرِبَ مِنْ فِيهَا..

واتە: لە عیسای كوڕی (عبد الله)وە - كە یەكێ بووە لە ئەنصار - لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا داوای جەوەندەیەكی كرد، فەرمووی: (دەمی جەوەندەكە هەڵگێڕنەوە بۆ دەرەوە) لە پاشدا لێی خواردەوە.

## باسی سەبارەت بە خواردنەوە لە شوێنی شكاوی پەرداخ و دەفری خواردنەوە.

## ١٦ - باب فِي الشُّرْبِ مِنْ ثُلْمَةِ الْقَدَحِ.

٣٧٢٢ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ ثُلْمَةِ الْقَدَحِ, وَأَنْ يُنْفَخَ فِي الشَّرَابِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردووە لەوەی لە شوێنی شكاوی جام و پەرداخ ئاو و شەربەت بخورێتەوە، هەروەها نەهی كردووە لە فوكردن لە خواردنەوە وەك چاو قاوەو ئەو شتانەی كە دەخورێنەوە.

## باسی سەبارەت بە خواردنەوە لە قاپ و قاچاخی زێڕ و زیودا.

## ١٧ - باب فِي الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ.

٣٧٢٣ - (صحيح) عن ابن أبو ليلى قال: كَانَ حُذَيْفَةُ بِالْمَدَائِنِ فَاسْتَسْقَى فَأَتَاهُ دِهْقَانٌ بِإِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ, فَرَمَاهُ بِهِ, وَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَرْمِهِ بِهِ إِلاَّ أَنِّي قَدْ نَهَيْتُهُ فَلَمْ يَنْتَهِ, وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ وَعَنِ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ, وَقَالَ: (هِيَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ).

واتە: لە ئیبنو ئەبو لەیلاوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە (حُذَيْفَة) لە مەدائین بوو داوای ئاوی کرد گەورەی جوتیارەکان لە دەفرێکی زیودا ئاوی بۆ هێنا، ئەویش بۆی فڕێ دا، وتی: من بۆم فڕێ نەدا بەڵکو من ڕێگریم لێ کرد بەڵام ئەو ئاگای لێ نەبوو بۆیە بۆم فڕێ دا. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە ئاوریشم و (دیباج) کاڵای ئاوریشم و خواردنەوە لە قاپ و قاچاخی زێڕ و زیودا، وە فەرمووی: (لەدونیادا بۆ ئەوانەو، لە قیامەتیشدا بۆ ئێوەیە).

## باسی سەبارەت بە دەم نان بە ئاوی جۆگەو حەوز و ڕوبارەوە، بە مەبەستی ئاو خواردنەوە.

## ١٨ - باب فِي الْكَرْعِ.

٣٧٢٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُوَ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنٍّ وَإِلاَّ كَرَعْنَا). قَالَ: بَلْ عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنٍّ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و پیاوێ لە هاوەڵانی چون بۆلای پیاوێکی ئەنصاری ئاوی دەدێرا لەناو باخەکەیدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئاوەکەی دەگوێزایەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر ئاوت پێ یە ئەمشەو لە کوندە یان جەوەندەدا بوو بێنی بۆمان با بیخۆینەوە ئەگینا دەم دەنێن بە ئاوی ئەم جۆگەوەو بەدەم دەیخۆینەوە). وتی: بەڵێ ئاوم پێ یە ئەمشەو لە کوندەدا بووبێ - بێگومان ئاوی کوندەو جەوەندە ساردە - .

## باسی سەبارەت بە ئاوگێڕی کۆمەڵێ خۆی کەی ئاو بخواتەوە؟

## ١٩ - باب فِي السَّاقِي مَتَى يَشْرَبُ.

٣٧٢٥ - (صحيح) عن عبد الله بن أبو أوفى: أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا)..

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو ئەوفاوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاوگێڕی کۆمەڵێ خۆی لەدوای هەموویانەوە ئاو دەخواتەوە).

٣٧٢٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ, وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ, وَعَنْ يَسَارِهِ أَبو بَكْرٍ, فَشَرِبَ, ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ وَقَالَ (الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە جامێ شیریان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاوی تێ کرابوو لەوکاتەدا عەرەبێکی دەشتەکی لەلای راستیەوە دانیشتبوو، ئەبو بەکریش لەلای چەپیەوە دانیشتبوو،

نێی خواردەوە، لەپاشدا ئەوەی مایەوە دای بە عەرەبە دەشتەکیەکەو فەرمووی: (لەراستەوە، لەراستەوە دەست پێ بکەن لای راست لەپێشترە).

| |
|---|
| ٣٧٢٧ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا شَرِبَ تَنَفَّسَ ثَلَاثًا وَقَالَ: (هُوَ أَهْنَأُ وَأَمْرَأُ وَأَبْرَأُ). |

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاو یان شیر یا هەر شتێکی تری دەخواردەوە لەدەرەوەی جامەکە یان پەرداخ و دەفرەکەوە سێ جار هەناسەی دەدا واتە بەسێ جار دەیخواردەوەو هەناسەکەی نەدەکردە ناو خواردنەوەکەیەوە، وە فەرمووی: (ئا بەم شێوەیە شیفابەخش تر و ئاسان ترە لەسەر گەدە و خۆشتر و تەندروست ترەو لە تینوێتی رزگارتان دەکات).

## باسی سەبارەت بە فوکردن لە خواردنەوە هەناسەدان لەناویدا.

## ٢٠ - بباب فِي النَّفْخِ فِي الشَّرَابِ وَالتَّنَفُّسِ فِيهِ.

| |
|---|
| ٣٧٢٨ - (صحيح) عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الإِنَاءِ أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ. |

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کە هەناسە بدرێت لەناو جام یان دەفری خواردنەوە، هەروەها فوی لێ بکرێت لەکاتی خواردنەوەدا.

| |
|---|
| ٣٧٢٩ - (صحيح) عن عبد الله بن بسر - من بني سليم - قال: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَبِي, فَنَزَلَ عَلَيْهِ, فَقَدَّمَ إِلَيْهِ طَعَامًا, فَذَكَرَ حَيْسًا أَتَاهُ بِهِ, |

ثُمَّ أَتَاهُ بِشَرَابٍ, فَشَرِبَ, فَنَاوَلَ مَنْ عَلَى يَمِينِهِ, وَأَكَلَ تَمْرًا فَجَعَلَ يُلْقِي النَّوَى عَلَى ظَهْرِ أُصْبَعَيْهِ: السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى, فَلَمَّا قَامَ قَامَ أَبِي فَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي. فَقَالَ: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بووسرەوە - کە لە هۆزی بەنی سولەیم بوو - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆلای باوکم، لەلای دابەزی، خوادنێکیان بۆ هێنا، باسی قاوت(حیس) کرا کە خواردنێکە لە تێکەڵکردنی و خورماو پەنیر و ڕۆن دروست کراوە، لەپاشدا شەربەتێکیان بۆ هێنا لێی خواردەوەو ئەوەی مایەوە دایەدەست ئەوانەی کە لای ڕاستیەوە بوون، خوارمای دەخواردو ناوکەکەی دەخستە پشتی پەنجەکانی ناوەڕاست و شایەتومانی، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەستا باوکم هەستا ڕەشمەی وڵاخەکەی گرت و وتی: لەخوای گەورە بۆم بپاڕێرەوە، فەرمووی: (خوایە بەرەکەت بخەرە ئەو ڕۆزیەوە کە بەخشیوتە پێیان و لێیان خۆشبەو بەزەیت پێیاندا بێتەوە).

## باسی سەبارەت بە لەکاتی شیرخواردنەوەدا چی دەوترێت.

## ٢١ - باب مَا يَقُولُ إِذَا شَرِبَ اللَّبَنَ.

٣٧٣٠ - (حسن) عن ابن عباس قال: كُنْتُ فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ, فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَجَاءُوا بِضَبَّيْنِ مَشْوِيَّيْنِ عَلَى ثُمَامَتَيْنِ, فَتَبَزَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ خَالِدٌ: إِخَالُكَ تَقْذُرُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (أَجَلْ). ثُمَّ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَبَنٍ, فَشَرِبَ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ, وَإِذَا سُقِيَ لَبَنًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ, فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلاَّ اللَّبَنُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەماڵی مەیمونەی پورم بووم کە هاوسەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەژوورەوە بۆلای خالیدی کوڕی وەلیدیشی لەگەڵ بوو، مەیمونە پوری خالید بوو، دوو بزنەمژەی برژاویان بە دوو دارەوە بۆ هێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێزی لێ کردەوە، خالید وتی: وا ئەزانم بێزی لێ دەکەیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (بەڵێ)، لەپاشدا شیریان بۆ هێنا، خواردیەوەو، فەرمووی: (هەرکەسێ لەئێوە ئەگەر خواردنێکی خوارد با بڵێت: خوایە پیت و بەرەکەتی تێخەو لەم خواردنە چاکترمان بدەرێ، کاتێکیش کە شیری خواردەوە با بڵێت: خوایە پیت و بەرەکەتی تێخەو بۆمانی زیاد بکە، چونکە جگە لەشیر هیچ شتێ بری خواردن و خواردنەوە ناکەوێت).

## باسی سەبارەت بە داخستن و سەرگرتنی قاپ و دەفری خواردن.

## ٢٢ - باب فِي إِيكَاءِ الآنِيَةِ.

٣٧٣١ - (صحيح) عن جابر, عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: (أَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ, فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا, وَأَطْفِ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ, وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَلَوْ بِعُودٍ تَعْرُضُهُ عَلَيْهِ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ, وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ).

واتە: لە جابرەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (دەرگاکەت دابخەو یادی خوا بکە، لەبەرئەوەی شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، چراکەت بکوژێنەوەو یادی خوا بکە، سەری قاپ و دەفرەکەت داپۆشە ئەگەر بە دارێکیش بێت ڕای بدەی بەسەریدا وە یادی خوا بکە، دەمی کونە یان مەشکە یا جەوەندەکەت توند ببەستەو یادی خوا بکە).

٣٧٣٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, عن النبي صلى الله عليه وسلم, بهذا الخبر, وليس بتمامه, قال: (فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَابًا غَلَقًا, وَلاَ يَحُلُّ وِكَاءً, وَلاَ يَكْشِفُ إِنَاءً, وَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى النَّاسِ بَيْتَهُمْ). أَوْ (بُيُوتَهُمْ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)ەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هەمان هەواڵ هاتوە بەڵام بەتەواوی نا، فەرمووی: (شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، دەمی کونە یان مەشکە یا جەوەندە ناکاتەوە، سەری قاپ و دەفر لانادات، ئەوانەی لەکون دێنە دەرەوە وەك مشك و جرج ئاگر بەردەدەن لەماڵی خەڵك) یان (ماڵەکانیان دەسوتێنن).

٣٧٣٣ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله رفعه قال: (وَاكْفِتُوا صِبْيَانَكُمْ عِنْدَ الْعِشَاءِ). وَقَالَ مُسَدَّدٌ: (عِنْدَ الْمَسَاءِ) (فَإِنَّ لِلْجِنِّ انْتِشَارًا وَخَطْفَةً).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)ەوە، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە عیشادا کاتێ کە شەو داهات منداڵەکانتان لەگەڵ خۆتان بەرنەژوورەوەو بەرەڵایان مەکەن و ڕێگری بڵاوبوونەوەیان لێ بکەن). موسەددەد وتی: (لە ئێوارادا)، (چونکە لەو کاتانەدا جنۆکەکان بڵاودەبنەوە).

٣٧٣٤ - (صحيح) عن جابر قال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَسْقَى, فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَلاَ نَسْقِيكَ نَبِيذًا, قَالَ (بَلَى). قَالَ: فَخَرَجَ الرَّجُلُ يَشْتَدُّ فَجَاءَ بِقَدَحٍ فِيهِ نَبِيذٌ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَّ خَمَّرْتَهُ وَلَوْ أَنْ تَعْرِضَ عَلَيْهِ عُودًا). قَالَ أَبو دَاوُدَ: قَالَ الأَصْمَعِيُّ: تَعْرُضُهُ عَلَيْهِ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووین داوای ئاوی کرد، پیاوێ لە کۆمەڵەکە وتی: شەربەتی مێوژت نەدەمێ، وتی: (بەڵێ)، ڕاوی وتی: پیاوەکە دەرچو پەرداخێ شەربەتی بۆ هێنا، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئایا سەرت داپۆشی ئەگەر بە

دارێکیش بێت رای بدەی بە سەریدا).

٣٧٣٥ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسْتَعْذَبُ لَهُ الْمَاءُ مِنْ بُيُوتِ السُّقْيَا. قَالَ قُتَيْبَةُ: عَيْنٌ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْمَدِينَةِ يَوْمَانِ.

واتە: لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە جاران لە (بُيُوتِ السُّقْيَا)وە ئاوی شیرینیان دەهێنا بۆ خواردنەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم. قوتەیبە دەڵێ: سەرچاوەی ئاوێکە ماوەی دوو رۆژ لە مەدینەوە دورە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی خۆراکەکان.

# ٢٨ – أول كتاب الأطعمة.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بەدەمەوەچونی دەعوت.

## ١ - باب مَا جَاءَ فِي إِجَابَةِ الدَّعْوَةِ.

٣٧٣٦ – (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أن النبي صلى الله عليه و سلم قال (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە دەعوەت کرا بۆ نانی زەماوەند با بڕوات).

٣٧٣٧ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم, بمعناه, زاد: (فَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ, وَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيَدْعُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام ڕاوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەگەر بە ڕۆژوو نەبوو با بخوات، ئەگەر بە ڕۆژووش بوو با بپاڕێتەوە بۆ خاوەن سفرەو خوانەکە).

٣٧٣٨ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُجِبْ, عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان برا موسوڵمانەکەی دەعوەتی کرد بۆ سەر سفرەو خوانێ با بڕوات، ئیتر بۆ نانی شایی و زەماوەند بێ یان هەرشتێکی لەو جۆرە بێت وەك ناونانی منداڵ).

٣٧٣٩ - (صحيح) عن نافع, بِإِسْنَادِ أَيُّوبَ وَمَعْنَاهُ.

واتە: لە نافیعەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانای فەرمودەکەی ئەیوب هاتوە).

٣٧٤٠ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ دُعِيَ فَلْيُجِبْ فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە بانگهێشت کرا بۆ دەعوەتێکی خواردن با بڕوات و قبووڵی بکات، جا ئەگەر ویستی لێی بخوات، خۆ ئەگەر نەیشی ویست با نەخوات و بپارێتەوە بۆ خاوەن زەماوەندەکە).

٣٧٤١ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ دُعِيَ فَلَمْ يُجِبْ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ, وَمَنْ دَخَلَ عَلَى غَيْرِ دَعْوَةٍ دَخَلَ سَارِقًا وَخَرَجَ مُغِيرًا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە دەعوەت کرا نەڕوات ئەوە بەڕاستی نافەرمانی و سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردوە، هەرکەس بەبێ ئەوەی دەعوەت بکرێت بڕوات ئەوە بە نهێنی وەك دز دەچێتە ژورەوە، کاتێکیش کە دێتەدەرەوە وەك کەسێکە کە ماڵ بڕفێنێ خەڵکیش ڕقیان لێیەتی).

٣٧٤٢ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْمَسَاكِينُ, وَمَنْ لَمْ يَأْتِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ.

واتە: لە ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خراپترین نانی زەماوەند ئەوەیە کە دەوڵەمەندەکان دەعوەت بکرێن بۆی و واز بهێنرێت لە هەژارەکان و دەعوەت نەکرێن بۆی، هەرکەسێ لەئێوە بەدەم دەعوەتەوە نەچێت ئەوە بەڕاستی نافەرمانی و سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردوە).

## باسی سەبارەت بە باشی دەعوەتی ژن گواستنەوە.

## ٢ - باب فِي اسْتِحْبَابِ الْوَلِيمَةِ عِنْدَ النِّكَاحِ.

٣٧٤٣ - (صحيح) عن ثابت قال: ذُكِرَ تَزْوِيجُ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فَقَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْلَمَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْلَمَ عَلَيْهَا, أَوْلَمَ بِشَاةٍ.

واتە: لە (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باسی شوکردنی زەینەبی کچی جەحش لەلای ئەنەسی کوڕی مالیك کرا وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەدیوە خواردنی دروست نەکردوە بۆ گواستنەوەی هیچ یەکێ لە هاوسەرەکانی وەك ئەو دەعوەت کردنەی کە بۆ زەینەب کردی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: دەعوەت بکەن ئەگەر مەڕێکیش بێت.

٣٧٤٤ - عن أنس بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْلَمَ عَلَى صَفِيَّةَ بِسَوِيقٍ وَتَمْرٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ گواستنەوەی صەفیە خواردنی دروست کرد لە ئاردی گەنم و جۆ و خورما.

## باسی سەبارەت بە تا چەند رۆژ نانی شایی بدرێت باشە؟

## ٣ - باب فِي كَمْ تُسْتَحَبُّ الْوَلِيمَةُ؟

٣٧٤٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن عثمان الثقفي, عن رجل أعور من ثقيف, كان يقال له معروفا - أي يثني عليه خيرا, إن لم يكن اسمه زهير بن عثمان فلا أدري ما اسمه - : أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (الْوَلِيمَةُ أَوَّلُ يَوْمٍ حَقٌّ, وَالثَّانِي مَعْرُوفٌ, وَالْيَوْمُ الثَّالِثُ سُمْعَةٌ وَرِيَاءٌ). قَالَ قَتَادَةُ: وَحَدَّثَنِي رَجُلٌ أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ دُعِيَ أَوَّلَ يَوْمٍ فَأَجَابَ, وَدُعِيَ الْيَوْمَ الثَّانِي فَأَجَابَ, وَدُعِيَ الْيَوْمَ الثَّالِثَ فَلَمْ يُجِبْ, وَقَالَ: أَهْلُ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی (عثمان)ی (ثقفي)ەوە، لەپیاوێکی کوێری چاکی بەناونگی (ثقیف)ەوە، کە خەڵك بە چاکە ناویان دەبرد ئەگەر ناوی زوهەیری کوڕی (عثمان) نەبێت ئەوا نازانم ناوی چی یە، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەعوەتی رۆژی یەکەم بۆ نانی زەماوەند هەقی خۆیەتی و ئەو کەسەی کە بانگ کرا واجبە لەسەری بڕوات ئەگەر بەهانەیەکی شەرعی نەبێت، بۆ رۆژی دووەم فەزڵ و چاکەیە، رۆژی سێیەم بۆ شانازیکردن و ریایی یە). قەتادە دەڵێت: پیاوێ بۆی گێڕامەوە کە سەعیدی کوڕی موسەییەب رۆژی یەکەم دەعوەت کرا بۆ نانی زەماوەند رۆشت بەدەم دەعوەتەکەوە، بۆ رۆژی دووەم بە هەمان شێوە، بۆ رۆژی سێیەم نەڕۆشت، وتی: شانازیکردن و ریایی یە.

٣٧٤٦ - (ضعيف أيضا) عن سعيد بن المسيب: بِهَذِهِ الْقِصَّةِ, قَالَ: فَدُعِيَ الْيَوْمَ الثَّالِثَ فَلَمْ يُجِبْ وَحَصَبَ الرَّسُولَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، ئەم بەسەرهاتە هاتوە، وتی: بۆ رۆژی سێیەم دەعوەت کرا نەڕۆشت، نێردراوەکەی دایە بەر وردە بەرد.

## باسی ناندان بە خەڵك كاتی گەڕانەوە لەسەفەر.

## ٤ - باب الإِطْعَامِ عِنْدَ الْقُدُومِ مِنَ السَّفَرِ.

٣٧٤٧ - (صحيح الإسناد) عن جابر رضي الله عنه قال: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ نَحَرَ جَزُورًا أَوْ بَقَرَةً.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەفەر گەڕایەوەو گەیشتەوە مەدینە وشترێ یان مانگایەکی سەربڕی.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە میوانداری.

## ٥ - باب مَا جَاءَ فِي الضِّيَافَةِ.

٣٧٤٨ - (صحيح) عن أبوو شريح الكعبي: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ, جَائِزَتُهُ يَوْمُهُ وَلَيْلَتُهُ, الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ, وَمَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ, وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ).

واتە: لە ئەبوو شورەیحی کەعبیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ باوەڕی بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە با قەدر و رێزی میوانی خۆی بگرێت و خەلاّتی بکات، خەلاّتەکەی شەو و رۆژێکە، میوانداری سێ رۆژە، لەپاش ئەوە خێر و چاکەیە، رەوا نی یە بۆی ئەوەندە بمێنێتەوە خاوەن ماڵ سەخڵەت بکات و گوناهباری بکات) - واتە ئەوەندە نەمێنێتەوە خاوەن ماڵ توانای رێز لێ گرتنی نەمێنێ و هیچی نەمێنێ دەرخواردی بدات - .

وروى أبو داود: أَنَّه سئل مالك عن قول رسول الله صلى الله عليه وسلم:

(جَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ). فَقَالَ: يُكْرِمُهُ وَيُتْحِفُهُ وَيَحْفَظُهُ يَوْمًا وَلَيْلَةً وَثَلاَثَةُ أَيَّامٍ ضِيَافَةٌ.

لە ئەبو داودوە دەگێڕنەوە كە پرسیار كراوە لە پێشەوا مالیك دەربارەی فەرموودەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (خەڵاتەكەی شەو و رۆژێكە)، پێشەوا مالیك وتی: شەو و رۆژێك قەدر و رێزی بگرێ و رووی خۆش بێ بەرامبەری و چاكەی لەگەڵ بكات و دیاری پێشكەش بكات و پارێزگاری لێ بكات، میوانداریش هەتا سێ رۆژە.

٣٧٤٩ - (حسن صحيح الإسناد) عن أبو هريرة: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ, فَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (میوانداری سێ رۆژە، لەپاش ئەوە خێر و چاكەیە).

٣٧٥٠ - (صحيح) عن أبو كريمة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَيْلَةُ الضَّيْفِ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ, فَمَنْ أَصْبَحَ بِفِنَائِهِ فَهُوَ عَلَيْهِ دَيْنٌ, إِنْ شَاءَ اقْتَضَى, وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ).

واتە: لە ئەبو كەریمەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەوی میوانداری هەق و مافێكە لەسەر هەموو موسوڵمانێك ئەو شەوە خزمەتی چاكی بكات، هەركەس لەماڵی موسوڵمانێكدا رۆژی كردەوە ئەوە قەرزە لەسەری ئەگەر ویستی قەزای دەكاتەوە، ئەگەر ویستی وازی لێ دێنێ).

٣٧٥١ - (ضعيف) عن المقدام أبو كريمة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا رَجُلٍ أَضَافَ قَوْمًا فَأَصْبَحَ الضَّيْفُ مَحْرُومًا فَإِنَّ نَصْرَهُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَتَّى يَأْخُذَ بِقِرَى لَيْلَةٍ مِنْ زَرْعِهِ وَمَالِهِ).

واتە: لە میقدامی ئەبو کەریمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر پیاوێ کۆمەڵێکی کردە میوان، میوانەکەشی بێ بەش کردو ڕێزی نەگرت، لەکاتێکدا کە یارمەتیدانی ئەو میوانە هەق و مافێکە لەسەر هەموو موسوڵمانێك هەتا مافی ئەو شەوە وەردەگرێتەوە لە دەغڵ و دان و ماڵی ئەو کابرایە).

٣٧٥٢ - (صحيح) عن عقبة بن عامر قال: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَمَا يَقْرُونَنَا, فَمَا تَرَى؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ: (إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا, فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِى يَنْبَغِي لَهُمْ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَهَذِهِ حُجَّةٌ لِلرَّجُلِ يَأْخُذُ الشَّىْءَ إِذَا كَانَ لَهُ حَقًّا.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جاری وا دەبێ تۆ دەمان نێری بە نوێنەری یان بۆ کارێ یا بۆ غەزایە، لەلای قەومێ دادەبەزین میوانداریمان ناکەن، لەوبارەوە تۆ دەڵێی چی؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموویین: (ئەگەر بوونە میوان لەلای قەومێ ئەوەی عادەتە بۆ میوان دەکرێ بۆیان کردن ئەوە لێیان قبووڵ بکەن، ئەگەر نەیانکرد ئەوەی کە مافی میوانە لێیان بسێنن). ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پیاو ئەگەر شتێ مافی خۆی بوو وەری بگرێتەوە.

## باسی نەسخ بوونەوەی میوان لەماڵی غەیری خۆی بخوات.

## ٦ - باب نَسْخِ الضَّيْفِ يَأْكُلُ مِنْ مَالِ غَيْرِهِ.

٣٧٥٣ - (حسن الإسناد) عن ابن عباس قال: (لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ). فَكَانَ الرَّجُلُ يُحْرَجُ أَنْ يَأْكُلَ عِنْدَ أَحَدٍ مِنَ

النَّاسِ بَعْدَ مَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ, فَنَسَخَ ذَلِكَ الآيَةُ الَّتِي فِي النُّورِ, فَقَالَ (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ) (أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ) إِلَى قَوْلِهِ (أَشْتَاتًا). كَانَ الرَّجُلُ الْغَنِيُّ يَدْعُو الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِهِ إِلَى الطَّعَامِ قَالَ إِنِّي لأَجَّنَّحُ أَنْ آكُلَ مِنْهُ. وَالتَّجَنُّحُ الْحَرَجُ وَيَقُولُ الْمِسْكِينُ أَحَقُّ بِهِ مِنِّي. فَأُحِلَّ فِي ذَلِكَ أَنْ يَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَأُحِلَّ طَعَامُ أَهْلِ الْكِتَابِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ سورە النساء: ٢٩.
واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتری مەخۆن لەنێوانتاندا بەناڕەوا مەگەر بازرگانی یەك بێت بەڕەزامەندی لەنێوان خۆتان دا.
لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتەوە پیاو خۆی بە گوناهبار دەزانی بێتە میوانی کەسێك و نانی بخوات، هەتا ئەم ئایەتەی سورەتی (نور) هاتەخوارەوەو ئایەتەکەی سورەتی (نساء)ی نەسخ کردەوە:
﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُواْ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ﴾.
سورە النور: ٦١.
واتە: هیچ گوناهتان لەسەر نی یە بەکۆمەڵ یا بەتەنیا نان بخۆن.
ئەگەر پیاوێکی دەوڵەمەند کەسێکی دەوڵەمەندی خۆی بانگهێشت بکردایە بۆ نانخواردن، کەسە دەوڵەمەندەکەی دەیوت: من خۆم بە گوناهبار دەزانم لەو نانە بخۆم، وە دەیوت: هەژار لە من شایەنترە، ئیتر ئەو سەربڕاوەی کە ناوی خوای لەسەر هێنرا بێت حەڵاڵ کرا، هەروەها خواردنی خاوەن نامەکانیش حەڵاڵ کرا.

## باسی سەبارەت بە خۆراکی شانازیکەران.

## ٧ - باب فِي طَعَامِ الْمُتَبَارِيَيْنِ.

٣٧٥٤ - (صحيح) عن ابن عباس قال: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ طَعَامِ الْمُتَبَارِيَيْنِ أَنْ يُؤْكَلَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە خۆراکی شانازیکەران ئەوانەی پێشبڕکێ دەکەن بزانن کامیان خواردنی زیاتر دەبەخشێتەوە.

## باسی کەسێ دەعوەت بکرێ و شتێکی خراپ ببینێ.

## ٨ - باب الرَّجُلِ يُدْعَى فَيَرَى مَكْرُوهًا.

٣٧٥٥ - (حسن) عن سفينة أبو عبد الرحمن: أَنَّ رَجُلاً أَضَافَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا, فَقَالَتْ فَاطِمَةُ: لَوْ دَعَوْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَكَلَ مَعَنَا, فَدَعَوْهُ, فَجَاءَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى عِضَادَتَيِ الْبَابِ, فَرَأَى الْقِرَامَ قَدْ ضُرِبَ بِهِ فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ, فَرَجَعَ, فَقَالَتْ فَاطِمَةُ لِعَلِيٍّ: الْحَقْهُ فَانْظُرْ مَا رَجَعَهُ, فَتَبِعْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا رَدَّكَ؟ فَقَالَ: (إِنَّهُ لَيْسَ لِي أَوْ لِنَبِيٍّ أَنْ يَدْخُلَ بَيْتًا مُزَوَّقًا).

واتە: لە سەفینە ئەبو (عبد الرحمن)ەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ میوانداری پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ی کرد خواردنێکی بۆ دروست کردو بۆی نارد، (فَاطِمَة) وتی: خۆزگە پێغەمبەری خوامان صلی الله علیه وسلم دەعوەت بکردایە لەم خواردنەی بخواردایە لەتەکمان، دەعوەتیان کرد، ئەویش تەشریفی هات

دەستی خستەسەر لاشیپانەکانی دەرگاکە لەلایەکی ماڵەکەوە پەردەیەکی خوری ڕەنگاوڕەنگی بینی، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوەی بینی گەڕایەوە، فَاطِمَة) بە پێشەوا عەلی وت: بڕۆ بیگەرێ بزانە چی گەڕاندیەوە، شوێنی کەوتم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چی گەڕاندیتیەوە؟ فەرمووی: (بۆ من یان بۆ هیچ پێغەمبەرێ نیە بچێتە ماڵێکەوە بە نەخش و نیگار رازێنرابێتەوە).

## باسی ئەگەر دوو کەس کەسێکیان دەعوەت کرد کامەیان شایەنترە؟

## ٩ - باب إِذَا اجْتَمَعَ دَاعِيَانِ, أَيُّهُمَا أَحَقُّ؟

٣٧٥٦ - (ضعيف) عن حميد بن عبد الرحمن الحميري, عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا اجْتَمَعَ الدَّاعِيَانِ فَأَجِبْ أَقْرَبَهُمَا بَابًا, فَإِنَّ أَقْرَبَهُمَا بَابًا أَقْرَبُهُمَا جِوَارًا, وَإِنْ سَبَقَ أَحَدُهُمَا فَأَجِبِ الَّذِى سَبَقَ).

واتە: لە حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ی حیمیەرییەوە، لە یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دوو کەس دەعوەتیان کردن کامیان دەرگاکەی نزیکتر بوو لێتەوە بچۆ بەدەم دەعوەتی ئەوەیانەوە، چونکە ئەوەی دەرگاکەی نزیکتر بوو ئەوە دراوسێ نزیکترەو هەقی زیاتری لەسەرتە، ئەگەر یەکێکیان پێشتر دەعوەتی کردی بچۆ بەدەم دەعوەتی ئەوەیانەوە).

# باسی ئەگەر کاتی نوێژکردن هات و نان دانرابوو بۆ خواردن.

## ١٠ - باب إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ وَالْعَشَاءُ.

٣٧٥٧ - (صحيح) عن ابن عمر: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ يَقُومُ حَتَّى يَفْرُغَ). زَادَ مُسَدَّدٌ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ إِذَا وُضِعَ عَشَاؤُهُ أَوْ حَضَرَ عَشَاؤُهُ لَمْ يَقُمْ حَتَّى يَفْرُغَ وَإِنْ سَمِعَ الإِقَامَةَ وَإِنْ سَمِعَ قِرَاءَةَ الإِمَامِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کاتی نوێژکردن هات و نان دانرابوو بۆ خواردن، ئەوا نانەکە بخۆن، پەلە مەکەن هەتا تەواو دەبن، ئەو کاتە هەستن بەدەم نوێژەکەتانەوە، بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵی خواردنەکە نەبێ و خەیاڵ نەڕوات بۆلای). موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: (عبد الله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ ئەگەر نانی بۆ دانرایە هەڵنەئەسا بۆ نوێژ هەتا نانەکەی دەخواردو لێ دەبوویەوە ئەگەرچی گوێشی لە قامەت و قورئان خوێندنی پێشنوێژ بووایە.

٣٧٥٨ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُؤَخِّرِ الصَّلاَةَ لِطَعَامٍ وَلاَ لِغَيْرِهِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نوێژ دواناخرێت نە بۆ خواردن و نە بۆ غەیری خواردن.

٣٧٥٩ - (حسن الإسناد) عن عبد الله بن عبيد بن عمير قال: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ كُنْتُ مَعَ أَبِي فِي زَمَانِ ابْنِ الزُّبَيْرِ إِلَى جَنْبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ،

فَقَالَ عَبَّادُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: إِنَّا سَمِعْنَا أَنَّهُ يُبْدَأُ بِالْعَشَاءِ قَبْلَ الصَّلاَةِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَيْحَكَ مَا كَانَ عَشَاؤُهُمْ أَتُرَاهُ كَانَ مِثْلَ عَشَاءِ أَبِيكَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لە سەردەمی (عبد الله)کوڕی زوبێردا لەتەك باوکم بووم بەتەنیشت (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە، عەببادی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی زوبێر وتی: گوێمان لێ بووە کە (عبد الله)ی کوڕی زوبێر ئەگەر کاتی نوێژکردن هات و نان دانرابوو بۆ خواردن، لەپێش نوێژکردن نان دەخوات. (عبد الله)ی کوڕی عومەر وتی: (ويحك) - وشەیەکە کەسێ بەزەیی بە کەسێکی تردا بێتەوە پێی دەڵێ بە پێچەوانەی (ويلك) - تۆ وادەزانی نانخواردنی ئەوان وەك نانخواردنی باوکت بوو نانی ئەوان شتێکی کەم بوو ئەوان سفرەو خوانیان نەدەڕازاندەوە کەمێکیان دەخواردو دەچون بەدەم نوێژەکەیانەوەو نوێژەکەیان لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدا.

## باسی سەبارەت بە شتنی دەستەکان لەپێش خواردن.

## ١١ - باب فِي غَسْلِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الطَّعَامِ.

٣٧٦٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنَ الْخَلاَءِ فَقُدِّمَ إِلَيْهِ طَعَامٌ, فَقَالُوا: أَلاَ نَأْتِيكَ بِوَضُوءٍ؟ فَقَالَ: (إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلاَةِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرئاو هاتەدەرەوە، خواردنیان بۆ هێن، وتیان: ئاوت بۆ نەهێنین دەستنوێژی پێ بگریت؟ فەرموویەتی: (کاتێ کە هەستام بۆ نوێژکردن فەرمانم پێ کراوە بە دەستنوێژ گرتن).

## باسی سەبارەت بە دەست شتن لەپێش خواردن.

## ١٢ - باب فِي غَسْلِ الْيَدِ قَبْلَ الطَّعَامِ.

٣٧٦١ - (ضعيف) عن سلمان قال: قَالَ قَرَأْتُ فِي التَّوْرَاةِ: أَنَّ بَرَكَةَ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ, فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ). وَكَانَ سُفْيَانُ يَكْرَهُ الْوُضُوءَ قَبْلَ الطَّعَامِ.

واتە: لە سەلمانی فارسیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە تەورات دا خوێندومەتەوە کە دەست شتن لەپێش خواردندا هۆی پیت و بەرەکەتیەتی، ئەمەم باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەست شتن لەپێش خواردن و لەدوای خواردن هۆی پیت و بەرەکەتیەتی). سوفیانی (پوری) دەست شتنی لەپێش خواردن پێ ناخۆش بووە.

## باسی سەبارەت بە خواردنی لەپڕ.

## ١٣ - باب فِي طَعَامِ الْفُجأة.

٣٧٦٢ - (ضعيف الإسناد) عن جابر بن عبد الله قال: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ شِعْبٍ مِنَ الْجَبَلِ وَقَدْ قَضَى حَاجَتَهُ, وَبَيْنَ أَيْدِينَا تَمْرٌ عَلَى تُرْسٍ أَوْ حَجَفَةٍ, فَدَعَوْنَاهُ فَأَكَلَ مَعَنَا, وَمَا مَسَّ مَاءً.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕێ لە کێوێکدا دەستی بە ئاو گەیاند، لەوکاتەدا ئێمەش هەندێ خورما لەبەردەستماندا بوو لەسەر مەتاڵێ دانرا بوو لەپێست دروست دەکرێت وەك قەڵغان بەکار دەهێنرا بەرامبەر بە تیر، پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم دەعوەت کرد بۆئەوەی خورما بخوات ئەویش هات و خورمای خوارد لەتەکمان، دەستیشی نەشت.

## باسی سەبارەت بە خراپی رەخنەگرتن لە خۆراك.

## ١٤ - باب فِي كَرَاهِيَةِ ذَمِّ الطَّعَامِ.

٣٧٦٣ - (صحيح) عن أبو هريرة رضي الله عنه قال: مَا عَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا قَطُّ, إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ, وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرگیز رەخنەی لەخواردن نەدەگرت، ئەگەر حەزی لێی بووایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵی نەبووایە وازی لێ دەهێنا.

## باسی سەبارەت بە نانخواردن بەکۆمەڵ.

## ١٥ - باب فِي الِاجْتِمَاعِ عَلَى الطَّعَامِ.

٣٧٦٤ - (حسن) عن وحشي بن حرب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّا نَأْكُلُ وَلاَ نَشْبَعُ. قَالَ (فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُونَ). قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ (فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ, وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ, يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: إِذَا كُنْتَ فِي وَلِيمَةٍ فَوُضِعَ الْعَشَاءُ فَلاَ تَأْكُلْ حَتَّى يَأْذَنَ لَكَ صَاحِبُ الدَّارِ.

واتە: لە وەحشی کوڕی حەربەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە هەوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە کە نان دەخۆین تێر نابین، فەرمووی: (لەوانەیە بەجیا جیا نان بخۆن) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (بەکۆمەڵ نان بخۆن، ناوی خوای لەسەر بهێنن، ئیتر پیت و بەرەکەتی تێ دەکەوێت بۆتان). ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر ئامادەی ناخواردنی زەماوەند بوویت نان دانرا بۆ خواردن نان مەخۆ هەتا خاوەن ماڵ فەرموت لێ دەکات و مۆڵەتت دەدات.

## باسی سەبارەت بە ناوی خوا هێنان لەسەر خواردن.

## ١٦ - باب التَّسْمِيَةِ عَلَى الطَّعَامِ.

٣٧٦٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله سمع النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ, فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ, وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ, فَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (کاتێ پیاو چوەماڵەوە لەکاتی چونە ژورەوەو لەکاتی نان داناندا بۆ خواردن ناوی خوا بێنێ و یادی خوا بکات، شەیتان دەڵێ: ئیتر نە جێگای شەو مانەوەتان بۆ هەیە، نە خواردن، بەڵام ئەگەر کاتی چونە ژورەوە ناوی خوای نەهێناو یادی خوا نەکات، شەیتان دەڵێ: جێگای شەوتان دەستکەوت، جا ئەگەر لەکاتی نانخواردنیشدا ناوی خوای نەهێنا، شەیتان دەڵێ: هەم جێگای شەو و هەم خواردنتان دەستکەوت).

٣٧٦٦ - (صحيح) عن حذيفة قال: كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا, لَمْ يَضَعْ أَحَدُنَا يَدَهُ حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَإِنَّا حَضَرْنَا مَعَهُ طَعَامًا, فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ كَأَنَّمَا يُدْفَعُ, فَذَهَبَ لِيَضَعَ يَدَهُ فِي الطَّعَامِ, فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ, ثُمَّ جَاءَتْ جَارِيَةٌ كَأَنَّمَا تُدْفَعُ, فَذَهَبَتْ لِتَضَعَ يَدَهَا فِي الطَّعَامِ, فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهَا, وَقَالَ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَيَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ الَّذِى لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ, وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذَا الأَعْرَابِيِّ يَسْتَحِلُّ بِهِ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ, وَجَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ يَسْتَحِلُّ بِهَا, فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا, فَوَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ لَفِى يَدِى مَعَ أَيْدِيهِمَا).

واتە: لە (حذيفة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نانیان بۆ ئامادە دەکردین هەتا ئەو دەستی پێ نەکردایە کەسمان دەستمان بۆ نانەکە نەدەبرد، جارێ لەخزمەتیا بووین نانیان دانا، لەوکاتەدا عەرەبێکی دەشتەکی هات ئەتوت بە پاڵ دەیهێنن، رۆشت ویستی دەستی بەرێت بۆ خواردنەکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم توند دەستی گرت و نەیهێشت دەست بەرێت بۆ خواردنەکە، لەپاشدا کەنیزەکێکی منداڵ هات ئەتوت بە پاڵ دەیهێنن، رۆشت ویستی دەستی بەرێت بۆ خواردنەکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم توند دەستی گرت و نەیهێشت دەست بەرێت بۆ خواردنەکە، جا فەرمووی: (بەڕاستی ئەو خواردنەی ناوی خوای لەسەر نەهێنرێت شەیتان بەڕەوای دەزانێ بۆ خۆی لێی بخوات، جا کاتێك شەیتان عەرەبە دەشتەکیەکەو کەنیزەکەکەی هێنا بۆ ئەوەی ناوی خوا نەهێنن و خواردنی خۆراکەکە ڕەوا ببێ بۆ خۆی منیش دەستی گرتن، سوێند بە (الله) دەستی من لەگەڵ دەستی هەر سێکیان تێکەڵ بوو).

٣٧٦٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى, فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر یەکێ لە ئێوە کاتێك نانی خوارد لە سەرەتاوە ناوی خوای گەورە بێنێ و بڵێ: (بِسْمِ اللَّه)، ئەگەر لەسەرەتاوە لەبیری چوو هەرکاتێك بیری کەوتەوە بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ). واتە: بەناوی خوا لەسەرەتاو لە کۆتاییەوە.

٣٧٦٨ - (ضعيف) عن أمية بن مخشي, وكان من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا وَرَجُلٌ يَأْكُلُ, فَلَمْ

يُسَمِّ حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنْ طَعَامِهِ إِلاَّ لُقْمَةٌ فَلَمَّا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ, فَضَحِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ قَالَ: (مَا زَالَ الشَّيْطَانُ يَأْكُلُ مَعَهُ فَلَمَّا ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ اسْتَقَاءَ مَا فِي بَطْنِهِ).

واتە: ئومەییەی کوڕی مەخشی کە یەکێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەڵێت: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوو، پیاوێ نانی دەخوارد، ناوی خوای نەهێنا هەتا خواردنەکە یەك پاروی مایەوە، جا کە ئەو پارەوەی برد بۆ دەمی وتی: (بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ). واتە: بەناوی خوا لەسەرەتاو لە کۆتاییەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێکەنی، لەپاشدا فەرمووی: (بەردەوام شەیتان لەسەرەتاوە لەگەڵی دەیخوارد هەتا ناوی خوای هێنا ئیتر هەرچی لە سکیدا بوو هەمووی هەڵهێنایەوە).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە شت خواردن بە راکشانەوە.

## ١٧ - باب مَا جَاءَ فِي الأَكْلِ مُتَّكِئًا.

٣٧٦٩ - (صحيح) عن أبو جحيفة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ آكُلُ مُتَّكِئًا).

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من بە پاڵەوە شت ناخۆم).

٣٧٧٠ - (صحيح) عن أنس قال: بَعَثَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَوَجَدْتُهُ يَأْكُلُ تَمْرًا وَهُوَ مُقْعٍ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

ناردمی بۆ کارێ کاتێ کە گەڕامەوە بینیم خورمای دەخوارد بە قنچکانەوە).

٣٧٧١ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: مَا رُئِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ مُتَّكِئًا قَطُّ وَلاَ يَطَأُ عَقِبَهُ رَجُلاَنِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نەبینراوە هەرگیز پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پاڵەوە شت بخوات، هەرگیز دوو پیاو لەدوایەوە ڕێیان نەدەکرد لەکاتێکدا کە بەپێ بڕۆشتایە، ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێ ڕێی بکردایە لەناوەڕاستیانەوە ڕێی دەکرد).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە خواردن لەناوەڕاستەوە.

## ١٨ - باب مَا جَاءَ فِي الأَكْلِ مِنْ أَعْلَى الصَّحْفَةِ.

٣٧٧٢ - (صحيح) عن ابن عباس, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَأْكُلْ مِنْ أَعْلَى الصَّحْفَةِ, وَلَكِنْ لِيَأْكُلْ مِنْ أَسْفَلِهَا, فَإِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ مِنْ أَعْلاَهَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە نانی خوارد با لەسەرو ناوەڕاستی دەوریەکەوە نەخوات، بەڵکو لە بەشی خوارەوەو لەبەردەمی خۆیەوە بخوات، چونکە پیت و بەرەکەت لەناوەڕاست و بەشی سەرەوە دێتەخوارەوە).

٣٧٧٣ - (صحيح) عن عبد الله بن بسر قال: كَانَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَصْعَةٌ يُقَالُ لَهَا الْغَرَّاءُ يَحْمِلُهَا أَرْبَعَةُ رِجَالٍ, فَلَمَّا أَضْحَوْا وَسَجَدُوا الضُّحَى أُتِيَ بِتِلْكَ الْقَصْعَةِ - يَعْنِي وَقَدْ ثُرِدَ فِيهَا - فَالْتَفُّوا عَلَيْهَا, فَلَمَّا كَثُرُوا جَثَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا هَذِهِ الْجِلْسَةُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ جَعَلَنِي عَبْدًا كَرِيمًا, وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا عَنِيدًا). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلُوا مِنْ حَوَالَيْهَا وَدَعُوا ذِرْوَتَهَا يُبَارَكْ فِيهَا).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بوسرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەنێکی سپی هەبوو ناوی (غَرَّاء) بوو، بە چوار پیاو هەڵیان ئەگرت، کاتێ کە چێشتەنگاو دەبوو نوێژی سوننەتی چێشتەنگاویان دەکرد، لەگەنیان پڕ دەکرد لە تریت و دەیانهێنا لێی کۆدەبوونەوەو دەورەیان لێ دەدا، کاتێ کە زۆربوون جێگەیان تەنگ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرچۆکی دانیشت بۆ ئەوەی جێگای هاوەڵەکانی فراوان بێت، عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەم دانیشتنە چی یە؟ فەرمووی: (خوای گەورە کردومی بە بەندەیەکی میهرەبان و بەڕێز، نەیکردوم بە بەندەیەکی سەرکەشی کەلەڕەق). لەپاشدا فەرمووی: (لەچواردەوری و قەراغەکانیەوە بیخۆن لەبەشی سەرەوەو ناوەڕاستەوە مەیخۆن ئیتر پیت و بەرەکەتی تێ دەکەوێت).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە دانیشتن لەسەر سفرەو خوانێ کە خواردنێکی خراپ و نەشیاوی لەسەر بێ.

## ١٩ - باب مَا جَاءَ فِي الْجُلُوسِ عَلَى مَائِدَةٍ عَلَيْهَا بَعْضُ مَا يُكْرَهُ.

٣٧٧٤ - (صحيح) عن جعفر بن برقان, عن الزهري, عن سالم عن أبيه رضي الله عنه قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ مَطْعَمَيْنِ, عَنِ الْجُلُوسِ عَلَى مَائِدَةٍ يُشْرَبُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ, وَأَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ وَهُوَ مُنْبَطِحٌ عَلَى بَطْنِهِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ لَمْ يَسْمَعْهُ جَعْفَرٌ مِنَ الزُّهْرِيِّ وَهُوَ مُنْكَرٌ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی بوورقان، لەزوهریەوە، لە سالمەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لەوەی لەسەر ئەم دوو شێوەیە نان بخورێت: دانیشتن لەسەر سفرەو خوانێ کە ئارەق و مەیی لەسەر بخورێتەوە، هەروەها خواردن بە راکشانەوە لەسەردەم. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە جەعفەر لە زوهری نەبیستوە لەبەرئەوە فەرموودەیەکی (منکر)ە.

٣٧٧٥ - حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَبِي الزَّرْقَاءِ, قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي, حَدَّثَنَا جَعْفَرٌ, أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنِ الزُّهْرِيِّ, بِهَذَا الْحَدِيثِ.

## باسی خواردن بەدەستی راست.

## ٢٠ - باب الأَكْلِ بِالْيَمِينِ.

٣٧٧٦ - (صحيح) عن ابن عمر رضي الله عنهما أن النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: (إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ, وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ, فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە خواردنێکی خوارد با بەدەستی راستی بیخوات، هەروەها ئەگەر خواردنەوەیەکی خواردەوە با بەدەستی راستی بیخواتەوە، چونکە شەیتان بەدەستی چەپی خواردن دەخوات و دەخواتەوە).

٣٧٧٧ - (صحيح) عن عمر بن أبو سلمة قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (اُدْنُ مِنِّي فَسَمِّ اللَّهَ, وَكُلْ بِيَمِينِكَ, وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ).

واتە: لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کوڕی شیرینم نزیك بەرەوەو ناوی خوا بێنە واتە: بڵێ: (بسم الله)، بە دەستی ڕاستت بخۆو، لەبەردەمی خۆشتەوە بخۆ).

## باسی سەبارەت بە گۆشت خواردن.

## ٢١ - باب فِي أَكْلِ اللَّحْمِ.

٣٧٧٨ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَقْطَعُوا اللَّحْمَ بِالسِّكِّينِ فَإِنَّهُ مِنْ صَنِيعِ الأَعَاجِمِ, وَانْهَسُوهُ فَإِنَّهُ أَهْنَأُ وَأَمْرَأُ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَلَيْسَ هُوَ بِالْقَوِيِّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بە چەقۆ گۆشت مەپچڕن لەکاتی خواردنی گۆشت دا چونکە ئەوە داب و نەریتی عەجەمەکانە، بەڵام بە ددانەکانت بیپچڕەو بیخۆ تا بەم شێوەیە شیفابخش تر و ئاسان ترە لەسەر گەدە و خۆشتر و تەندروست ترە).

٣٧٧٩ - (ضعيف) عن صفوان بن أمية رضي الله عنه قال: كُنْتُ آكُلُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَآخُذُ اللَّحْمَ بِيَدِى مِنَ الْعَظْمِ, فَقَالَ: (أَدْنِ الْعَظْمَ مِنْ فِيكَ فَإِنَّهُ أَهْنَأُ وَأَمْرَأُ).

واتە: لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەتەك پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم خواردنم دەخوارد، ئێسقانێکم بە گۆشتەوە گرت بەدەستەوە، فەرمووی: (ئێسقانەکە نزیك بکەرەوە لەدەمت تا بەم شێوەیە شیفابخش تر و ئاسان ترە لەسەر گەدەو خۆشترو تەندروست ترە).

٣٧٨٠ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود قال: كَانَ أَحَبَّ الْعُرَاقِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُرَاقُ الشَّاةِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خۆشترین ئێسقانێ کە گۆشتی پێوە بێ بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ئێسقانی مەڕ بوو.

٣٧٨١ - (صحيح) عن أبوو داود قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ. قَالَ: وَسُمَّ فِي الذِّرَاعِ, وَكَانَ يَرَى أَنَّ الْيَهُودَ هُمْ سَمُّوهُ.

واتە: لە ئەبوو داودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم حەزی لە ئێسقانی باسکی مەڕ بوو. وتی: بۆیە زەهریان بۆ پێوە کرد، پێی وابوو کە جولەکە زەهریان پێوە کردوە.

## باسی سەبارەت بە خواردنی کولەکە.

## ٢٢ - باب فِي أَكْلِ الدُّبَّاءِ.

٣٧٨٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ, قَالَ أَنَسٌ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ, فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُبْزًا مِنْ شَعِيرٍ وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ. قَالَ أَنَسٌ: فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيِ الصَّحْفَةِ, فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ بَعْدَ يَوْمِئِذٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەرگدورێك پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دەعوەت کرد بۆ سەرخوانێ کە بۆی دروست کردبوو،، ئەنەس وتی: منیش لەتەك پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه

وسلم رۆشتم بۆ ئەو نانخواردنە، نانی جۆ و تریتی کولەکەو گۆشتیان نزیك کردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە قەراخی لەگەنەکەدا دەگەڕا بۆ کولەکەکان، ئیتر لەدوای ئەو رۆژەوە بەردەوام حەزم لە کولەکە بوو.

## باسی سەبارەت بە خواردنی تشریبی گۆشت و نان.

## ٢٣ - باب فِي أَكْلِ الثَّرِيدِ.

٣٧٨٣ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: كَانَ أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الثَّرِيدَ مِنَ الْخُبْزِ وَالثَّرِيدَ مِنَ الْحَيْسِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خۆشترین خواردن بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم تشریبی گۆشت و نان بوو هەروەها تشریبی (حیس)یش خورماو رۆن و قاوت تێکەڵ دەکرا پێیان دەوت (حیس).

## باسی سەبارەت بە خراپی بێزکردنەوە لەخواردن.

## ٢٤ - باب فِي كَرَاهِيَةِ التَّقَذُّرِ لِلطَّعَامِ.

٣٧٨٤ - (حسن) عن قبيصة بن هلب عن أبيه قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ إِنَّ مِنَ الطَّعَامِ طَعَامًا أَتَحَرَّجُ مِنْهُ. فَقَالَ: (لاَ يَتَخَلَّجَنَّ فِي صَدْرِكَ شَيْءٌ ضَارَعْتَ فِيهِ النَّصْرَانِيَّةَ).

واتە: لە قەبیصەی کوڕی هولبەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: خواردن خۆمی لێ بەدور دەگرم و بێزی لێ دەکەمەوە، گوێم لێ بوو فەرمووی: (با هیچ شتێ

لەدڵت دا دروست نەبێ، لە خواپەرستەکانی گاورەکان بچی - خواپەرستەکانی گاورەکان خواردنی تایبەت نەبوایە نەیان دەخوارد- ).

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی خواردنی شیرو گۆشتی وڵاخی پیسخۆر.

## ٢٥ - باب النَّهْيِ عَنْ أَكْلِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا.

٣٧٨٥ - (صحيح) عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْلِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوارنی گۆشت و شیری وڵاخی پیسخۆری قەدەغەکردوە.

٣٧٨٦ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لَبَنِ الْجَلاَّلَةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوارنی شیری وڵاخی پیسخۆری قەدەغەکردوە.

٣٧٨٧ - (حسن صحيح) عن ابن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْجَلاَّلَةِ فِي الإِبِلِ أَنْ يُرْكَبَ عَلَيْهَا, أَوْ يُشْرَبَ مِنْ أَلْبَانِهَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە خوارنی گۆشت و شیری ئەو وشترەی کە پیسایی دەخوات، هەروەها نەهی کردوە لە سواربوونیشی.

# باسی سەبارەت بە خواردنی گۆشتی ئەسپ.

## ٢٦ - باب فِي أَكْلِ لُحُومِ الْخَيْلِ.

٣٧٨٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَأَذِنَ لَنَا فِي لُحُومِ الْخَيْلِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەرۆژی خەیبەردا خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی لێ قەدەغەکردین، بەڵام ڕێگەی خواردنی گۆشتی ئەسپ و ماینی پێ داین.

٣٧٨٩ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: ذَبَحْنَا يَوْمَ خَيْبَرَ الْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ، فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْبِغَالِ وَالْحَمِيرِ، وَلَمْ يَنْهَنَا عَنِ الْخَيْلِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەرۆژی خەیبەردا ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژمان سەربڕی بۆ خواردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنی گۆشتی گوێدرێژ و ئێستری لێ قەدەغەکردین، بەڵام گۆشتی ئەسپ و ماینی لێ قەدەغەنەکردین.

٣٧٩٠ - (ضعيف) عن خالد بن الوليد: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْخَيْلِ وَالْبِغَالِ وَالْحَمِيرِ. زَادَ حَيْوَةُ: وَكُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لاَ بَأْسَ بِلُحُومِ الْخَيْلِ وَلَيْسَ الْعَمَلُ عَلَيْهِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: وَهَذَا مَنْسُوخٌ قَدْ أَكَلَ لُحُومَ الْخَيْلِ جَمَاعَةٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمُ ابْنُ الزُّبَيْرِ، وَفَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، وَأَسْمَاءُ ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ، وَسُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ، وَعَلْقَمَةُ، وَكَانَتْ قُرَيْشٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَذْبَحُهَا.

واتە: لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژ: حەیوە ئەمەی بۆ زیاد کرد: هەروەها نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار. ئەبو داود دەڵێت: ئەمە وتەی مالیکە. ئەبو داود دەڵێت: خواردنی گۆشتی ئەسپ هیچی تێدا نیە فەرموودەکە کاری پێ ناکرێت، ئەبو داود دەڵێت: ئەمە نەسخ بوەتەوە کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گۆشتی ئەسپیان خواردوە لەوانە: ئیبنو زوبێر، (فضالة)ی کوڕی عوبەید، ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەسمائی کچی ئەبو بەکر، سوەیدی کوڕی غەفەلەو، عەلقەمە، قورەیش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سەریان دەبڕی بۆ خواردن.

## باسی سەبارەت بە خواردنی گۆشتی کەروێشك.

## ٢٧ - باب فِي أَكْلِ الأَرْنَبِ.

٣٧٩١ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: كُنْتُ غُلَامًا حَزَوَّرًا فَصِدْتُ أَرْنَبًا, فَشَوَيْتُهَا, فَبَعَثَ مَعِي أَبو طَلْحَةَ بِعَجُزِهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَبِلَهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من غولامێکی زرنگ و چالاك بووم جارێ کەروێشکێکم راوکرد، برژاندم، ئەبو (طَلْحَة) رانێکی پێدا ناردم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، منیش بۆم برد، ئەویش وەریگرت.

٣٧٩٢ - (ضعيف الإسناد) عن خالد بن الحويرث قال: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو كَانَ بِالصِّفَاحِ - قَالَ مُحَمَّدٌ: مَكَانٌ بِمَكَّةَ - وَإِنَّ رَجُلاً جَاءَ بِأَرْنَبٍ قَدْ صَادَهَا, فَقَالَ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو, مَا تَقُولُ؟ قَالَ: قَدْ جِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا جَالِسٌ فَلَمْ يَأْكُلْهَا وَلَمْ يَنْهَ عَنْ أَكْلِهَا, وَزَعَمَ أَنَّهَا تَحِيضُ.

واتە: لە خالیدی کوڕی (حویرث)ەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە (عبد الله)ی کوڕی عەمر لە صیفاح بوو - موحەممەدی کوڕی خالید وتی: شوێنێکە لە مەککە - لەوکاتەدا پیاوێ کەروێشکێکی هێنا راوی کردبوو، وتی: ئەی (عبد الله)ی کوڕی عەمر، تۆ چی دەڵێی؟ وتی: گۆشتی کەروێشکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوکاتەدا منیش دانیشتبووم نەیخواردو، رێگریشی نەکرد لە خواردنی، پێی وابوو کەروێشك دەکەوێتە حەیزەوە.

## باسی سەبارەت بە خواردنی گۆشتی بزنەمژە.

## ٢٨ - باب فِي أَكْلِ الضَّبِّ.

٣٧٩٣ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ خَالَتَهُ أَهْدَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمْنًا وَأَضُبًّا وَأَقِطًا, فَأَكَلَ مِنَ السَّمْنِ وَمِنَ الأَقِطِ وَتَرَكَ الأَضُبَّ تَقَذُّرًا, وَأُكِلَ عَلَى مَائِدَتِهِ وَلَوْ كَانَ حَرَامًا مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پوری رۆن و پەنیر و بزنەمژەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش لە رۆن و پەنیرەکەی خوارد بەڵام بزنەمژەکەی نەخواردو بێزیشی لێ کردەوە، بێگومان لەسەر سفرەو خوانێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئامادەی بووە بزنەمژە خوراوە ئەگەر حەرام بوایە لەسەر سفرەو خوانی ئەو نەدەخورا.

٣٧٩٤ - (صحيح) عن خالد بن الوليد: أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْتَ مَيْمُونَةَ فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ, فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ, فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ: أَخْبِرُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ, فَقَالُوا: هُوَ ضَبٌّ. فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ. قَالَ: فَقُلْتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (لاَ, وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ). قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ, فَأَكَلْتُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْظُرُ.

واتە: لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە دەگێڕنەوە، کە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم چونەتە ماڵی مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەکاتە پوری خالید، مەیمونە بزنەمژەیەکی برژاوی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەستی درێژکرد لێی بخوات، یەکێ لەو ئافرەتانەی کە لە ماڵی مەیمونە بوو وتی: هەواڵ بدەن بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و بۆی رون بکەنەوە کە ئەوە چیە خەریکە دەیخوات، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوە گۆشتی بزنەمژەیە، ئیتر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەستی کێشایەوەو نەیخوارد، خالید وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایا گۆشتی بزنەمژە حەرامە؟ فەرمووی: (نا حەرام نیە، بەڵام لەوڵاتی ئێمەدا نیە لەبەرئەوە دەبینم تەبیعەتم نایبات). خالید وتی: منیش رامکێشا بۆلای خۆم و لەبەرچاوی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستم کرد بە خواردنی.

٣٧٩٥ - (صحيح) عن ثابت بن وديعة قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَيْشٍ, فَأَصَبْنَا ضِبَابًا, قَالَ: فَشَوَيْتُ مِنْهَا ضَبًّا, فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعْتُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ , قَالَ: فَأَخَذَ عُودًا فَعَدَّ بِهِ أَصَابِعَهُ, ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ أُمَّةً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُسِخَتْ دَوَابَّ فِي الأَرْضِ, وَإِنِّي لاَ أَدْرِي أَيُّ الدَّوَابِّ هِيَ؟). قَالَ: فَلَمْ يَأْكُلْ وَلَمْ يَنْهَ.

واتە: لە (ثابت)ی کوڕی وەدیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە سوپایەکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین، چەند بزنەمژەیەکمان دەستکەوت، وتی: بزنەمژەیەکم برژاند، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

تەشریفی هات خستمە بەردەمی بۆ ئەوەی بیخوات، وتی: چیلکەیەکی هەڵگرت پەنجەکانی بزنەمژەکەی ژمارد، لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە لە نەوەکانی ئیسرائیل گەلێکی مەسخ کردو کردنی بە ئاژەڵ، جا نازانم ئەو ئاژەڵە چی یە؟). وتی: ئیتر نەخواردی و نە قەدەغەشی کرد.

٣٧٩٦ - (حسن) عن عبد الرحمن بن شبل: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ لَحْمِ الضَّبِّ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی شیبلەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنی گۆشتی بزنەمژەی قەدەغەکردوە.

## باسی سەبارەت بە خواردنی گۆشتی چێرگ.

## ٢٩ - باب فِي أَكْلِ لَحْمِ الْحُبَارَى.

٣٧٩٧ – (ضعيف) عن بريه بن عمر بن سفينة, عن أبيه, عن جده قال: أَكَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَحْمَ حُبَارَى.

واتە: لە بوورەیەی کوڕی عومەری کوڕی سەفینەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم گۆشتی چێرگم خواردوە - چێرگ باڵندەیەکی مل درێژە رەنگی خاکیە وەك قاز وایە - .

## باسی سەبارەت بە خواردنی جرو جانەوەری زەوی.

## ٣٠ - باب فِي أَكْلِ حَشَرَاتِ الأَرْضِ.

٣٧٩٨ - (ضعيف الإسناد) عن ملقام بن تلب, عن أبيه قال: صَحِبْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ أَسْمَعْ لِحَشَرَةِ الأَرْضِ تَحْرِيمًا.

واتە: لە میلقامی کوڕی تەلیببەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هاوەڵێتی پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم کردوە لێم نەبیستوە گۆشتی جرو جانەوەری حەرام کردبێت.

٣٧٩٩ - (ضعيف الإسناد) عن عيسى بن نميلة, عن أبيه قال: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَسُئِلَ عَنْ أَكْلِ الْقُنْفُذِ, فَتَلاَ: (قُلْ لاَ أَجِدُ فِيمَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا) الآيَةَ, قَالَ: قَالَ شَيْخٌ عِنْدَهُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (خَبِيثَةٌ مِنَ الْخَبَائِثِ). فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنْ كَانَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا فَهُوَ كَمَا قَالَ [مَا لَمْ نَدْرِ].

واتە: لە عیسای کوڕی نومەیلەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای ئیبنو عومەر بووم، دەربارەی خواردنی گۆشتی ژیشك پرسیاری لێ کرا، ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾. سوره الأنعام: ١٤٥.

واتە: (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بڵێ دەستم ناکەوێ لەوەی کەسرووش کراوە بۆم هیچ خۆراکێکی حەرام کراو بۆ کەسێ کە(بیەوێ) بیخوات مەگەر مردارەوە بوو بێ یا خوێنێ ڕژێنراو یا گۆشتی بەراز چونکە بێگومان

ئەوە پیسە، یان سەربڕاوێك بێ (کاتی سەربڕین) ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابێ، جا هەر کەس ناچار بوو (کەئەو حەرامانە بخوات) زیاد لەپێویست نەخوات و مەبەستی سنوور بەزاندن نەبێ ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبووردەی میهرەبانە.

وتی: شێخێ کە لەوێ ئامادەبوو وتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەیوت: لەلای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم باسی خواردنی گۆشتی ژیشك کرا فەرمووی: (گۆشتی ژیشك لە گۆشتە پیسەکانە). ئیبنو عومەر وتی: ئەگەر سەلمێنرا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو فەرمایشتەی فەرموو بێت ئەوە بەو شێوەیە، بەڵام فەرموودەکە صەحیح نیە.

## باسی خواردنێ کە حەرامێتی باس نەکرابێ.

## ٣١ - باب مَا لَمْ يُذْكَرْ تَحْرِيمُهُ.

٣٨٠٠ - (صحيح الاسناد) عن ابن عباس قال: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَأْكُلُونَ أَشْيَاءَ وَيَتْرُكُونَ أَشْيَاءَ تَقَذُّرًا فَبَعَثَ اللَّهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ, وَأَنْزَلَ كِتَابَهُ, وَأَحَلَّ حَلاَلَهُ وَحَرَّمَ حَرَامَهُ, فَمَا أَحَلَّ فَهُوَ حَلاَلٌ, وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ, وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفْوٌ, وَتَلاَ (قُلْ لاَ أَجِدُ فِيمَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا) إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جاران خەڵکانی سەردەمی نەفامی گۆشتی هەندێ جروجانەوەر و ئاژەڵیان دەخواردو گەلێ شتی تریشیان نەدەخواردو قێز و بێزیان لێ دەکردنەوە، هەتا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی بۆ رەوانە کردن و، قورئانەکەی خۆی بۆ ناردن و، حەڵاڵ و حەرامی بۆ رونکردنەوە، هەرچی خوای گەورە بە حەڵاڵی داناوە ئەوە حەڵاڵە، وە هەرچی خوای گەورە بە حەرامی داناوە ئەوە حەرامە هەتا هەتایە، ئەوەشی کە ناوی نەبردوەو لێی بێ دەنگ بووە ئەوە چاوپۆشی لێ کراوەو حەڵاڵە، جا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾. سوره الأنعام: ١٤٥.

## باسی سەبارەت بە خواردنی گۆشتی کەمتیار.

## ٣٢ - باب فِي أَكْلِ الضَّبُعِ.

٣٨٠١ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الضَّبُعِ، فَقَالَ (هُوَ صَيْدٌ، وَيُجْعَلُ فِيهِ كَبْشٌ إِذَا صَادَهُ الْمُحْرِمُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی خواردنی گۆشتی کەمتیار لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیار کرا، فەرمووی: (کەمتیار نێچیرەو راودەکرێ،، ئەگەر کەسێ لە ئیحرامدا بوو راوی بکات فدیەی دەکەوێتە سەر دەبێ فدیەکەی بدات).

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار.

## ٣٣ - باب النَّهْيِ عَنْ أَكْلِ السِّبَاعِ.

٣٨٠٢ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِى نَابٍ مِنَ السَّبُعِ.

واتە: لە ئەبو (ثَعْلَبَة)ی خوشەنییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەك کەڵبەداربێ.

٣٨٠٣ - (صحيح) عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِى نَابٍ مِنَ السَّبُعِ, وَعَنْ كُلِّ ذِى مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەك کەڵبەدار بێ، هەروەها هەر باڵندەیەکیش کە چنگ و نینۆکی تیژ بێت.

٣٨٠٤ - (صحيح) عن المقدام بن معد يكرب: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ لاَ يَحِلُّ ذُو نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ, وَلاَ الْحِمَارُ الأَهْلِىُّ, وَلاَ اللُّقَطَةُ مِنْ مَالِ مُعَاهِدٍ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِىَ عَنْهَا, وَأَيُّمَا رَجُلٍ ضَافَ قَوْمًا فَلَمْ يَقْرُوهُ فَإِنَّ لَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ).

واتە: لە میقداکی کوڕی مەعد یەکریبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بزانن خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی و هەر دڕندەیەك کەڵبەدار بێ حەرامن، هەروەها هەمو دۆزراوەیە کە خاوەنەکەی خاوەن پەیمان بێ جگە لەوانەی کە خاوەنی وازی لێ هێناون حەرامن، هەرکەس لایدا بۆ میوانی کۆمەڵێك لەسەریانە میوانداری بکەن و ڕێزی بگرن، ئەگەر میوانداریان نەکرد پێویستە بەزۆر بەشی خۆی بسێنێت لێیان ئەوەی کە عادەتە بدرێت بە میوان.

٣٨٠٥ - (صحيح) عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِى نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ, وَعَنْ كُلِّ ذِى مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەك کەڵبەدار بێ، هەروەها هەر باڵندەیەکیش کە چنگ و نینۆکی تیژ بێت.

٣٨٠٦ - (ضعيف) عن خالد بن الوليد قال: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ, فَأَتَتِ الْيَهُودُ فَشَكَوْا أَنَّ النَّاسَ قَدْ أَسْرَعُوا إِلَى حَظَائِرِهِمْ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ لاَ تَحِلُّ أَمْوَالُ الْمُعَاهِدِينَ إِلاَّ بِحَقِّهَا, وَحَرَامٌ عَلَيْكُمْ حُمُرُ الأَهْلِيَّةِ وَخَيْلُهَا وَبِغَالُهَا, وَكُلُّ ذِى نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ, وَكُلُّ ذِى مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ).

واتە: لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئامادەی غەزای خەیبەر بووم، جولەکەکان هاتن سکاڵایان کرد کە موسوڵمانان پەلاماری بەرووبوومی دارخورماکانیان داون هی ئەوانەی کە پەیمانی ئاشتیان داوە لەگەڵ موسوڵمانان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاگاداربن و بزانن ماڵ و سامانی خاوەن پەیمانەکان حەڵاڵ نیە بۆتان مەگەر بە هەق واتە ئەگەر (ئەهلی (ذمە) بوون سەرانە(جزیە) ئەوەی کە دەتان دەنێ لەبرێتی پاراستنیان، هەروەها خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی و ئەسپ و ئێسترەکانیان حەرامە بۆتان، وە هەر دڕندەیەك کەڵبەدار بێ و، هەر باڵندەیەکیش کە چنگ و نینۆکی تیژ بێت.

٣٨٠٧ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْهِرِّ. قَالَ ابْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ: عَنْ أَكْلِ الْهِرِّ, وَأَكْلِ ثَمَنِهَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە کرێ و نرخ و بەهای پشیلە، ئیبنو (عبد الملك) وتی: نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی پشیلەو خواردنی نرخ و بەهاکەشی.

## باسى سەبارەت بە خواردنى گۆشتى گوێدرێژى ماڵى.

## ٣٤ - باب فِي أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ.

٣٨٠٨ - (صحيح) عن غالب بن أبجر قال: أَصَابَتْنَا سَنَةٌ, فَلَمْ يَكُنْ فِي مَالِي شَيْءٌ أُطْعِمُ أَهْلِي إِلاَّ شَيْءٌ مِنْ حُمُرٍ, وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَرَّمَ لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ, فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَابَتْنَا السَّنَةُ, وَلَمْ يَكُنْ فِي مَالِي مَا أُطْعِمُ أَهْلِي إِلاَّ سِمَانُ الْحُمُرِ, وَإِنَّكَ حَرَّمْتَ لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ, فَقَالَ: (أَطْعِمْ أَهْلَكَ مِنْ سَمِينِ حُمُرِكَ, فَإِنَّمَا حَرَّمْتُهَا مِنْ أَجْلِ جَوَالِّ الْقَرْيَةِ). يَعْنِى الْجَلاَّلَةَ. .

واتە: لە غالبى كوڕى ئەبجەرەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: توشى قات و قڕى و وشكەساڵى هاتين، بێگومان پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم خواردنى گۆشتى گوێدرێژى ماڵى حەرام كردبوو، چوم بۆ خزمەت پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم وتم: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم توشى وشكەساڵى هاتوين، جگە لە گۆشتى گوێدرێژە قەڵەوەكان هيچ شتێكى تر نيە دەرخواردى خاوخێزانەكەمى بدەم، تۆش خواردنى گۆشتى گوێدرێژى ماڵيت حەرام كردوە، فەرمووى: (گۆشتى گوێدرێژە قەڵەوەكانت دەرخواردى خاوخێزانەكەتى بدە، من لەپێناوى ئەوەدا حەرامم كردوە پيسى دەخوارد).

٣٨٠٩ - (ضعيف الإسناد مضطرب) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمَانَ, حَدَّثَنَا أَبوو نُعَيْمٍ, عَنْ مِسْعَرٍ, عَنِ ابْنِ عُبَيْدٍ, عَنِ ابْنِ مَعْقِلٍ, عَنْ رَجُلَيْنِ مِنْ مُزَيْنَةَ, أَحَدُهُمَا عَنِ الآخَرِ أَحَدُهُمَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ عُوَيْمٍ, وَالآخَرُ غَالِبُ بْنُ الأَبْجَرِ. قَالَ مِسْعَرٌ: أَرَى غَالِبًا الَّذِى أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, [بِهَذَا الْحَدِيثِ].





٣٨١٠ - (ضعيف الإسناد مضطرب) عن جابر بن عبد الله قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ أَنْ نَأْكُلَ لُحُومَ الْحُمُرِ, وَأَمَرَنَا أَنْ نَأْكُلَ لُحُومَ الْخَيْلِ, قَالَ عَمْرٌو فَأَخْبَرْتُ هَذَا الْخَبَرَ أَبَا الشَّعْثَاءِ فَقَالَ: قَدْ كَانَ الْحَكَمُ الْغِفَارِيُّ فِينَا يَقُولُ هَذَا, وَأَبَى ذَلِكَ الْبَحْرُ يُرِيدُ ابْنَ عَبَّاسٍ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی خەیبەردا ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی، فەرمانی پێ کردین بە خواردنی گۆشتی ئەسپ و ماین، عەمر وتی: ئەم هەواڵەم باسکرد بۆ ئەبو (شعثاء) وتی: کاتێ کە حەکەمی غیفاری لە بەصرە لەناوماندا بوو وای دەوت، بەڵام کەڵە زانای ئوممەت (عبد الله)ی کوڕی عەباس ڕێگری لێ کرد.

٣٨١١ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ, وَعَنِ الْجَلاَّلَةِ عَنْ رُكُوبِهَا وَأَكْلِ لَحْمِهَا.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی، هەروەها نەهی کرد لە وڵاخی پیسخۆر خۆی و گۆشتەکەی و شیرەکەشی.

## باسی سەبارەت بە خواردنی کولله.

## ٣٥ - باب فِي أَكْلِ الْجَرَادِ.

٣٨١٢ - (صحيح) عن ابن أبو أوفى قال: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتَّ أَوْ سَبْعَ غَزَوَاتٍ فَكُنَّا نَأْكُلُهُ مَعَهُ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو ئەوفاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم شەش یان حەوت غەزامان کرد، لەو غەزایانەدا لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم کولەمان دەخوارد.

٣٨١٣ - (ضعيف) عن سلمان قال: سئل النبي صلى الله عليه وسلم عن الجراد، فقال: (أَكْثَرُ جُنُودِ اللَّهِ لاَ آكُلُهُ وَلاَ أُحَرِّمُهُ).

واتە: لە سەلمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە خواردنی کولله پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کولله زۆرترینی سوپای خوای گەورەیە لە باڵندەکاندا نە دەیخۆم وە نە حەرامیشی دەکەم).

٣٨١٤ - (ضعيف) عن سلمان قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم سئل, فقال مثله، فقال: سئل النبي صلى الله عليه وسلم عن الجراد، فقال: (أَكْثَرُ جُنْدِ اللَّهِ).

واتە: لە سەلمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە خواردنی کولله پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە وەڵامی دایەوە، فەرمووی: (کولله زۆرترینی سوپای خوای گەورەیە لە باڵندەکاندا).

## باسی سەبارەت بە خواردنی ماسی سەرئاوکەوتو لەدوای مردنی.

## ٣٦ - باب فِي أَكْلِ الطَّافِي مِنَ السَّمَكِ.

٣٨١٥ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا أَلْقَى الْبَحْرُ, أَوْ جَزَرَ عَنْهُ, فَكُلُوهُ, وَمَا مَاتَ فِيهِ وَطَفَا, فَلاَ تَأْكُلُوهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی دەریا فڕێی بداتە کەنار، وە ئەوەی کە دەردەکەوێت لەکاتی گەڕانەوەی ئاوەکەدا یان نیشتنی ئاوەکە ئەوە بیخۆن، بەڵام سەرئاوکەوتو لەدوای مردنی مەخۆن).

## باسی دەبارەی خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو لەبەر ناچاری.

## ٣٧ - بباب فِي الْمُضْطَرِّ إِلَى الْمَيْتَةِ.

٣٨١٦ - (حسن الإسناد) عن جابر بن سمرة: أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ الْحَرَّةَ وَمَعَهُ أَهْلُهُ وَوَلَدُهُ, فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ نَاقَةً لِي ضَلَّتْ, فَإِنْ وَجَدْتَهَا فَأَمْسِكْهَا, فَوَجَدَهَا, فَلَمْ يَجِدْ صَاحِبَهَا, فَمَرِضَتْ, فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: انْحَرْهَا, فَأَبَى, فَنَفَقَتْ, فَقَالَتِ: اسْلُخْهَا حَتَّى نُقَدِّدَ شَحْمَهَا وَلَحْمَهَا وَنَأْكُلَهُ, فَقَالَ: حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ, فَقَالَ: (هَلْ عِنْدَكَ غِنًى يُغْنِيكَ). قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَكُلُوهَا). قَالَ: فَجَاءَ صَاحِبُهَا فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ, فَقَالَ: هَلاَّ كُنْتَ نَحَرْتَهَا! قَالَ: اسْتَحْيَيْتُ مِنْكَ.

واتە: لە جابری کوڕی دەگێڕنەوە، کە پیاوێ بە خۆی ماڵ منداڵیەوە لە

(حَرَّة) دابەزی - (حَرَّة) شوێنێکە لە مەدینە بەردی ڕەشی لێ یە - پیاوێ وشترێکی ون بوو بوو وتی بەو پیاوەی لە (حَرَّة) دابەزی بوو: وشترەکەم ون بووە ئەگەر دۆزیتەوە لای خۆت رای بگرە، کابرا وشترەکەی دۆزیەوە، بەڵام خاوەنی وشترەکەی نەدۆزیەوە، وشترەکە نەخۆشکەوت، ژنەکەی وتی: سەری ببڕە، بەڵام پیاوەکەی نەیویست سەری ببڕێت، وشترەکە مرداربوویەوە، ژنەکەی وتی: کەوڵی بکە با گۆشت و چەوریەکەی وشك بکەینەوەو بیخۆین، پیاوەکە وتی: ئەو کارە ناکەم هەتا پرسیار لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەکەم بزانم چی دەفەرموێت، جا چو بۆ خزمەتی، پرسیاری لێ کرد، فەرمووی: (هیچ شتێکتان هەیە بەشی خواردنی خۆت و خاوخێزانت بکات هەتا لە گۆشتی ئەو مردارەوەبووە نەخۆن).وتی: نەخێر، فەرمووی: (لێی بخۆن). — بێگومان لەبەر ناچاری ڕێگەی پێدان لە گۆشتی ئەو وشترە مردارەوەبووە بخۆن - وتی: خاوەنی وشترەکە هات هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، کابرا وتی: ئەی بۆ سەرت نەبڕی، وتی: شەرمم لێ دەکردی.

٣٨١٧ - (ضعيف الإسناد) عن الفجيع العامري: أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا يَحِلُّ لَنَا مِنَ الْمَيْتَةِ؟ قَالَ: (مَا طَعَامُكُمْ؟). قُلْنَا: نَغْتَبِقُ وَنَصْطَبِحُ, قَالَ أَبو نُعَيْمٍ: فَسَّرَهُ لِي عُقْبَةُ: قَدَحٌ غُدْوَةً, وَقَدَحٌ عَشِيَّةً. قَالَ: (ذَاكَ - وَأَبِي - الْجُوعُ). فَأَحَلَّ لَهُمُ الْمَيْتَةَ عَلَى هَذِهِ الْحَالِ. قَالَ أَبوو دَاوُدَ: الْغَبوقُ مِنْ آخِرِ النَّهَارِ, وَالصَّبوحُ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ.

واتە: لە فوجەیعی عامیرییەوە دەگێڕنەوە، کە چوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: لە مردارەوەبوو چی حەڵاڵە بۆمان؟ فەرمووی: (خواردنی ئێوە چی یە؟)، وتمان: بەیانیان کوپێ شیر و ئێوارانیش کوپێ شیر، ئەبوو نوعەیم وتی: عوقبە بۆی راڤە کردم: (قَدَحٌ غُدْوَة) واتە: بەیانیان کوپێ شیر، (قَدَحٌ عَشِيَّة) واتە: ئێواران کوپێ. وتی: سوێند بێ ئەوەندە خواردن بەس نی یەو ئەوە برسێتیە، لەو حاڵەتەدا گۆشتی مردارەوەبوویان بۆ حەڵاڵە، ئەبو داود دەڵێت: (الْغَبوق) کۆتایی رۆژە، (الصَّبوح) سەرەتای رۆژە.

## باسی سەبارەت بە کۆکردنەوەی دوو جۆر خۆراك.

## ٣٨ - باب فِي الْجَمْعِ بَيْنَ لَوْنَيْنِ مِنَ الطَّعَامِ.

٣٨١٨ - (ضعيف) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَدِدْتُ أَنَّ عِنْدِى خُبْزَةً بَيْضَاءَ, مِنْ بُرَّةٍ سَمْرَاءَ, مُلَبَّقَةً بِسَمْنٍ وَلَبَنٍ). فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَاتَّخَذَهُ, فَجَاءَ بِهِ, فَقَالَ: (فِي أَيِّ شَيْءٍ كَانَ هَذَا). قَالَ: فِي عُكَّةِ ضَبٍّ, قَالَ: (ارْفَعْهُ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆزگە نانێکی سپی لە گەنمی بووایە بە ڕۆن چەوربکرایەو بە شیر تەڕ بکرایە بۆ ئەوەی نەرم بێتەوەو بیخۆم)، پیاوێ لە ئامادەبووان هەستا ڕۆیشت بەو شێوەیە بۆی دروست کرد کە ئەو فەرمووی، جا بۆی هێنا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەم ڕۆنە لە چی دا بووە؟) وتی: لە چەرمێکدا بووە لە پێستی بزنەمژە دروستکراوە، فەرمووی: (بەرزی کەرەوەو لایبە).

## باسی سەبارەت بە خواردنی پەنیر.

## ٣٩ - باب فِي أَكْلِ الْجُبْنِ.

٣٨١٩ - (حسن الإسناد) عن ابن عمر قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجُبْنَةٍ فِي تَبوكَ فَدَعَا بِسِكِّينٍ فَسَمَّى وَقَطَعَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە غەزای تەبووکدا پەنیریان هێنا بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بانگی کرد کە چەقۆی بۆ بێنن چەقۆیان بۆ هێنا ناوی خوای لێ هێناو دەستی کرد بە بڕینی.

## باسی سەبارەت بە سرکە.

## ٤٠ - باب فِي الْخَلِّ.

٣٨٢٠ - (صحيح) عن جابر, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (نِعْمَ الإِدَامُ الْخَلُّ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سرکە چاکترین پێخۆرە).

٣٨٢١ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (نِعْمَ الإِدَامُ الْخَلُّ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)ەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سرکە چاکترین پێخۆرە).

## باسی سەبارەت بە خواردنی سیر.

## ٤١ - باب فِي أَكْلِ الثُّومِ.

٣٨٢٢ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا, أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا, وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ). وَإِنَّهُ أُتِيَ بِبَدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنَ الْبُقُولِ, فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا, فَسَأَلَ, فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ, فَقَالَ: (قَرِّبوهَا) - إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ - فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا, قَالَ: (كُلْ فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)ەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( ئەوەی سیر یان پیاز بخوات با خۆی بەدووربگرێت لێمان،

یان خۆی بەدور بگرێت لە مزگەوتمان و، لەماڵی خۆی دانیشێت و نەیەت بۆ نوێژی جەماعەت)، تەبەقێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەوزەواتی لەسەر بوو، بۆنی سەوزەکە هات، پرسیاری کرد، ئەمە چی یە؟ هەواڵیان دایە کە سەوزەواتە،، فەرمووی: (من نایخۆم نزیکی بکەنەوە لەو پیاوەو بۆی دانێن با بیخوات) - پیاوەکە یەکێ بوو لە هاوەڵانی لەوکاتەدا لە خزمەتیدا ئامادە بوو، حەزی نەکرد بیخوات کە بینی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەیخوارد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (تۆ بیخۆ من بۆیە نایخۆم چونکە لەگەڵ فریشتە گفتوگۆ دەکەم، خۆ تۆ گفتوگۆ لەگەڵ فریشتە ناکەی).

٣٨٢٣ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري قال: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الثُّومُ وَالْبَصَلُ وَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, وَأَشَدُّ ذَلِكَ كُلِّهِ الثُّومُ, أَفَتُحَرِّمُهُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلُوهُ, وَمَنْ أَكَلَهُ مِنْكُمْ فَلاَ يَقْرَبْ هَذَا الْمَسْجِدَ حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهُ مِنْهُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی سیر و پیاز کرا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سیر بۆنی زیاتر و ناخۆشترە، ئەوە بۆ حەرامی ناکەی؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بیخۆن، هەرکەس لە ئێوە خواردی با نزیکی ئەم مزگەوتە نەبێتەوە، هەتا بۆنەکەی دەڕوات).

٣٨٢٤ - (صحيح) عن حذيفة - أظنه عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - قال: (مَنْ تَفَلَ تِجَاهَ الْقِبْلَةِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَفْلُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ, وَمَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الْبَقْلَةِ الْخَبِيثَةِ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا). ثَلاَثًا.

واتە: لە (حذيفة)وە - وا ئەزانم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم -دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: (هەرکەس بەرەو قیبلە تف رۆ بکات لەڕۆی

قیامەت کە دێت تفەکەی بە نێوچاوانیەوەیە، وە هەرکەس لەبەری ئەم دەرختە پیسەی خوارد واتە سیر با نزیکی ئەم مزگەوتەکەمان نەبێتەوە). سێ جار دوپاتی کردەوە.

٣٨٢٥ - (صحيح) عن ابن عمر: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلاَ يَقْرَبَنَّ الْمَسَاجِدَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەبەری ئەم دەرختە پیسەی خوارد واتە سیر با نزیکی مزگەوتەکان نەبێتەوە).

٣٨٢٦ - (صحيح) عن المغيرة بن شعبة قال: أَكَلْتُ ثُومًا, فَأَتَيْتُ مُصَلَّى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ سُبِقْتُ بِرَكْعَةٍ, فَلَمَّا دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِيحَ الثُّومِ, فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَتَهُ قَالَ: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلاَ يَقْرَبْنَا حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهَا). أَوْ (رِيحُهُ). فَلَمَّا قَضَيْتُ الصَّلاَةَ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ لَتُعْطِيَنِّى يَدَكَ. قَالَ: فَأَدْخَلْتُ يَدَهُ فِي كُمِّ قَمِيصِي إِلَى صَدْرِي فَإِذَا أَنَا مَعْصُوبُ الصَّدْرِ قَالَ: (إِنَّ لَكَ عُذْرًا).

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ سیرم خواردبوو بۆ چارەسەری، چوم بۆ نوێژگاکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم رکاتێ نوێژی کردبوو، کاتێ کە چومەژوورەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆنی سیری کرد، کە لەنوێژەکەی بوویەوە فەرمووی: (هەرکەس لەبەری ئەم درەختە پیسەی خوارد با نزیکمان نەبێتەوە، هەتا بۆنەکەی دەڕوات). کاتێ کە منش رکاتە فەوتاوەکەم تەواوکردو لەنوێژ بوومەوە چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوێند بە (الله) دەستم

دەدەیتێ، وتی: لەقۆڵی کراسەکەمەوە دەستیم خستە سەر سنگم لەوکاتەدا سنگی خۆم شەتەك دابوو توند بەستبووم، فەرمووی: (تۆ بەهانەی شەرعیت هەیە چونکە بۆ چارەسەری خواردوتە).

٣٨٢٧ - (صحيح) عن معاوية بن قرة, عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ وَقَالَ: (مَنْ أَكَلَهُمَا فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا). وَقَالَ: (إِنْ كُنْتُمْ لاَ بُدَّ آكِلِيهِمَا فَأَمِيتُوهُمَا طَبْخًا). قَالَ: يَعْنِي: الْبَصَلَ وَالثُّومَ.

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕڕەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە سیر و پیاز بۆ کەسێ بیەوێ بڕوات بۆ مزگەوت، فەرمووی: (هەرکەس سیر و پیازی خوارد با نزیکی مزگەوتەکەمان نەبێتەوە) هەروەها فەرمووی: (ئەگەر هەر ناچار بوون بیخۆن ئەوا بە کوڵاندن بۆنەکەی لەناوبەرن واتە بیکوڵێنن با بۆنەکەی بڕوات ئینجا بیخۆن) راوی وتی: (هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ) واتە: سیر و پیاز.

٣٨٢٨ – (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: نُهِيَ عَنْ أَكْلِ الثُّومِ إِلاَّ مَطْبُوخًا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە خواردنی سیر مەگەر بەکوڵاوی واتە خواردنی سیر بەکوڵاوی دروستە.

٣٨٢٩ - (ضعيف) عن أبو زياد خيار بن سلمة: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنِ الْبَصَلِ, فَقَالَتْ: إِنَّ آخِرَ طَعَامٍ أَكَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامٌ فِيهِ بَصَلٌ.

واتە: لە ئەبو زیادەوە خیاری کوڕی سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە دەربارەی پیاز پرسیاری کردوە لە عائیشە رەزای خوای لێ بێ، عائیشە وتی: کۆتا خۆراکی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کە خواردی خواردنێ بوو پیازی تێدا بوو.

## باسی سەبارەت بە خورما.

## ٤٢ - باب فِي التَّمْرِ.

٣٨٣٠ - (ضعيف) عن عبد الله بن سلام قال: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ كِسْرَةً مِنْ خُبْزِ شَعِيرٍ فَوَضَعَ عَلَيْهَا تَمْرَةً وَقَالَ: (هَذِهِ إِدَامُ هَذِهِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی سەلامەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم دی پارچەیە نانی جۆی هەڵگرت و خوارمای لەسەر داناو فەرمووی: (ئەمە پێخۆری ئەمەیە واتە ئەم خورمایە پێخۆری ئەم پارچە نانەیە).

٣٨٣١ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها قالت: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (بَيْتٌ لاَ تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوماڵەی خورمای تێدا نەبێت خەڵکەکەی برسین).

## باسی سەبارەت بە پشکنینی خورمای کۆن لەکاتی خواردندا.

## ٤٣ - باب فِي تَفْتِيشِ التَّمْرِ الْمُسَوَّسِ عِنْدَ الأَكْلِ.

٣٨٣٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَمْرٍ عَتِيقٍ فَجَعَلَ يُفَتِّشُهُ يُخْرِجُ السُّوسَ مِنْهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خورمایەکی کۆنیان

هێنا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەویش دەنكە دەنكە كرمەكانی لێ دەردەهێناو پاكی دەكردەوە.

٣٨٣٣ - (صحيح) عن إسحاق بن عبد الله بن أبي طلحة :أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُؤْتَى بِالتَّمْرِ فِيهِ دُودٌ. فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئیسحاقی كوڕی (عبد الله)ی كوڕی ئەبوو (گلحە)وە دەگێڕنەوە، كە خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كرمی تێدا بوو. جا راوی فەرموودەكەی پێشوی گێڕایەوە.

## باسی خواردنی دوو دەنك خورما پێكەوە.

## ٤٤ - باب الإِقْرَانِ فِي التَّمْرِ عِنْدَ الأَكْلِ.

٣٨٣٤ - (صحيح) عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الإِقْرَانِ إِلاَّ أَنْ تَسْتَأْذِنَ أَصْحَابَكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی كرد لە خواردنی دوو دەنك دوو دەنك خورما پێكەوە مەگەر هاوڕێكانی رێگەی بدەن.

## باسی خواردنی دوو جۆر خواردن پێكەوە.

## ٤٥ - باب فِي الْجَمْعِ بَيْنَ لَوْنَيْنِ فِي الأَكْلِ.

٣٨٣٥ - (صحيح) عن عبد الله بن جعفر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی جەعفەرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەیاری بە فەریکە خورماوە دەخوارد.

٣٨٣٦ - (حسن) عن عائشة رضى الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ الْبِطِّيخَ بِالرُّطَبِ فَيَقُولُ: (نَكْسِرُ حَرَّ هَذَا بِبَرْدِ هَذَا, وَبَرْدَ هَذَا بِحَرِّ هَذَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاڵەکی بە فەریکە خورماوە دەخواردو دەیفەرموو: (ساردی کاڵەکەکە گەرمای خورماکە دەشکێنێ، ساردی کاڵەکەکە بەرامبەر بە گەرمای خورماکە).

٣٨٣٧ - (صحيح) عن ابني بسر السلميين قالا عَنِ ابْنَىْ بُسْرٍ السُّلَمِيَّيْنِ قَالاَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدَّمْنَا زُبْدًا وَتَمْرًا وَكَانَ يُحِبُّ الزُّبْدَ وَالتَّمْرَ.

واتە: لە هەردوو کوڕەکەی بووسری سولەیمییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان کەرەو خورمامان پێکەوە بۆ دانا، بێگومان زۆر حەزی لەو دوانە بوو.

## باسی بەکارهێنانی دەفر و حاجەتی خاوەن نامەکان.

## ٤٦ - باب في الإستعمال آنية أهل الكتاب.

٣٨٣٨ – (صحيح) عن جابر قال: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنُصِيبُ مِنْ آنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ وَأَسْقِيَتِهِمْ فَنَسْتَمْتِعُ بِهَا فَلاَ يَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جاران لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم غەزامان دەکرد قاپ و دەفرو حاجەت و کوندەو شتی تری لەو جۆرەی بت پەرستەکانمان دەست دەکەوت و بەکارمان دەهێنان، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لەسەر ئەو کارە رەخنەی لێ نەدەگرتین.

٣٨٣٩ - (صحيح) عن أبي ثعلبة الخشني أنه سأل رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: إِنَّا نُجَاوِرُ أَهْلَ الْكِتَابِ وَهُمْ يَطْبُخُونَ فِي قُدُورِهِمُ الْخِنْزِيرَ وَيَشْرَبُونَ فِي آنِيَتِهِمُ الْخَمْرَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَكُلُوا فِيهَا وَاشْرَبُوا, وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا غَيْرَهَا فَارْحَضُوهَا بِالْمَاءِ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا).

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێرنەوە، کە پرسیاری کردوە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتویەتی: ئێمە بەلای خاوەن نامەکاندا تێ دەپەڕین ئەوان لە مەنجەڵەکانیاندا گۆشتی بەراز دەکوڵێنن و لە قاپ و قاچاغەکانیاندا ئارەق و مەی دەخۆنەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر دەفرو قاپ و قاچاخی ترتان دەست کەوت ئەوا لەوەدا بخۆن و بخۆنەوە، ئەگەر دەفرو قاپ و قاچاخی ترتان دەست نەکەوت ئەوا بە ئاو پاك پاك بیانشۆن و تیایاندا بخۆن و بخۆنەوە).

## باسی سەبارەت بە گیانلەبەرانی دەریا.

## ٤٧ - باب فِي دَوَابِّ الْبَحْرِ.

٣٨٤٠ - (صحيح) عن جابر قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَمَّرَ عَلَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ نَتَلَقَّى عِيرًا لِقُرَيْشٍ, وَزَوَّدَنَا جِرَابًا مِنْ تَمْرٍ لَمْ نَجِدْ لَهُ غَيْرَهُ, فَكَانَ أَبو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرَةً تَمْرَةً, كُنَّا نَمُصُّهَا كَمَا يَمُصُّ الصَّبِيُّ, ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهَا مِنَ الْمَاءِ, فَتَكْفِينَا يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ, وَكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنَا الْخَبَطَ, ثُمَّ نَبُلُّهُ

بِالْمَاءِ, فَنَأْكُلُهُ, وَانْطَلَقْنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَرُفِعَ لَنَا كَهَيْئَةِ الْكَثِيبِ الضَّخْمِ, فَأَتَيْنَاهُ فَإِذَا هُوَ دَابَّةٌ تُدْعَى الْعَنْبَرَةِ, فَقَالَ أَبو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ وَلاَ تَحِلُّ لَنَا, ثُمَّ قَالَ لَنا: لاَ, بَلْ نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ, وَقَدِ اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ فَكُلُوا, فَأَقَمْنَا عَلَيْهِ شَهْرًا وَنَحْنُ ثَلاَثُمِائَةٍ حَتَّى سَمِنَّا! فَلَمَّا قَدِمْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ, فَقَالَ: (هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّهُ لَكُمْ, فَهَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ فَتُطْعِمُونَا مِنْهُ؟). فَأَرْسَلْنَا مِنْهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَكَلَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی کردە سەرکردەمان و ناردینی بۆ کەناری دەریا، چاودێری کاروانێکی قورەیش بکەین کە باری خۆراك و شتی تر بوو، هەمبانەیە خورمای داینێ جگە لەوە هیچی تر نەبوو بمانداتێ، رۆشتین، ئەبوو عوبەیدە دەنکە دەنکە خورمای دەداینێ، ئێمەش دەنکە خورماکەمان دەمژی وەك چۆن منداڵ مەمکی دایکی دەمژێ، لەپاشدا ئاومان دەکرد بەسەریدا، ئیتر ئەو رۆژە بەشی تا ئێوارەی دەکردین، بەداردەستەکانیشمان گەڵای درەختمان دەوەراند، بەئاو تەڕمان دەکردو، دەمانخوارد، ئینجا گەیشتینە کەناری دەریا، لەدورەوە تەپۆڵکەیە لمی گەورەمان لێ دەرکەوت، کەچوین سەیردەکەین لاشەی نەهەنگێکە بە مردویی پێی دەگوترێ عەنبەر، ئەبوو عوبەیدە وتی: مردارەوە بووە حەڵاڵ نیە بۆمان بیخۆین، لەپاشدا پێی وتین: نەخێر، بەڵکو ئێمە فروستادەو نێرراوانی پێغەمبەری خواین صلی الله علیه وسلم، لەپێناوی خوای گەورەدا هاتوین، برسیتانەو ناچارن بیخۆن، ئێمەش سێ سەد کەس بووین تا یەك مانگ بەردەوام لێمان خوارد هەتا قەڵەوبووین، کاتێ کە گەڕاینەوەو گەیشینەوە مەدینەو بە دیداری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شادبووینەوە باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (ئەوە رۆزیەکە خوای گەورە بۆی رەخساندون، هیچ شتێ لە گۆشتەکەیتان لەلا ماوە دەرخواردی ئێمەشی بدەن و ئێمەش لێی بخۆین؟). ئێمەش لەو گۆشتەمان نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش لێی خوارد.

## باسی دەربارەی مشكێ بكەوێتە ناو ڕۆنەوە.

## ٤٨ - باب فِي الْفَأْرَةِ تَقَعُ فِي السَّمْنِ.

٣٨٤١ - (صحيح) عن ميمونة: أَنَّ فَأْرَةً وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ, فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَلْقُوا مَا حَوْلَهَا وَكُلُوا).

واتە: لە مەيمونەوە دەڵێت: مشكێ كەوتە ناو ڕۆنەوە، هەواڵەكەيان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مشكەكەو ڕۆنەكەی چواردەوری فڕێ بدەن و بیخۆن). - ئەمە لەكاتێكدا دەبێ كە ڕۆنەكە شل نەبێ خۆ ئەگەر شل بێ نابێ بخورێت - .

٣٨٤٢ - (شاذ) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا وَقَعَتِ الْفَأْرَةُ فِي السَّمْنِ, فَإِنْ كَانَ جَامِدًا فَأَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا, وَإِنْ كَانَ مَائِعًا فَلاَ تَقْرَبُووهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر مشك كەوتە ناو ڕۆنەوە، ئەگەر ڕۆنەكە تەڕ نەبوو ئەوە مشكەكەو ڕۆنەكەی چواردەوری فڕێ بدەن و بیخۆن، بەڵام ئەگەر شل بوو نزیكی نەكەونەوە).

٣٨٤٣ - (ضعيف) عن ميمونة: عن النبي صلى الله عليه وسلم, بِمِثْلِ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ, عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ.

واتە: لە مەيمونەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشو هاتوە، لە زوهریەوە، لە ئیبنو موسەییەبەوە.

## باسی دەربارەی مێشێ بکەوێتە ناو خواردنەوە.

## ٤٩ - باب فِي الذُّبَابِ يَقَعُ فِي الطَّعَامِ.

٣٨٤٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَامْقُلُوهُ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً, وَفِي الآخَرِ شِفَاءً, وَإِنَّهُ يَتَّقِي بِجَنَاحِهِ الَّذِي فِيهِ الدَّاءُ, فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر مێش کەوتە ناو دەفرو قاپی یەکێکتانەوە شلەمەنی تێدا بوو مێشەکە بەتەواوی نوقم بکەن ئینجا دەری بهێنن و فرێی بدەن و خواردنەکە بخۆن، چونکە باڵێکی دەردی پێوەیە، باڵەکەی تری دەرمان شیفا بەخشە، بێگومان ئەگەر کەوتە ناو شتێکی لەو جۆرەوە ئەو باڵەی دادەبەزێنێ کە دەردی پێوەیە باڵەکەی تری بەرزدەکاتەوە، بۆیە مێشەکە هەمووی نوقم بکەن).

## باسی دەربارەی پارویە لەدەست بکەوێتەخوارەوە.

## ٥٠ - باب فِي اللُّقْمَةِ تَسْقُطُ.

٣٨٤٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا لَعِقَ أَصَابِعَهُ الثَّلاَثَ وَقَالَ: (إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذَى وَلْيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ). وَأَمَرَنَا أَنْ نَسْلُتَ الصَّحْفَةَ, وَقَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِي فِي أَيِّ طَعَامِهِ يُبَارَكُ لَهُ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنێکی دەخوارد سێ پەنجەکەی دەلێسایەوەو دەیفەرموو:

(ئەگەر پاروی کەسێکتان کەوتەخوارەوە با پاکی بکاتەوەو بیخوات، بەجێی نەهێڵێ بۆ شەیتان). فەرمانی پێ دەکردین کە قاپەکە دالێسین و هیچی تێدا نەهێڵین، فەرمووی: (چونکە کەس لەئێوە نازانێت پیت و بەرەکەتی خواردنەکەی بە کامەوەیەتی).

## باسی سەبارەت بە نانخواردنی خزمەتکار لەگەڵ گەورەکەی.

## ٥١ - باب فِي الْخَادِمِ يَأْكُلُ مَعَ الْمَوْلَى.

٣٨٤٦ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِذَا صَنَعَ لأَحَدِكُمْ خَادِمُهُ طَعَامًا ثُمَّ جَاءَهُ بِهِ وَقَدْ وَلِيَ حَرَّهُ وَدُخَانَهُ فَلْيُقْعِدْهُ مَعَهُ لِيَأْكُلَ, فَإِنْ كَانَ الطَّعَامُ مَشْفُوهًا فَلْيَضَعْ فِي يَدِهِ مِنْهُ أَكْلَةً أَوْ أَكْلَتَيْنِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان خزمەتکارەکەی خواردنێکی بۆ دروست کرد، لەپاشدا بۆی هێنا کە ئەو پێوەی ماندو بووەو گەرمای چەشتوەو دوکەڵەکەی چوە بەسەروچاویدا با دایبنیشێنێ نانەکەی لەگەڵ بخوات، ئەگەر خواردنەکە کەم بوو پارویە دوو پاروی بداتێ).

## باسی سەبارەت بە خاولی و دەستەسڕ.

## ٥٢ - باب فِي الْمِنْدِيلِ.

٣٨٤٧ - (صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمْسَحَنَّ يَدَهُ بِالْمِنْدِيلِ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە خواردنی خوارد کاتێ لێ بوویەوە با بە خاولی و دەستەسڕ دەستی نەسڕێت هەتا دەیلێسێتەوە، یان یەکێکی تر بۆی دەیلێسێتەوە).

٣٨٤٨ - (صحيح) عن كعب بن مالك: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ وَلاَ يَمْسَحُ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا.

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە سێ پەنجە نانی دەخوارد دەستی نەدەسڕی هەتا نەیلێسایەتەوە.

## باسی ئەگەر کەسێ نانی خوارد لەپاش خواردن چی دەیلێ.

## ٥٣ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا طَعِمَ.

٣٨٤٩ - (صحيح) عن أبو أمامة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رُفِعَتِ الْمَائِدَةُ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبُّنَا).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەپاش نانخواردن کە سفرەکە هەڵدەگیرا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ خوا، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ، خوای گەورە بەسمانەو وازمان لێ نەهێنراوەو وەلانەنراوین و، پەروەردگارمان کەس نیە بێ نیاز بێ پێی).

٣٨٥٠ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ قَالَ (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، كاتێ كە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لێ دەبووەوە لە خواردن دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ خوا، كە خواردنی داینێ و تێرئاوی كردین و كردوینی بە یەكێك لە موسوڵمانان).

٣٨٥١ - (صحيح) عن أبو أيوب الأنصاري قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ قَالَ (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجًا).

واتە: لە ئەبو ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم خواردن یان خواردنەوەی دەخوارد لەپاشدا دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی خواردن و داینێ و تێرئاوی كردین و دابەزاندنی خواردنەكەی ئاسان كردوە لە گەروداو دەرچەی بۆ داناوە).

## باسی سەبارەت بە دەست شتن لەپاش خواردن.

## ٥٤ - باب فِي غَسْلِ الْيَدِ مِنَ الطَّعَامِ.

٣٨٥٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ غَمَرٌ وَلَمْ يَغْسِلْهُ فَأَصَابَهُ شَيْءٌ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (كەسێ بە دەستی چەورو لینجەوە خەوت و نەیشۆرێ توشی شتێ بوو با سەرزەنشتی كەس نەكات).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی پاڕانەوە بۆ خاوەن سفرەو خوان.

## ٥٥ - باب مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ لِرَبِّ الطَّعَامِ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ.

٣٨٥٣ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: صَنَعَ أَبوو الْهَيْثَمِ بْنُ التَّيْهَانِ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا, فَدَعَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ فَلَمَّا فَرَغُوا قَالَ: (أَثِيبووا أَخَاكُمْ). قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا إِثَابَتُهُ؟ قَالَ: (إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا دُخِلَ بَيْتُهُ فَأُكِلَ طَعَامُهُ وَشُرِبَ شَرَابُهُ فَدَعَوْا لَهُ فَذَلِكَ إِثَابَتُهُ)..

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (أَبوو الْهَيْثَمِ)ی کوڕی تەیهان خواردنێکی دروست کرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی بانگهێشت کرد، کاتێك کە لێ بوونەوە، فەرمووی: (بپاڕێنەوە بۆ براکەتان). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (إِثَابَتُهُ) مانای چی یە؟ فەرمووی: (کاتێ کەسێ رۆشتە ماڵی کەسێکەوە خواردنی خواردو خواردنەوەی نۆشی و پاڕایەوە بۆ خاوەن سفرەو خوانەکە ئەو کەسەی کە خواردن و خواردنەوەکەی داوەتێ ئەوە(إِثَابَتُهُ)وە).

٣٨٥٤ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ, فَجَاءَ بِخُبْزٍ وَزَيْتٍ, فَأَكَلَ, ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ, وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ, وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆلای سەعدی کوڕی عوبادە، سەعد نان و زەیتی بۆ دانا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نانی خوارد، لەپاشدا فەرمووی: (هەمیشە رۆژووەوانان بەربانگتان لەلا بکەنەوە، پیاوچاکان نانتان بخۆن و، مەلائیکەکان درودو رەحمەتتان بۆ بنێرن).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی پزیشکی.

# ٢٩ - أول كتاب الطب.

## باسی سەبارەت بە کەسێ چارەسەری خۆی دەکات.

## ١ - باب فِي الرَّجُلِ يَتَدَاوَى.

٣٨٥٥ - (صحيح) عن أسامة بن شريك قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَأَصْحَابُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمُ الطَّيْرُ - فَسَلَّمْتُ, ثُمَّ قَعَدْتُ, فَجَاءَ الأَعْرَابُ مِنْ هَا هُنَا وَهَا هُنَا, فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَنَتَدَاوَى؟ فَقَالَ: (تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ: الْهَرَمُ).

واتە: لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - هاوەڵانی وەك باڵندە بەسەریانەوە بێت وابوون ئەوەندە بێ دەنگ دانیشتبوون - سڵاوم کرد، لەپاشدا دانیشتم، هەندێ عەرەبی دەشتەکی لێرەو لەوێ هاتن پرسیاریان دەکرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا خۆمان تیمار بکەین؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا خۆتان تیمار بکەن و داو دەرمان بەکاربهێن و چارەسەری خۆتانی پێ بکەن، ئەوەش بزانن خوای پەروەردگار هەر دەردێکی دانابێ دەرمانیشی بۆ داناوە. جگە لەیەك دەرد نەبێ، ئەویش دەردی پیرییە).

## باسی سەبارەت بەدورکەوتنەوە لەهەندێ خواردن لەبەر نەخۆشیە لە نەخۆشیەکان.

## ٢ - باب فِي الْحِمْيَةِ.

٣٨٥٦ - (حسن) عن أم المنذر بنت قيس الأنصارية قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ عَلِيٌّ, وَعَلِيٌّ نَاقِهٌ, وَلَنَا دَوَالِي مُعَلَّقَةٌ, فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ مِنْهَا, وَقَامَ عَلِيٌّ لِيَأْكُلَ, فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لِعَلِيٍّ: (مَهْ إِنَّكَ نَاقِهٌ), حَتَّى كَفَّ عَلِيٌّ. قَالَتْ: وَصَنَعْتُ شَعِيرًا وَسِلْقًا فَجِئْتُ بِهِ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَلِيُّ, أَصِبْ مِنْ هَذَا فَهُوَ أَنْفَعُ لَكَ).

واتە: لە (ئوم المنذر)ی کچی قەیسی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لام، پێشەوا عەلیشی ڕەزای خوای لێ بێ لەگەڵدا بوو، لەوکاتەدا پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ تازە لە نەخۆشی چاك دەبۆوە، هێشوی فەریکە خورمامان هەبوو هەڵمان واسیبوو بۆ ئەوەی پێ بگات و لێی بخۆین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا لێی خوارد، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەستی بۆ برد بیخوات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیهێشت بیخوات پێی فەرموو: ( مەکە نەیخۆی تۆ تازە لە نەخۆشی هەستاویتەتەوە دەبێ پارێز بکەی لەهەندێ خواردن هەتا بە تەواوی چاك دەبیتەوە)، (ئوم المنذر) وتی: جۆو سڵقم دروست کرد، بۆم هێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەلی لەمە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ باشترەو بەسود ترە).

## باسی سەبارەت بە کەڵەشاخگرتن.

## ٣ - باب فِي الْحِجَامَةِ.

٣٨٥٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ خَيْرٌ: فَالْحِجَامَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەم شتانەی کە ئێوە تەداوی پێ دەکەن ئەگەر باشیان تێدا بێت ئەوا یەکێکیان کەڵەشاخ گرتنە).

٣٨٥٨ - (حسن) عن سلمى خادم رسول الله صلى الله عليه وسلم قالت: مَا كَانَ أَحَدٌ يَشْتَكِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعًا فِي رَأْسِهِ إِلاَّ قَالَ: (احْتَجِمْ). وَلاَ وَجَعًا فِي رِجْلَيْهِ إِلاَّ قَالَ: (اخْضِبْهُمَا).

واتە: لە سەلمای کارەکەری پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەر کەسێ سکاڵای سەر ئێشەی لەلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بکردایە پێی دەفەرموو: (کەڵەشاخ بگرە)، وە هەر کەسێکیش سکاڵای ئێشی قاچەکانی لەلای بکردایە پێی دەفەرموو: (خەنەیان تێ بگرە).

## باسی سەبارەت بە شوێنی کەڵەشاخگرتن.

## ٤ - باب فِي مَوْضِعِ الْحِجَامَةِ.

٣٨٥٩ - (ضعيف عدا جملة (بَيْنَ كَتِفَيْهِ) عن أبو كبشة الأنماري قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَحْتَجِمُ عَلَى هَامَتِهِ وَبَيْنَ كَتِفَيْهِ, وَهُوَ يَقُولُ: (مَنْ أَهْرَاقَ مِنْ هَذِهِ الدِّمَاءِ فَلاَ يَضُرُّهُ أَنْ لاَ يَتَدَاوَى بِشَيْءٍ لِشَيْءٍ).

واتە: لە ئەبو كەبشەی ئەنماریەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سەری و نێوشانی كەڵەشاخی دەگرت، دەیفەرموو: (هەركەس خوێنی ئەم شوێنانە بەربدات ئەگەر بە هیچ بۆ هیچ خۆی تیمار نەكات هیچ زیانی پێ ناگات).

٣٨٦٠ - (صحيح) عن أنس قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ ثَلَاثًا فِي الأَخْدَعَيْنِ وَالْكَاهِلِ. قَالَ مَعْمَرٌ: احْتَجَمْتُ فَذَهَبَ عَقْلِي, حَتَّى كُنْتُ أُلَقَّنُ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ فِي صَلَاتِي, وَكَانَ احْتَجَمَ عَلَى هَامَتِهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسێ شوێنی جەستەی كەڵەشاخی دەگرت: لە دوو رەگەكەی لاملی و نێوشانی. مەعمەر وتی: كەڵەشاخم گرت عەقڵم لەدەست دا تەنانەت لەنوێژدا سورەتی فاتیحەم لێ تێك دەچو هەڵەم تێدا دەكرد — پێ دەچێت لەشوێنێكی نەگونجاودا كەڵەشاخی گرتبێت، یان بۆ نەخۆشیە لەسەریدا بووبێ كەڵەشاخی گرتبێ كەڵەشاخ بۆی باش نەبووبێت -، مەعمەر كەڵەشاخی لەسەری گرتبوو.

## باسی كەڵەشاخ گرتن چ كاتێ باشە؟

## ٥ - باب مَتَى تُسْتَحَبُّ الْحِجَامَةُ ؟

٣٨٦١ - (حسن) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ احْتَجَمَ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ كَانَ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس لە حەڤدەو نۆزدەو بیست و یەكی مانگی عەرەبی دا كەڵەشاخ لەخۆی بگرێت دەبێت بە شیفای هەموو دەردێ بۆی).

٣٨٦٢ - (ضعيف) عن كيسة بنت أبن بكرة, أَنَّ أَبَاهَا كَانَ يَنْهَى أَهْلَهُ عَنِ الْحِجَامَةِ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ, وَيَزْعُمُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ يَوْمُ الدَّمِ, وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يَرْقَأُ.

واتە: لە كەیبسەی كچی ئەبو بەكرەوە دەگێرنەوە، كە باوكی جڵەوگیری دەكرد لەوەی كە كەسوكار و خانەوادەكەی لەرۆژی سێ شەمەدا كەڵەشاخ لەخۆیان بگرن، پێی وابوو لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هاتوە كە رۆژی سێ شەممە رۆژی خوێن جمانە، سەعاتێكی تێدایە خوێنی تێدا ناوەستێتەوە.

## باسی سەبارەت بە بڕینی دەمار و شوێنی كەڵەشاخگرتن.

## ٦ - باب فِي قَطْعِ الْعِرْقِ, وَمَوْضِعِ الْحَجْمِ.

٣٨٦٣ - (صحيح) عن جابر قال: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أُبَيٍّ طَبِيبًا فَقَطَعَ مِنْهُ عِرْقًا.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پزیشكێكی نارد بۆ ئوبەی كوڕی كەعب پزیشكەكە دەمارێكی ئوبەی بڕی بۆ چارەسەركردنی.

٣٨٦٤ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ عَلَى وَرِكِهِ مِنْ وَثْءٍ كَانَ بِهِ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كەڵەشاخی گرت لە سمتی لەبەر ئازارێ كە هەیبوو (الوثء) ئازارێكە لە گۆشتدا ناگاتە سەر ئێسك یان ئازارێكە لە ئێسكدا بەبێ ئەوەی شكابێ.

## باسی سەبارەت بە داخکردن.

## ٧ - باب فِي الْكَيِّ.

٣٨٦٥ - (صحيح) عن عمران بن حصين قال: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْكَيِّ, فَاكْتَوَيْنَا, فَمَا أَفْلَحْنَ وَلاَ أَنْجَحْنَ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَكَانَ يَسْمَعُ تَسْلِيمَ الْمَلاَئِكَةِ, فَلَمَّا اكْتَوَى انْقَطَعَ عَنْهُ فَلَمَّا تَرَكَ رَجَعَ إِلَيْهِ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جڵەوگیری کرد لە خۆ داخکردن بە مەبەستی چارەسەری، بەڵام ئێمە خۆمان داخ دەکرد، نە سەرکەوتو دەبووین نە رزگاریشمان دەبوو واتە سودی نەبوو بۆمان.
ئەبو داود دەڵێت: لەپێشدا عیمران مەلائیکە سەلامیان لێ دەکرد بە گوێی خۆی سڵاوەکەیانی دەبیست، کاتێ کە خۆی داخ کرد بە مەبەستی چارەسەری مەلائیکەکان لێی دابڕان، کاتێ کە وازی لە خۆ داخکردن هێنا دیسانەوە مەلائیکەکان گەڕانەوەو سڵاویان لێ دەکردو دەیبیست.

٣٨٦٦ – (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَوَى سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ مِنْ رَمِيَّتِهِ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەعدی کوڕی (مُعَاذ)ی داخ کرد لەکاتێکدا کە بە تیرێ باڵی پێکرابوو.

## باسی سەبارەت بە دەرمان تکاندنە لوت.

## ٨ - باب فِي السَّعُوطِ.

٣٨٦٧ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعَطَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرمانی دەتکانە ناو لوتی خۆیەوە.

## باسی سەبارەت بە ( النُّشْرَةِ ) جۆرێکە لەدوعاو نوشتە.

## ٩ - باب فِي النُّشْرَةِ.

٣٨٦٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النُّشْرَةِ فَقَالَ (هُوَ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە (نُشْرَة) پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش فەرمووی: ((نُشْرَة) لە کردەوەی شەیتانە).

## باسی سەبارەت بە تریاق: دەرمانێکە چارەسەری ئەوانە دەکات کە ژەهر کاریان تێ دەکات.

## ١٠ - باب فِي التِّرْيَاقِ.

٣٨٦٩ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا أُبَالِي مَا أَتَيْتُ إِنْ أَنَا شَرِبْتُ تِرْيَاقًا, أَوْ تَعَلَّقْتُ تَمِيمَةً, أَوْ قُلْتُ الشِّعْرَ

مِنْ قِبَلِ نَفْسِي). قَالَ أَبوو دَاوُدَ: هَذَا كَانَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاصَّةً, وَقَدْ رَخَّصَ فِيهِ قَوْمٌ, يَعْنِي التِّرْيَاقَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر من تریاق بخۆم و، نوشتە هەڵبگرم و، شیعر بڵێم ئیتر هەرچی خراپەی تر هەیە بیکەم دەربەست نایەم). ئەبو داود دەڵێت: ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، روخسەتی خەڵکی تری داوە، واتە: تریاق.

## باسی سەبارەت بە بەکارهێنانی دەرمانی پیس و خراپ.

## ١١ - باب فِي الأَدْوِيَةِ الْمَكْرُوهَةِ.

٣٨٧٠ - (ضعيف) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاءَ, وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً, فَتَدَاوَوْا وَلاَ تَدَاوَوْا بِحَرَامٍ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای پەروەردگار هەم دەردو هەم دەرمانی داناوە، بۆ هەر دەردێ دەرمانێکی داناوە، دەرمانی دەردی خۆتان بکەن، بەڵام بە حەرام دەرمانی دەردی خۆتان مەکەن).

٣٨٧١ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عثمان: أَنَّ طَبِيبًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ فَنَهَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِهَا.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی (عثمان)ەوە دەگێرنەوە، کە پزیشکێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئایا دروستە بۆق بکرێتە ناو دەرمانەوە؟

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەدا کە بیکوژێت.

٣٨٧٢ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کرد لە چارەسەری بە دەرمانی پیس.

٣٨٧٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ حَسَا سُمًّا فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس زەهر بخواتەوەو بە زەهر خۆی بکوژێت ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئاگری دۆزەخدا زەهرەکەی لەناو دەستیدایەو پەیتا پەیتا دەیخواتەوە هەتا هەتایە، بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە).

٣٨٧٤ - (صحيح) عن طارق بن سويد أو سويد بن طارق: سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْخَمْرِ فَنَهَاهُ, ثُمَّ سَأَلَهُ فَنَهَاهُ, فَقَالَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ, إِنَّهَا دَوَاءٌ, قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ وَلَكِنَّهَا دَاءٌ).

واتە: لە (طارق)ی کوڕی سوەیدەوە یان لە سوەیدی کوڕی (طارق)ەوە دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئارەق و مەی پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش ڕێگری لێ کرد، لەپاشدا پرسیاری لێ کردەوە دیسانەوە ڕێگری لێ کرد، پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە دەرمانە، فەرمووی: (نەخێر ئەوە دەرمان نیە، بەڵکو ئەوە دەردە)[1].

(١) نیتر پرسیارەکەی دەربارەی دروستکردنی بێت یان بەکارهێنانی بێت وەك دەرمان.

## باسی سەبارەت بە خورمای عەجوە.

## ١٢ - باب فِي تَمْرَةِ الْعَجْوَةِ.

٣٨٧٥ - (ضعيف) عن سعد قال: مَرِضْتُ مَرَضًا أَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي, فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا عَلَى فُؤَادِي, فَقَالَ: (إِنَّكَ رَجُلٌ مَفْئُودٌ, ائْتِ الْحَارِثَ بْنَ كَلَدَةَ أَخَا ثَقِيفٍ فَإِنَّهُ رَجُلٌ يَتَطَبَّبُ فَلْيَأْخُذْ سَبْعَ تَمَرَاتٍ مِنْ عَجْوَةِ الْمَدِينَةِ فَلْيَجَأْهُنَّ بِنَوَاهُنَّ, ثُمَّ لِيَلُدَّكَ بِهِنَّ).

واتە: لە سەعدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەساڵی رزگاركردنی مەككەدا نەخۆشكەوتم توشی نەخۆشیەكی توند هاتم بەو بۆنەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردان و هەواڵپرسیم، دەستی دانا لەنێوانی هەردوو مەمكمدا هەتا لەناو دڵمەوە هەستم بە فێنكی دەستی كرد، فەرمووی: (تۆ نەخۆشی دڵت هەیە بچۆ بۆلای (حارث)ی كوڕی كەلەدەی برای (ثَقِیف) ئەو دەستی پزیشكی هەیە با حەوت دەنك خورمای عەجوەی مەدینە بێنێ و بە ناوكەكەیانەوە بیان كوتێ، لەپاشدا دەرخواردتی بدات).

٣٨٧٦ - (صحيح) عن سعد بن أبي وقاص, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ تَصَبَّحَ سَبْعَ تَمَرَاتِ عَجْوَةٍ لَمْ يَضُرُّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلاَ سِحْرٌ).

واتە: لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەیانیان حەوت دەنك خورمای عەجوە بخوات ئیتر ئەو رۆژە زەهر و جادو زیانی پێ ناگەیەنن).

# باسی سەبارەت بە تەقاندنی دومەڵی گەروی منداڵ بە پەنجە.

## ١٣ - باب فِي الْعِلاَقِ.

٣٨٧٧ - (صحيح) عن أم قيس بنت محصن قالت: عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ قَالَتْ دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِابْنٍ لِي قَدْ أَعْلَقْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ فَقَالَ: (عَلاَمَ تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذَا الْعِلاَقِ؟ عَلَيْكُنَّ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ, فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ, مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ: يُسْعَطُ مِنَ الْعُذْرَةِ, وَيُلَدُّ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي بِالْعُودِ: الْقُسْطَ.

واتە: لە ئوممو قەیسی کچی میحصەنەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆلام کوڕێکی بچوکی خۆمم پێ بوو دومەڵ لەناو قوڕگی دەرچوو بوو بە زەبری پەنجە دومەڵەکەم بۆ تەقاند، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بۆچی بە زەبری پەنجە دومەڵی گەروی منداڵەکانتان دەتەقێنن و ئازاریان دەدەن؟ عودی هیندی بەکاربهێنن چونکە شیفای حەوت دەردە، لەوانە: بۆ چارەسەری نەخۆشی ئاوبەنگی ناوسك(ذَاتُ الْجَنْب) و دومەڵی گەرووی منداڵە، بۆ چارەسەری دومەڵی گەرووی منداڵ دەرمانەکە دەیتکێننە ناو لوتی، ئاوەکەشی دەخورێتەوە بۆ نەخۆشی ئاوبەنگی ناوسك(ذَاتُ الْجَنْب). ئەبو داود دەڵێت: مانای بە عود: واتە (الْقُسْط) دارێکە بۆنێکی خۆشی هەیە، وەك دەرمان بۆ نەخۆشی بەکاردەهێنرێت.

## باسی دەربارەی کل.

## ١٤ - باب فِي الأَمْرِ بِالْكُحْلِ.

٣٨٧٨ - عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ, وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ, وَإِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الإِثْمِدُ, يَجْلُو الْبَصَرَ, وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جل و بەرگی سپی لەبەر بکەن چونکە چاکترین جل و بەرگە بۆ ئێوە، بیکەن بە کفنیش بۆ مردوکانتان، چاکترین کلی ئێوەش کلی ڕەشە چاوتان پاك دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، مووی برژانگیشتان دەڕوێنێتەوە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی چاوپیسی.

## ١٥ - باب مَا جَاءَ فِي الْعَيْنِ.

٣٨٧٩ – عن أبو هريرة: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال (الْعَيْنُ حَقٌّ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاوی پیس ڕاستە هەیەو کاریگەری هەیە).

٣٨٨٠ - (صحيح الإسناد) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ فَيَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جاران فەرمانیان دەدا بە چاوپیسەکە دەستنوێژی دەگرت ئینجا بە چاوەوە بوەکە بەو ئاوە خۆی دەشۆری.

# باسی (غیل) بریتیە لەوەی پیاوێ لەگەڵ ژنەکەی جوت دەبێ لەکاتێکدا کە ژنەکەی شیر دەدات لەوانەیە سکی پڕ ببێ و ببێتەهۆی خراپی شیرەکە.

## ١٦ - باب فِي الْغَيْلِ.

٣٨٨١ - (حسن) عن أسماء بنت يزيد بن السكن قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ سِرًّا, فإِنَّ الْغَيْلَ يُدْرِكُ الْفَارِسَ فَيُدَعْثِرُهُ عَنْ فَرَسِهِ).

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە نهێنی منداڵەکانتان مەکوژن، چونکە ئاکامی (غیل) گلاندنی سوارە لەسەر ئەسپەکەی واتە ئەو شیرە دەبێتەهۆی بێ هێزی جەستەی منداڵەکە).

٣٨٨٢ - (صحيح) عن جدامة الأسدية قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغَيْلَةِ حَتَّى ذُكِّرْتُ أَنَّ الرُّومَ وَفَارِسَ يَفْعَلُونَ ذَلِكَ فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ). قَالَ مَالِكٌ: الْغَيْلَةُ أَنْ يَمَسَّ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ تُرْضِعُ.

واتە: لە جودامەی ئەسەدییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی نیازم کرد ڕێگری بکەم لە (الْغَيْلَة) هەتا بۆیان ڕونکردمەوە کە فارس و ڕۆم ئەو کارە دەکەن و منداڵەکانیشیان هیچ زیانیان پێ ناگات). مالیك وتی: (الْغَيْلَة) بریتیە لەوەی پیاوێ لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ لەکاتێکدا کە ژنەکەی شیر بدات.

## باسی سەبارەت بە هەڵواسینی نوشتەو چاوەزار.

## ١٧ - باب فِي تَعْلِيقِ التَّمَائِمِ.

٣٨٨٣ - (صحيح) عن زينب امرأة عبد الله عن عبد الله قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ). قَالَتْ: قُلْتُ: لِمَ تَقُولُ هَذَا؟ وَاللَّهِ لَقَدْ كَانَتْ عَيْنِي تَقْذِفُ, وَكُنْتُ أَخْتَلِفُ إِلَى فُلَانٍ الْيَهُودِيِّ يَرْقِينِي, فَإِذَا رَقَانِي سَكَنَتْ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِنَّمَا ذَاكِ عَمَلُ الشَّيْطَانِ, كَانَ يَنْخَسُهَا بِيَدِهِ فَإِذَا رَقَاهَا كَفَّ عَنْهَا, إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكِ أَنْ تَقُولِي كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ, اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي, لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ, شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا).

واتە: لە زەینەی هاوسەری (عبد الله)ی کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (دوعاو نوشتەو چاوەزار و نوشتەی چەورو شیرینی شیرکن). - واتە هاوبەش بۆ خوای گەورە دانانن ئەگەر بەپێی قورئان وسوننەت نەکرێن و شەرعی نەبن- زەینەب وتی: وتم: ئەوە بۆچی وا دەڵێی؟ سوێند بە (الله) جاران چاوم ئاوی دەکرد دەچوم بۆلای فڵانە جولەکە دوعای بەسەردا دەخوێند ئیتر چاوم چاك دەبووەوە، (عبد الله) وتی: ئەوە کاری شەیتان خۆی بووە دەستی ژەندوە بە ناو چاوتا هەتا چاوت ئێش بکات و بچی بۆلای ئەو جولەکەیە، جولەکەکە نوشتەی بۆ کردوە ئیتر شەیتان وازی لێ هێناوەو چاوت چاك بوەتەوە، بەڵام تۆ ئەوەندەت بەس بوو ئەوە بڵێی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەی لابەری ئێش و ئازار، ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك، شیفای بدە تۆ شیفابەخشی، جگە لەتۆ شیفابەخشی تر نیە، شیفایەکی وەها هیچ دەردو نەخۆشیە بەجێ نەهێڵێت).

٣٨٨٤ - (صحيح) عن عمران بن حصين , عن النبي صلى الله عليه وآله وسلم قال: (لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوشتەکردن ڕەوا نیە ئیللا بۆ چاوەزار و بۆ چارەسەری ژەهری جرِوجانەوەری ژەهردار نەبێت).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە نوشتەکردن.

## ١٨ - باب مَا جَاءَ فِي الرُّقَى.

٣٨٨٥ - (ضعيف الإسناد) عن محمد بن يوسف بن ثابت بن قيس بن شماس, عن أبيه, عن جده: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ, قَالَ أَحْمَدُ: وَهُوَ مَرِيضٌ, فَقَالَ: (اكْشِفِ الْبَاسَ, رَبَّ النَّاسِ). عَنْ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ, ثُمَّ أَخَذَ تُرَابًا مِنْ بَطْحَانَ فَجَعَلَهُ فِي قَدَحٍ, ثُمَّ نَفَثَ عَلَيْهِ بِمَاءٍ, وَصَبَّهُ عَلَيْهِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسەوە، لە باوکیەوە، لەباپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە بۆ سەردانی (ثابت)ی کوڕی قەیس، لەکاتێکدا کە نەخۆش بووە، فەرموویەتی: (ئەی لابەری ئێش و ئازار، ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك). لە (ثابت)ی کوڕی قەیسەوە، لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەندێ گڵی لە (بطحان) هەڵگرت و کردیە ناو پەرۆداخێکەوە، ئینجا دوعا یان قورئانی خوێند بەسەر ئاوی دوعاکەداو کردی بەسەر گڵەکەدا فووی پێدا کردو کردی بەسەر (ثابت)دا.

٣٨٨٦ - (صحيح) عن عوف بن مالك قال: كُنَّا نَرْقِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ, فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَرَى فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ, لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ تَكُنْ شِرْكًا).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامی دا نوشتەمان دەکرد، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە چۆنە بەلاتەوە؟ فەرمووی: (نوشتەکانتانم پیشان بدەن، نوشتە ئەگەر شیرکی تێدا نەبێت هیچی تێدا نیەو قەیناکات).

٣٨٨٧ - (صحيح) عن الشفاء بنت عبد الله, قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا عِنْدَ حَفْصَةَ, فَقَالَ لِي: (أَلاَ تُعَلِّمِينَ هَذِهِ رُقْيَةَ النَّمْلَةِ كَمَا عَلَّمْتِيهَا الْكِتَابَةَ!).

واتە: لە (شِفَاءِ)ی کچی (عبد الله)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من لەلای حەفصەی هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆلام، پێی فەرمووم: (حەفصە فێری دوعا خوێندن و نوشتەی شەرعی ناکەی وەك چۆن فێری نوسینت کرد).

٣٨٨٨ - (ضعيف الإسناد) عن سهل بن حنيف قال: مَرَرْنَا بِسَيْلٍ, فَدَخَلْتُ فَاغْتَسَلْتُ فِيهِ, فَخَرَجْتُ مَحْمُومًا, فَنُمِيَ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ (مُرُوا أَبَا ثَابِتٍ يَتَعَوَّذْ). قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا سَيِّدِي وَالرُّقَى صَالِحَةٌ, فَقَالَ: (لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ فِي نَفْسٍ أَوْ حُمَةٍ أَوْ لَدْغَةٍ).

واتە: لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دامان بەلای ئاوێکی بە خوڕ یان لافاوێکدا چومە ناوی و خۆم شت، کاتێ کە هاتمەدەرەوە توشی تا هاتم، بەسەرهاتەکەیان گەیاند بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (بە (أبا ثابت) بلێن با پەنا بگرێت بە خوای گەورە لە چاوی پیس).
- (أبا ثابت) نازناوی سەهلی کوڕی حونەیف بوو -، ڕەباب کە نەنکی یەکێ لە راویەکان بوو وتی: وتم: گەورەم نوشتەی چاك بەسودە بۆ بوون بە چاوەوە، فەرمووی: (نوشتەکردن ڕەوا نیە مەگەر بۆ چاوی پیس و بۆ چارەسەری ژەهری جرِوجانەوەری ژەهردار و ئەوانەی کە دەگەزن و پێوەدەدەن وەك دوپشك).

٣٨٨٩ - (ضعيف) عن أنس قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ أَوْ دَمٍ يَرْقَأُ). لَمْ يَذْكُرِ الْعَبَّاسُ الْعَيْنَ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوشتەكردن رەوا نیە مەگەر بۆ چاوی پیس و بۆ چارەسەری ژەهری جڕوجانەوەری ژەهردار و خوێن بەربوون نەبێت). عەباس باسی چاوی پیسی نەكرد.

## باسی نوشتە چۆن دەبێت؟

## ١٩ - باب كَيْفَ الرُّقَى.

٣٨٩٠ - عن عبد العزيز بن صهيب قال: قال أنس بن مالك - يعني لثابت -: أَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ؟ قَالَ بَلَى. قَالَ: فَقَالَ: (اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ, مُذْهِبَ الْبَاسِ, اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي, لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ, اشْفِهِ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا).

واتە: لە (عبد العزیز)ی كوڕی صوهەیبەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ئەنەسی كوڕی مالك بە (ثابت)ی وت: ئایا نوشتەیەكت بۆ نەكەم وەك نوشتەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ وتی: بەڵێ، ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك، ئەی لابەری ئێش و ئازار، شیفای بدە تۆ شیفابەخشی، جگە لەتۆ شیفابەخشی تر نیە، شیفایەكی وەها هیچ دەردو نەخۆشیە بەجێ نەهێڵێت).

٣٨٩١ - (صحيح) عن عثمان بن أبو العاص: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, - قَالَ عُثْمَانُ: وَبِي وَجَعٌ قَدْ كَادَ يُهْلِكُنِي - قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (امْسَحْهُ بِيَمِينِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ, وَقُلْ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ). قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ, فَأَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مَا كَانَ بِي, فَلَمْ أَزَلْ آمُرُ بِهِ أَهْلِي وَغَيْرَهُمْ.

واتە: لە (عثمان)ی کوڕی ئەبو عاصەوە دەگێڕنەوە، کە هاتوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، (عثمان) وتی: ئازارێکی زۆرم هەبوو نزیك بوو لەناوم بەرێت وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەدەستی راستت حەوت جار دەست بێنە بە شوێنی ئازارەکەتداو بڵێ: (أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ). واتە: پەنادەگرم بە خواو بە توانایی ئەو لەزیانی ئەو ئازارەی کە هەستی پێ دەکەم و مەترسیم لێی هەیە).

٣٨٩٢ - (ضعيف) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنِ اشْتَكَى مِنْكُمْ شَيْئًا أَوِ اشْتَكَاهُ أَخٌ لَهُ فَلْيَقُلْ: رَبُّنَا اللَّهُ الَّذِى فِي السَّمَاءِ, تَقَدَّسَ اسْمُكَ, أَمْرُكَ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ, كَمَا رَحْمَتُكَ فِي السَّمَاءِ, فَاجْعَلْ رَحْمَتَكَ فِي الأَرْضِ, اغْفِرْ لَنَا حُوبَنَا وَخَطَايَانَا, أَنْتَ رَبُّ الطَّيِّبِينَ, أَنْزِلْ رَحْمَةً مِنْ رَحْمَتِكَ, وَشِفَاءً مِنْ شِفَائِكَ عَلَى هَذَا الْوَجَعِ, فَيَبْرَأُ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەئێوە سکاڵای کرد لەدەست ئێش و ئازارێك یان برایەکی سکاڵای کرد با ئەم دوعایە بکات بۆ خۆی یان بۆ براکەی بڵێت: پەروەردگارمان (الله)یە کە لە ئاسمانی سەرو بەرز و بڵندایە، ناوت بەرزو بڵند و پیرۆز راگیراوە دورە لە هەموو نەنگیەك،، فەرمانت پەیڕەوکراوە لە ئاسمان و لە زەوی داو بەردەوام پەیڕەو دەکرێت، وەك چۆن سۆزو بەزەییت تەواو گشتگیرە لە ئاسماندا، بەو شێوەیەش سۆزو بەزەییت هەبێ بەرامبەر بەوانەی کە لە زەویدان، لە خۆمان و لە تاوانە گەورەکانمان و هەڵەکانمان خۆشبە، تۆ پەروەردگاری پاکانی، سۆزو بەزەییە لە سۆزو بەزەییەکانت، یان شیفایە لە شیفاکانت دابەزێنە بەسەر ئەم ئێش و ئازارەدا، ئیتر بەویستی خوای گەورە چاك دەبێتەوە).

٣٨٩٣ - (حسن دون قوله: وكان عبد الله ...) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الْفَزَعِ كَلِمَاتٍ: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ

يَحْضُرُونِ). وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو يُعَلِّمُهُنَّ مَنْ عَقَلَ مِنْ بَنِيهِ وَمَنْ لَمْ يَعْقِلْ كَتَبَهُ فَأَعْلَقَهُ عَلَيْهِ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوەكیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم وشانەی فێری هاوەڵانی دەكرد لەكاتی ترسدا بیخوێنن: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ). واتە: پەنادەگرم بە وشە تەواوەكانی خوای گەورە لە خەشمی و،،لە خراپەی بەندەكانی و، لە شێتی شەیتانان و لەوكاتەی كە لەژیاندا دێنەلام بۆ گومڕاكردنم یان كاتی كە لە سەرەمەرگدام دێنە لام. (عبدالله)ی كوڕی عومەر رەزای خوایان لیٚ بیٚ عادەتی وەها بوو ئەم دوعایەی فێری ئەو منداڵانەی دەكرد كە فامیان كربۆوە، بۆ ئەوانەشیان كە فامیان نەكردبۆوە دەینوسی و دەیكردە ملیان.

٣٨٩٤ - (صحيح) عن يزيد بن أبو عبيد قال: رَأَيْتُ أَثَرَ ضَرْبَةٍ فِي سَاقِ سَلَمَةَ, فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ؟ قَالَ: أَصَابَتْنِي يَوْمَ خَيْبَرَ, فَقَالَ النَّاسُ: أُصِيبَ سَلَمَةُ فَأُتِيَ بِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَفَثَ فِيَّ ثَلَاثَ نَفَثَاتٍ, فَمَا اشْتَكَيْتُهَا حَتَّى السَّاعَةِ.

واتە: لە یەزیدی كوڕی ئەبو عوبەیدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: شوێنی برینەكەی قاچی سەلەمەم دی، وتم: ئەوە چی یە؟ وتی: ئەوە رۆژی خەیبەر پێكرام، خەڵك وتیان: سەلەمە بریندار بوو، بردمیان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سیٚ جار فوی پێدا كردم ئیتر بۆ ساتێكیش ئازارم نەما.

٣٨٩٥ - (صحيح) عن عائشة قالت كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لِلْإِنْسَانِ إِذَا اشْتَكَى - يَقُولُ بِرِيقِهِ, ثُمَّ قَالَ بِهِ فِي التُّرَابِ - : (تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا, يُشْفَى سَقِيمُنَا, بِإِذْنِ رَبِّنَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر کەسێ ئێش و ئازارێکی ببوایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنجەی شایەتومانی بە تفی خۆی تەڕ دەکردو دەینایە سەر خاك و پەنجەی خۆڵی پێوە دەلکاو هەڵی دەگرتەوەو دەینایە سەر شوێنی ئازارەکەو دەیفەرموو: (تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا, يُشْفَى سَقِيمُنَا, بِإِذْنِ رَبِّنَا). واتە: بەناوی خوای گەورە دوعات بۆ دەکەم، ئەمە خاکی زەوی خۆمانە لەگەڵ تەڕایی دەمی موسوڵمانێ لەخۆمان، بە ئیزنی خوای گەورە دەبێت بە شیفا بۆ نەخۆشمان.

٣٨٩٦ - (صحيح) عن خارجة بن الصلت عن عمه: أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمَ, ثُمَّ أَقْبَلَ رَاجِعًا مِنْ عِنْدِهِ, فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ عِنْدَهُمْ رَجُلٌ مَجْنُونٌ مُوثَقٌ بِالْحَدِيدِ, فَقَالَ أَهْلُهُ: إِنَّا حُدِّثْنَا أَنَّ صَاحِبَكُمْ هَذَا قَدْ جَاءَ بِخَيْرٍ, فَهَلْ عِنْدَكَ شَيْءٌ تُدَاوِيهِ؟ فَرَقَيْتُهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ, فَبَرَأَ, فَأَعْطُونِي مِائَةَ شَاةٍ, فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ, فَقَالَ: (هَلْ إِلاَّ هَذَا). وَقَالَ مُسَدَّدٌ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ: (هَلْ قُلْتَ غَيْرَ هَذَا). قُلْتُ لاَ. قَالَ: (خُذْهَا, فَلَعَمْرِي لَمَنْ أَكَلَ بِرُقْيَةِ بَاطِلٍ لَقَدْ أَكَلْتَ بِرُقْيَةِ حَقٍّ).

واتە: لە خاریجەی کوڕی سەڵتی تەمیمیەوە، لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موسوڵمان بوو، لەپاشدا لەلای گەڕایەوە دای بەلای هۆزێکدا پیاوێکی شێتیان کۆت وزنجیر کردبوو، خزمەکانی وتیان: هەواڵمان زانیوە کە لەلای ئەو پیاوەوە واتە لەلای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بە خێر و خۆشی و بەرەکەتەوە هاتویتەتەوە، ئایا شتێکت پێ نیە چارەسەری ئەو شێتەی پێ بکەیت؟ منیش سورەتی فاتیحەم بەسەردا خوێند، بە ویستی خوای گەورە چاك بویەوە، جا سەد مەڕیان دامێ، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (ئایا جگە لەمەت بەسەردا خوێند؟)، لە شوێنێکی تردا موسەددەد وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا جگە لە سورەتی فاتیحە هیچ شتێکی ترت بەسەردا خوێند؟). وتم: نەخێر، فەرمووی: (مەڕەکان ببە بۆ

خۆت، بێگومان ئەگەر خەڵك سەرقەڵەمانەی دوعاو نوشتەی پڕوپوچ بخۆن، تۆ سەرقەڵەمانەی دوعاو نوشتەیەکی راست و دروست دەخۆی).

٣٨٩٧ - (صحيح) عن خارجة بن الصلت, عن عمه: أَنَّهُ مَرَّ, قَالَ: فَرَقَاهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً كُلَّمَا خَتَمَهَا جَمَعَ بُزَاقَهُ ثُمَّ تَفَلَ, فَكَأَنَّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ, فَأَعْطَوْهُ شَيْئًا, فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, ثُمَّ ذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ مُسَدَّدٍ.

واته: لە خاریجەی کوڕی سەڵتەوە، لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە دای بەلای هۆزێکدا پیاوێکی شێتیان کۆت وزنجیر کردبوو، وتی: سێ ڕۆژ بەیانیان و ئێواران سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند، کاتێ کە سورەتەکەی تەواو دەکرد تفی خۆی کۆدەکردە، لەپاشدا لێی دەدا، ئیتر شێتەکە وەك وشترێکی بەسراوە بە پەتێ پەتەکەی بکرێتەوەو بەربێ ئاوەها دەست و پێی کرایەوەو رزگاری بوو، شتێکیان دایە، بردی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا راوی وەك فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی پێشووی موسەددەد.

٣٨٩٨ - (صحيح) سهيل بن أبو صالح عن أبيه قال سمعت رجلا من أسلم قال: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ, فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لُدِغْتُ اللَّيْلَةَ فَلَمْ أَنَمْ حَتَّى أَصْبَحْتُ! قَالَ: (مَاذَا؟). قَالَ: عَقْرَبٌ. قَالَ: (أَمَا إِنَّكَ لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ: لَمْ تَضُرَّكَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ).

واته: لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵحەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پیاوێکی هۆزی ئەسلەم بوو وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبووم، یەکێ لە هاوەڵانی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمشەو شتێ پێوەی دام لەتاو ئازار هەتا بەیانی

نەخەوتوم، فەرمووی: (چی پێوی دای؟)، وتی: دوپشك، فەرمووی: (ئەگەر ئێوارە ئەم دوعایەت بخوێندایە: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ). واتە: پەنادەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە لە خراپەو زیانی ئەوەی کە خوا خۆی دروستیکردوە. ئەگەر ئەو دەعایەت بخوێندایە ئیتر زیانی نەدەبوو بۆت مەگەر خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بوایە.

٣٨٩٩ - (ضعيف الإسناد) عن أبو هريرة قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَدِيغٍ لَدَغَتْهُ عَقْرَبٌ, قَالَ: فَقَالَ: (لَوْ قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ: لَمْ يُلْدَغْ). أَوْ (لَمْ تَضُرَّهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کابرایەکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوپشك پێوی دابوو، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر ئەم دوعایەی بخوێندایە: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ): (ئەوا پێوەی نەدەدا) یان (زیانی پێ نەدەگەیاند).

٣٩٠٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْطَلَقُوا فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا, فَنَزَلُوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ, فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ شَيْءٌ يَنْفَعُ صَاحِبَنَا؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: نَعَمْ وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْقِي وَلَكِنِ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَأَبَيْتُمْ أَنْ تُضَيِّفُونَا, مَا أَنَا بِرَاقٍ حَتَّى تَجْعَلُوا لِي جُعْلاً, فَجَعَلُوا لَهُ قَطِيعًا مِنَ الشَّاءِ, فَأَتَاهُ فَقَرَأَ عَلَيْهِ أُمَّ الْكِتَابِ, وَيَتْفُلُ حَتَّى بَرَأَ كَأَنَّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ, قَالَ: فَأَوْفَاهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالُوا: اقْتَسِمُوا, فَقَالَ الَّذِي رَقَى: لاَ تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَسْتَأْمِرَهُ, فَغَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرُوا لَهُ, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مِنْ أَيْنَ عَلِمْتُمْ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟! أَحْسَنْتُمُ اقْتَسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچون بۆ سەفەرێ لە سەفەرەکەیاندا، لەلای هۆزێ لە هۆزەکانی عەرەب دابەزین میوانداریان نەکردن، دوپشکێ دای بە سەرۆك هۆزەکەیانەوە، هەندێکیان دێن بۆ لایان و دەڵێن: سەرۆك هۆزەکەمان دوو پشك پێوەی داوە ئایا لەلای کەسێ لەئێوە چارەیە نیە بۆ سەرۆك هۆزەکەمان؟ یەکێکیان وتی: بەڵێ سوێند بە (الله) من دوعای گەزەندە دەکەم، بەڵام چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لێ کردن و ئێوە میوانداریتان نەکردین هەتا سەرقەڵەمانەمان بۆ دانەنێن پاداشتمان نەدەنەوە لەسەری، ئینجا لەسەر جەڵەبێ مەڕ رێکدەکەون، دەیبەن بۆلای سەرۆك هۆزەکەیان سورەتی فاتیحەی بەسەردا دەخوێنێت، کاتێ کە سورەتەکەی تەواو کرد تفی خۆی لێ دا، ئیتر وەك وشترێکی بەسراوە بە پەتێ پەتەکەی بکرێتەوەو بەربێت ئاوەها دەست و پێی کرایەوەو رزگاری بوو، وتی: خاوەنی وەفا بوون و بەڵێنی خۆیان بردەسەر ئەوەی کە رێکەوتبون لەسەری دایان پێیان، وتیان: ئادەی دابەشی بکەن، ئەوەی کە دوعاکەی بەسەردا خوێند وتی: نا ئەو کارە مەکەن هەتا دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و پرسی پێ دەکەن، بۆ بەیانی چونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چۆنتان زانی سورەتی فاتیحە دوعایە بۆ چارەسەری؟! کارێکی چاکتان کرد، دابەشی بکەن پشکێکیشی دابنێن بۆ من).

٣٩٠١ - (صحيح) عن خارجة بن الصلت التميمي, عن عمه قال: قَالَ أَقْبَلْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَتَيْنَا عَلَى حَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ, فَقَالُوا: إِنَّا أُنبِئْنَا أَنَّكُمْ جِئْتُمْ مِنْ عِنْدِ هَذَا الرَّجُلِ بِخَيْرٍ, فَهَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ دَوَاءٍ أَوْ رُقْيَةٍ فَإِنَّ عِنْدَنَا مَعْتُوهًا فِي الْقُيُودِ؟ قَالَ فَقُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: فَجَاءُوا بِمَعْتُوهٍ فِي الْقُيُودِ, قَالَ: فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً, كُلَّمَا خَتَمْتُهَا أَجْمَعُ بُزَاقِي ثُمَّ أَتْفُلُ, فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ, قَالَ: فَأَعْطَوْنِي جُعْلاً, فَقُلْتُ لاَ حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ (كُلْ فَلَعَمْرِي مَنْ أَكَلَ بِرُقْيَةِ بَاطِلٍ, لَقَدْ أَكَلْتَ بِرُقْيَةِ حَقٍّ).

واتە: لە خاریجەی کوڕی سەڵتی تەمیمیەوە، لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووین، کاتێ کە گەڕاینەوە لەلای هۆزێکی عەرەب لاماندا، وتیان: هەواڵمان زانیوە کە لەلای ئەو پیاوەوە بە خێر و خۆشی و بەرەکەتەوە هاتونەتەوە، ئایا دوعایە نوشتەیە چارەیەکتان لەلا نیە بۆ شێتێکی کۆت و زنجیر کراو؟ وتی: سێ ڕۆژ بەیانیان و ئێواران سورەتی فاتیحەم بەسەردا خوێند، کاتێ کە سورەتەکەم تەواو دەکرد تفی خۆمم لێ دەدا، ئیتر شێتەکە وەك وشترێکی بەسراوە بە پەتێ پەتەکەی بکرێتەوەو بەربێ ئاوەها دەست و پێی کرایەوەو رزگاری بوو، سەرقەڵەمانەکەیان دامێ، وتم: نەخێر نایخۆم هەتا پرسیار نەکەم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیخۆ، بێگومان ئەگەر خەڵك سەرقەڵەمانەی دوعاو نوشتەی پڕوپوچ بخۆن، تۆ سەرقەڵەمانەی دوعاو نوشتەیەکی راست و دروست دەخۆی).

٣٩٠٢ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ فِي نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ, فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ عَلَيْهِ بِيَدِهِ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا.

واتە: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێش و ئازارێکی ببوایە سورەتی: (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس)ی بەسەر خۆیدا دەخوێند فووی دەکرد بەسەر خۆیدا، کاتێ کە نەخۆشی زۆری بۆ هێنا من ئەو دوو سورەتەم بەسەردا خوێند، دەستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خۆیم هەڵدەگرت و دەمهێنا بە جەستەیدا بە هیوای فەڕو بەرەکەت.

## باسی سەبارەت بە قەڵەوی.

## ٢٠ - باب فِي السُّمْنَةِ.

٣٩٠٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أَرَادَتْ أُمِّي أَنْ تُسَمِّنَنِي لِدُخُولِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَلَمْ أَقْبَلْ عَلَيْهَا بِشَيْءٍ مِمَّا تُرِيدُ, حَتَّى أَطْعَمَتْنِي الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ, فَسَمِنْتُ عَلَيْهِ كَأَحْسَنِ السِّمَنِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دایکم دەیویست قەڵەوم بکات تا بە بوکی بمبەن بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەڵام هیچ سودی نەبوو بۆم و قەڵەو نەبووم ئەوەی ئەو دەیویست نەهاتەدی، هەتا ترۆزی و خورمای تازەی دەرخوارد دام ئیتر زۆر باش پێی قەڵەوە بووم.

## باسی سەبارەت بە (کاهین) کوڵەنانی.

## ٢١ - باب فِي الْكَاهِنِ.

٣٩٠٤ - (صحيح) عن أبو هريرة : أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَتَى كَاهِنًا). قَالَ مُوسَى فِي حَدِيثِهِ: (فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ). ثُمَّ اتَّفَقَا, (أَوْ أَتَى امْرَأَةً). قَالَ مُسَدَّدٌ: (امْرَأَتَهُ حَائِضًا, أَوْ أَتَى امْرَأَةً). قَالَ مُسَدَّدٌ: (امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا فَقَدْ بَرِئَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بچێت بۆلای (کاهین)کوڵەنانی). موسا لە فەرموودەکەیدا وتی: (باوەڕ بە قسەکانی بکات)، ئینجا هەردوو راوی رێکن: (یان بچێتە لای ژنەکەی)، موسەددەد وتی: (کاتێ کە لە (حیض)بێ نوێژیدا بێ)، موسەددەد وتی: (یان بە پاش بچێتە لای ژنی خۆی ئەوە فڕی بەسەر

ئەوەوە نیە کە خوای گەورە دایبەزاندوە بۆ موحەممەد). واتە: فڕی بە دینی ئیسلامەوە نامێنێ.

## باسی سەبارەت بە ئەستێرەشوناسی.

## ٢٢ - باب فِي النُّجُومِ.

٣٩٠٥ - (حسن) عن ابن عباس رضي الله عنهما أنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم: (مَنِ اقْتَبَسَ عِلْمًا مِنَ النُّجُومِ اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ زَادَ مَا زَادَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بابەتێ لە ئەستێرەشوناسی فێربێ ئەوە بابەتێ لە جادوگەری فێردەبێ، ئیتر چەند بابەت لە ئەستێرەشوناسی فێربێ ئەوەندە بابەت جادوگەری فێربووە، زۆربێ زۆر کەم بێ کەم).

٣٩٠٦ - (صحيح) عن زيد بن خالد الجهني قال: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ (قَالَ أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ وَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حودەیبیە بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردین، لە ناکامی ئەو بارانەی کە شەو باری بوو، کاتێ کە سەلامی دایەوە ڕووی کردە

خەڵکەکەو فەرمووی: (ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی دەفەرمووێت)، وتیان: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەزانن، وتی: (فەرمووی: ئەم بەیانیە بەهۆی ئەم باران بارینەوە بەندەکانم بوون بە دوو دەستەوە دەستەیەکیان باوەڕیان بە من هەبوو، دەستەیەکیشیان باوەڕیان بە من نەبوو، ئەو کەسەی بڵێ لەسایەی فەزڵ رەحمەتی خواوە بارانمان بۆ باریوە ئەوە باوەڕی بە من هەیەو، باوەڕی بە بە بورج و ئەستێران نیە، بەڵام ئەوکەسەی بڵێ: لە فلانە بورجا بارانمان بۆ باریوە ئەوە باوەڕی بە من نیە، بەڵکو باوەڕی بە بورج و ئەستێران هەیە).

## باسی سەبارەت بە هێڵ کێشان و شومی باڵندە.

## ٢٣ - باب فِي الْخَطِّ وَزَجْرِ الطَّيْرِ.

٣٩٠٧ - (ضعيف) عن قبيصة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (الْعِيَافَةُ وَالطِّيَرَةُ وَالطَّرْقُ مِنَ الْجِبْتِ)[١].

واتە: قەبیصە دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (بەختگرتنەوە و نوقلانەلێدان و رەملگرتنەوە لە بت پەرستین).

٣٩٠٨ - (صحيح مقطوع) عن عوف قال: الْعِيَافَةُ: زَجْرُ الطَّيْرِ, وَالطَّرْقُ: الْخَطُّ يُخَطُّ فِي الأَرْضِ.

واتە: لە عەوفەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (الْعِيَافَة): گەشبینی و شومی باڵندە بە ناوەکانیان و دەنگەکانیان و رێرەوی فڕین و رۆشتنیان بۆ نمونە لە کوردەواریدا وا باوە بایەقوش شومە، (وَالطَّرْقُ): هێڵێکە لەزەوی دا دەکێشرێت بۆ گەیشتن بە زانینی کاروبارە (غەیبیەکان)نهێنی و شاراوەکان.

(١) (الطَّرْقُ): کەسێ بیویستایە سەفەرێ بکات ئەگەر باڵندە بەلای راستدا بفڕیایە ئەوە نیشانەی گەشبینی بوو دەچوو بۆ سەفەرەکەی, بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیایە ئەوە نیشانەی رەشبینی و شوم بوو نەدەچوو بۆ سەفەرەکەی. (الْعِيَافَة) واتە: بەختگرتنەوە.

٣٩٠٩ - (صحيح) عن معاوية بن الحكم السلمي قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمِنَّا رِجَالٌ يَخُطُّونَ؟ قَالَ: (كَانَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ يَخُطُّ فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ فَذَاكَ).

واتە: لە موعاويەى كوڕى حەكەمى سولەمىيەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: وتم: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لەناو ئێمەدا پياوانێ هەيە بە ڕەمڵ دانە دەگرنەوە؟ فەرمووى: (پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەكانيش بە ڕەمڵ دانەى دەگرتەوە، جا ئەوەى دانەگرتنەوەكەى ڕێكى ئەو دانەگرتنەوە بێ، كە ئەو پێغەمبەرە دەيكرد ئەوە دروستە، ئەگينا دروست نى يە).

## باسى سەبارەت بە نوقلآنە لێدان.

## ٢٤ - باب فِي الطِّيَرَةِ.

٣٩١٠ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال (الطِّيَرَةُ شِرْكٌ, الطِّيَرَةُ شِرْكٌ). ثَلَاثًا - وَمَا مِنَّا إِلاَّ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ -.

واتە: لە (عبد الله)ى كوڕى مەسعودەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (نوقلآنەلێدان شيركە، نوقلآنەلێدان شيركە) سێ جار - (عبد الله)ى كوڕى مەسعود وتى: هەمووومان نوقلآنە لێدەدەين لەدڵدا بەڵام خواى پەروەردگار ئەو ئەنديشەو خەيالآنە ناهێڵێ لەدڵدا بەهۆى پشت بەستن بە خواى گەورەوە -.

٣٩١١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ). فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا بَالُ الإِبِلِ تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيُخَالِطُهَا الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيُجْرِبُهَا؟ قَالَ: (فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ). قَالَ مَعْمَرٌ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَحَدَّثَنِي رَجُلٌ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (لاَ يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ). قَالَ فَرَاجَعَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ حَدَّثْتَنَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ عَدْوَى وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ؟). قَالَ: لَمْ أُحَدِّثْكُمُوهُ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَدْ حَدَّثَ بِهِ وَمَا سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ نَسِيَ حَدِيثًا قَطُّ غَيْرَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە نەخۆشی تەنینەوەی هەیە، نە نوقڵانەلێدان هەیە، نە مانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی سەفەر، نە (هَامَة) هەیە). - (هَامَة) ناوی باڵندەیەکە بەدبین بوون بەرامبەری - . عەرەبێکی دەشتەکی وتی: جاری وا دەبێ وشترەکان لەناو لمی ئەو دەشتەدان ئەوەندە گورج و گۆڵن دەڵێی ڕەوە ئاسکن، کەچی کە وشترێکی گەڕیان تێکەڵاودەبێ هەموویان گەڕ دەکات؟ فەرمووی: (ئەی کێ یەکەم وشتری توش کرد). مەعمەر وتی: زوهری وتی: پیاوێ لە ئەبو هورەیرەوە بۆی گێڕامەوە، کە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستوە فەرموویەتی: (با نەخۆش نەبرێتە لای ئەوانەی کە لەش ساغن). زوهری وتی: پیاوەکە فەرموودەکەی رونکردەوە وتی: ئەی تۆ ئەم فەرموودەت بۆ نەگێڕاینەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە تەنینەوەی نەخۆشی هەیە، نە مانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی سەفەر، نە (هَامَة) هەیە). وتی: نەخێر بۆم نەگێڕاونەتەوە. زوهری وتی: ئەبو سەلەمە وتی: ئەبو هورەیرە ئەو فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە، هەرگیز نەمبیستوە ئەبو هورەیرە هیچ فەرمودەیەکی لە یاد چوو بێ جگە لەم فەرموودە نەبێ ئەوەندە لەبەرکردنی بە هێز بووە.

٣٩١٢ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ عَدْوَى, وَلاَ هَامَةَ, وَلاَ نَوْءَ, وَلاَ صَفَرَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە نەخۆشی تەنینەوەی هەیە، (هَامَة)یش درۆیەو، نە هیچ بەدەست ئەستێرەو بورج هەیە، نە مانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی سەفەر).

٣٩١٣ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ غُولَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نە حۆلی بیابان بوونی هەیە). - (غول) لە جنسی جنۆكەو شەیتانەكانە عەربەكان پێیان وابوو (غول) لە چۆڵەوانی دا خەڵك دەبینێ و خۆی رەنگ دەكات بە وێنەی جۆراو جۆر لەرێگە لایان دەدات و لەناویان دەبات، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێگری لەو كارە كردوو بەدرۆی خستەوەو پوچەڵی كردەوە - .

٣٩١٤ - (صحيح مقطوع) قال أبو داود: قُرِئَ عَلَى الْحَارِثِ بْنِ مِسْكِينٍ وَأَنَا شَاهِدٌ: أَخْبَرَكُمْ أَشْهَبُ قَالَ: سُئِلَ مَالِكٌ عَنْ قَوْلِهِ: (لاَ صَفَرَ). قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يُحِلُّونَ صَفَرَ يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا, فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ صَفَرَ).

واتە: ئەبو داود دەڵێت: خوێنرایەوە بۆ (حارث)ی كوڕی میسكین من شایەتم: ئەشهەب وتی: دەربارەی (لاَ صَفَرَ). لە پێشەوا مالیكیان پرسی، ئەویش وتی: خەڵكانی سەردەمی نەفامی ساڵێ مانگی سەفەریان حەلاڵ دەكردو ساڵێكیش حەرامیان دەكرد - بۆ ئەوەی رێك بكەوێ لەگەڵ ئەو چوار مانگەی كە خوای گەورە جەنگی تێیاندا حەرام كردووە -، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لاَ صَفَرَ) واتە: نە مانگی موحەرڕەم دەبێ بە مانگی سەفەر.

٣٩١٥ - (صحيح) عن أنس, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ عَدْوَى, وَلاَ طِيَرَةَ, وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ الصَّالِحُ, وَالْفَأْلُ الصَّالِحُ: الْكَلِمَةُ الْحَسَنَةُ).

واتە: (نە تەنینەوەی نەخۆشی بەبێ رەزامەندی خوای گەورە هەیە، نە نوقڵانەی خراپ شومی هەیە، (الْفَأْلُ الصَّالِح)م پێ خۆشە، (الْفَأْلُ الصَّالِح)یش وشەیەكی باشە.

٣٩١٦ - (صحيح مقطوع) عن بقية قال: قلت لمحمد - يعني ابن راشد -: قوله (هَامَ)؟ قَالَ كَانَتِ الْجَاهِلِيَّةُ تَقُولُ لَيْسَ أَحَدٌ يَمُوتُ فَيُدْفَنُ إِلاَّ خَرَجَ مِنْ قَبْرِهِ هَامَةٌ. قُلْتُ: فَقَوْلُهُ (صَفَرَ). قَالَ سَمِعْتنا أَنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ يَسْتَشْئِمُونَ بِصَفَرَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ صَفَرَ). قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَدْ سَمِعْنَا مَنْ يَقُولُ هُوَ وَجَعٌ يَأْخُذُ فِي الْبَطْنِ, فَكَانُوا يَقُولُونَ: هُوَ يُعْدِى, فَقَالَ: (لاَ صَفَرَ).

واتە: لە بەقییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم بە موحەممەد واتە ئیبنو راشید وشەی (هام) یانی چی؟ وتی: خەڵکانی سەردەمی نەفامی دەیانوت هەر کەسێ کە دەمرێت و دەنێژرێت ئیللا لە گۆڕەکەیەوە باڵندە(هامة)یە دێتەدەرەوە. وتم: ئەی (لاَ صَفَرَ) یانی چی؟ وتی: بیستومانە خەڵکانی سەردەمی نەفامی مانگی سەفەریان بە شوم داناوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مانگی سەفەر شوم نیە)، موحەممەد وتی: بێگومان بیستومانە دەیانوت ئازارێکە لەسکدا دروست دەبێ، وتویانە: دەتەنێتەوە، فەرموی: (لاَ صَفَرَ).

٣٩١٧ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ كَلِمَةً فَأَعْجَبَتْهُ فَقَالَ: (أَخَذْنَا فَأْلَكَ مِنْ فِيكَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قسەیەکی بیست لە کەسێ بەدڵی بوو فەرمووی: (لەم قسە چاکەی خۆت نوقڵانەی باشمان بۆ لێدایت).

٣٩١٨ - (صحيح مقطوع) عن عطء قال: يَقُولُ النَّاسُ الصَّفَرُ وَجَعٌ يَأْخُذُ فِي الْبَطْنِ. قُلْتُ فَمَا الْهَامَةُ؟ قَالَ: يَقُولُ النَّاسُ: الْهَامَةُ الَّتِى تَصْرُخُ: هَامَةُ النَّاسِ, وَلَيْسَتْ بِهَامَةِ الإِنْسَانِ, إِنَّمَا هِىَ دَابَّةٌ.

واتە: لە (عطاء)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خەڵك وتویانە: (صَفَرَ) ئازارێکە

لەسكدا دروست دەبێ، وتم: ئەی (هامة) چی یە، وتی: خەڵك وتویانە: (هامة) باڵندەیەكە دەخوێنێ. (هامة) رۆحی مردو، (هامة) مرۆڤ نی یە، بەڵكو جانەوەرێكی زەوی یە.

٣٩١٩ - (ضعيف) عن عروة بن عامر – قال أحمد: القرشي - قَالَ ذُكِرَتِ الطِّيَرَةُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (أَحْسَنُهَا الْفَأْلُ, وَلاَ تَرُدُّ مُسْلِمًا, فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ لاَ يَأْتِي بِالْحَسَنَاتِ إِلاَّ أَنْتَ, وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَاتِ إِلاَّ أَنْتَ, وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ).

واتە: لە عوروەی كوڕی عامیر- ئەحمەد وتی: قورەشی - ەوە دەگێرنەوە كە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم باسی نوقلانە كرا، فەرمووی: (نوقلانەی باش چاكترینەو زۆر باشە، نوقلانەی خراپیش كاری موسوڵمان پەك ناخات، جا ئەگەر كەسێ لە ئێوە توشی شتێ بوو لەو بابەتە باش نەبوو بەلایەوە گوێی نەداتێ ئەم دوعایە بخوێنێ: (اللَّهُمَّ لاَ يَأْتِي بِالْحَسَنَاتِ إِلاَّ أَنْتَ, وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَاتِ إِلاَّ أَنْتَ, وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ)). واتە: خودایە هەر خێر و چاكەیە تۆ نەیدەی نابێت، هەر شەڕ و خراپەیە تۆ لەكۆڵی نەخەیت لەكۆڵ ناكەوێت، هێزو توانایی هەر بەدەستی تۆیە.

٣٩٢٠ - (صحيح) عن عبد الله بن بريدة, عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَتَطَيَّرُ مِنْ شَيْءٍ, وَكَانَ إِذَا بَعَثَ عَامِلاً سَأَلَ عَنِ اسْمِها: فَإِذَا أَعْجَبَهُ اسْمُها فَرِحَ بِها, وَرُئِيَ بِشْرُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ, وَإِنْ كَرِهَ اسْمَهُ رُئِيَ كَرَاهِيَةُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ, وَإِذَا دَخَلَ قَرْيَةً سَأَلَ عَنِ اسْمِهَا فَإِنْ أَعْجَبَهُ اسْمُهَا فَرِحَ بِهَا وَرُئِيَ بِشْرُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ, وَإِنْ كَرِهَ اسْمَهَا رُئِيَ كَرَاهِيَةُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی بورەیدەوە، لەباوكیەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هۆی هیچ شتێكەوە نوقلانەی خراپی لێ نەدەدا، كاتێ

کە سەرکارێکی ڕەوانە بکردایە بۆ شوێنێ لەناوەکەی دەپرسی، ئەگەر ناوەکەی بەدڵ بوایە خۆشحاڵ دەبوو ڕووی گەش دەبووەوەو بە ناوچاویەوە دەردەکەوت، بەڵام ئەگەر ناوەکەی بەدڵ نەبوایە پێی ناخۆش دەبوو پێ ناخۆش بوونەکەشی بە ڕوویەوە دیار بوو، هەروەها ئەگەر بچوایەتە ناو لادێیەکەوە لەناوەکەی دەپرسی ئەگەر ناوەکەی بەدڵ بوایە خۆشحاڵ دەبوو ڕووی گەش دەبووەوەو بە ناوچاویەوە دەردەکەوت، بەڵام ئەگەر ناوەکەی بەدڵ نەبوایە پێی ناخۆش دەبوو پێ ناخۆش بوونەکەشی بە ڕوویەوە دیار بوو.

٣٩٢١ - (صحيح) عن سعد بن مالك, أن رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم قال: (لاَ هَامَةَ, وَلاَ عَدْوَى, وَلاَ طِيَرَةَ, وَإِنْ تَكُنِ الطِّيَرَةُ فِي شَيْءٍ فَفِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ).

واتە: لە سەعدی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە (هامة) هەیە، نە نەخۆشی تەنینەوەی هەیە، نە نوقڵانەی خراپ بایەخی هەیە، شومی ئەگەر هەبێ لەم سێ شتەدایە: ئەسپ و ماین، ژن، خانوو)[1].

٣٩٢٢ - (شاذ) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما, أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الشُّؤْمُ فِي الدَّارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْفَرَسِ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شومی لەم سێ شتەدایە: ئەسپ و ماین، ژن، خانوو).

(١) ژن: واتە ژنی خراپ و دەم درێژ, خانوو: واتە خانووی تەنگەلان و بچوك.

(صحيح مقطوع) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قُرِئَ عَلَى الْحَارِثِ بْنِ مِسْكِينٍ, وَأَنَا شَاهِدٌ, قيل له: أَخْبَرَكَ ابْنُ الْقَاسِمِ, قَالَ: سُئِلَ مَالِكٌ عَنِ الشُّؤْمِ فِي الْفَرَسِ وَالدَّارِ؟ قَالَ: كَمْ مِنْ دَارٍ سَكَنَهَا نَاسٌ فَهَلَكُوا, ثُمَّ سَكَنَهَا آخَرُونَ فَهَلَكُوا, فَهَذَا تَفْسِيرُهُ فِيمَا نَرَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

ئەبو داود دەڵێت: من شایەتم خوێنرایەوە بۆ (حارث)ی کوڕی میسکین، پێی وترا: ئیبنو قاسم پێی ڕاگەیاندوییت، وتی: دەربارەی شومی ئەسپ و خانوو پرسیارکرا لە مالیك؟ وتی: چەن خانوو خەڵك تێیدا نیشتەجێ بوون لەناوچون، لەپاشدا خەڵکانی تر هاتن تێیدا نیشتەجێ بوون ئەوانیش لەناوچون، پێم وایە ئەمە تەفسیرەکەیەتی خوای گەورە بۆ خۆی دەیزانێ.

(ضعيف موقوف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ عُمَرُ رضى الله عنه: حَصِيرٌ فِي الْبَيْتِ خَيْرٌ مِنَ امْرَأَةٍ لاَ تَلِدُ.

ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی: حەسیرێ لەناو ماڵدا بێت باشترە لە ژنێ سك و زا نەکات و منداڵی نەبێت.

٣٩٢٣ - (ضعيف الإسناد) عن فروة بن مسيك قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَرْضٌ عِنْدَنَا يُقَالُ لَهَا أَرْضُ أَبْيَنَ, هِيَ أَرْضُ رِيفِنَا وَمِيرَتِنَا, وَإِنَّهَا وَبِئَةٌ - أَوْ قَالَ: وَبَاؤُهَا شَدِيدٌ - فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (دَعْهَا عَنْكَ فَإِنَّ مِنَ الْقَرَفِ التَّلَفَ).

واتە: لە فەروەی کوڕی موسەیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، زەویەکمان هەیە بە زەوی ئەبیەن ناسراوە، زەوی گوندەکەمانەو زەوییەکی بە پیت و بەرەکەتە سەرچاوەی قوتی ڕۆژانەمانە، بەڵام نەخۆش (وباء)ی زۆرە — واتە ئەو نەخۆشیانەی کە بڵاودەبنەوە وەك نەخۆشی تاعون -، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (وازی لێ بێن مەچۆ بەلایەوە چونکە وەك ئەو جێگایە وایە کە نەخۆشی تاعونی تێدایە بۆیە نابێ بچیتە ناوی ئەگەر بچیتە ناویەوە لەناو دەچیت)[1].

(١) لە فەرمودەی (صەحیح)دا هاتوە دەفەرموێت: ئەگەر شوێنێ نەخۆشی تاعونی تێدا بوو مەچنە ناوی, ئەگەر لەو شوێنەش بوون لێی دەرمەچن.

٣٩٢٤ - (حسن) عن أنس بن مالك قال: قال رجل: قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ كَثِيرٌ فِيهَا عَدَدُنَا وَكَثِيرٌ فِيهَا أَمْوَالُنَا, فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ذَرُوهَا ذَمِيمَةً).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە لە خانویەکدا بوین خۆمان زۆر بووین و ماڵ و سامانیشمان زۆر بوو، بەڵام گواستمانەوە بۆ خانویەکی تر خۆمان کەممان کردو ماڵ و سامەنەکەشمان کەم بوەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وازی لێ بێنن لێی دەرچن سەرزەنشت کراوە).

٣٩٢٥ - (ضعيف) عن جابر, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ بِيَدِ مَجْذُومٍ فَوَضَعَهَا مَعَهُ فِي الْقَصْعَةِ وَقَالَ: (كُلْ ثِقَةً بِاللَّهِ وَتَوَكُّلاً عَلَيْهِ).

واتە: لە ئەبو جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی گولێکی گرت و لەگەڵیدا دەستی کرد بە نان خواردن فەرمووی: (بخۆ بەناوی خوا، پشتئەستورم بە پارێزگاری خوداو پشت و پەنام هەر خوای گەورەیە).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی بەندە ئازادکردن

# ٣٠ - أول الكتاب العتق

## باسی سەبارەت بە ئەو بەندەیەی لەگەڵ خاوەنەکەی لەسەر ماڵێکی دیاریکراو رێك دەکەون کە بیداتێ بۆ ئەوەی خۆی ئازاد بکات، جا هەندێك لە ماڵەکەی دەداتێ، لەپاشدا توانای نامێنێ یان دەمرێت.

### ١ - باب فِي الْمُكَاتَبِ يُؤَدِّي بَعْضَ كِتَابَتِهِ فَيَعْجِزُ أَوْ يَمُوتُ.

٣٩٢٦ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الْمُكَاتَبُ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ دِرْهَمٌ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیە نامە نوسی بکات هەر بەندەیە هەتا مادەم درهەمێکی لە گەردندا مابێت بیدات بە خاوەنەکەی).

٣٩٢٧ - (حسن) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَيُّمَا عَبْدٍ كَاتَبَ عَلَى مِائَةِ أُوقِيَّةٍ, فَأَدَّاهَا إِلاَّ عَشْرَةَ أَوَاقٍ فَهُوَ عَبْدٌ, وَأَيُّمَا عَبْدٍ كَاتَبَ عَلَى مِائَةِ دِينَارٍ, فَأَدَّاهَا إِلاَّ عَشْرَةَ دَنَانِيرَ فَهُوَ عَبْدٌ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیە لەسەر سەد

ئۆقیە نامە نوسی بکات هەمووی بدات تەنیا دە ئۆقیە نەبێت هەر بەندەیە هەتا هەر سەد ئۆقیەکە بەتەواوی دەدات، هەر بەندەیە لەسەر سەد دینار نامە نوسی بکات سەرجەم پارەکە بدات تەنیا دە دیناری نەبێت هەر بەندەیە).

٣٩٢٨ - (ضعيف) عن أم سلمة قالت: قال لنا رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنْ كَانَ لإِحْدَاكُنَّ مُكَاتَبٌ فَكَانَ عِنْدَهُ مَا يُؤَدِّي فَلْتَحْتَجِبْ مِنْهُ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوەدەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموین: (هەر ئافرەتێ لە ئێوە بەندەیەکی نامە نوسی هەبوو، بەندەکە ئەوەندەی ماڵ و سامان هەبوو بیدات بۆ ئازادکردنی خۆی لە بەندەیی ئەوە با ئەو ئافرەتە خۆی داپۆشێ و بەندەکە بە نامەحرەم بزانێ).

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی نامە نوسی لەکاتێکدا کە نامە نوسیەکەی هەڵوەشایەوە.

## ٢ - باب فِي بَيْعِ الْمُكَاتَبِ إِذَا فُسِخَتِ الْكِتَابَةُ

٣٩٢٩ - (صحيح) عن عروة, أن عائشة رضي الله عنها أخبرته: أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ عَائِشَةَ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا, وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا, فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ, فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي: فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا, فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ, وَيَكُونَ لَنَا وَلاَؤُكِ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي, فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ). ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَا بَالُ أُنَاسٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟! فَلَيْسَ لَهُ, وَإِنْ شَرَطَهُ مِائَةَ مَرَّةٍ, شَرْطُ اللَّهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ).

واتە: عوروە دەڵێت: عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ پێی ڕاگەیاندم: کە بەریرە هاتووە بۆ لای بۆ ئەوەی لەسەر نامە نوسیەکەی یارمەتی بدات، هیچی لە نامە نوسیەکە نەدابوو بە خاوەنەکەی، عائیشە پێی وت: بگەڕێرەوە بۆ ناو گەورەکانت، ئەگەر پێیان خۆش بوو ئەوا من پارەی نامە نوسیەکەت بۆ دەدەم و ئازادت دەکەم بەمەرجێ وەلائەکەت بۆ من بێ و من ببم بە هەقدارت، بەریرە ئەوەی باس کرد بۆ گەورەکانی بەڵام گەورەکانی ڕازی نەبوون وتیان: ئەگەر دەیەوێت با نامە نوسیەکەت بۆ بدات بەمەرجێ وەلائەکەت بۆ ئێمە بێ، ئەو باسە گەیەنرایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە عائیشەی فەرموو: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکە، ولایە بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکات). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستایەوەو فەرمووی: (ئەوە بۆچی ئەو خەڵکانە مەرج دادەنێن لەکاتێکدا ئەو مەرجانە لە قورئانەکەی خوای پەروەردگاردا نیە، هەر کەسێ مەرجێ دابنێ ئەو مەرجە لە قورئانەکەی خوای پەروەردگاردا نەبێ پوچ و بەتاڵە، ئەگەر سەد مەرجیش بێت، چونکە مەرجی خوای پەروەردگار مەحکەم تر و هەق تر و شایەنترە).

٣٩٣٠ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: جَاءَتْ بَرِيرَةُ لِتَسْتَعِينَ فِي كِتَابَتِهَا, فَقَالَتْ: إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ, فَأَعِينِينِي. فَقَالَتْ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا عَدَّةً وَاحِدَةً وَأُعْتِقَكِ وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لِي: فَعَلْتُ. فَذَهَبَتْ إِلَى أَهْلِهَا, وَسَاقَ الْحَدِيثَ نَحْوَ الزُّهْرِيِّ, زَادَ فِي كَلَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي آخِرِهِ: (مَا بَالُ رِجَالٍ يَقُولُ أَحَدُهُمْ: أَعْتِقْ يَا فُلَانُ وَالْوَلَاءُ لِي, إِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەریرە هات بۆ ئەوەی لەسەر نامە نوسیەکەی یارمەتی بدەم، وتی: خاوەنەکانم نامە نوسیان لەگەڵ کردوم لەسەر نۆ ئۆقیە، بۆ ماوەی نۆ ساڵ هەر ساڵەو ئۆقیەیە بدەم، تۆش یارمەتیم بدە، عائیشە وتی: ئەگەر گەورەکانت پێیان خۆش بوو ئەوا من

یەکسەر پارەی نامە نوسیەکەت بۆ دەدەم و ئازادت دەکەم بەمەرجێ وەلائەکەت بۆ من بێ و من ببم بە هەقدارت، بەریرەش چو بۆ لای گەورەکانی، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی پێشوی زوهری، لە کۆتایی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەو پیاوانە چییانە بۆچی یەکێك لەوانە دەڵێ: فلانە کەس فلان بەندە ئازاد بکە بەمەرجێ ولائەکەی بۆ من بێ بێگومان ولایە بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکات).

٣٩٣١ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها قالت: وَقَعَتْ جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ فِي سَهْمِ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ - أَوِ ابْنِ عَمٍّ لَهُ - فَكَاتَبَتْ عَلَى نَفْسِهَا, وَكَانَتِ امْرَأَةً مَلاَّحَةً تَأْخُذُهَا الْعَيْنُ. قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهَا: فَجَاءَتْ تَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كِتَابَتِهَا, فَلَمَّا قَامَتْ عَلَى الْبَابِ فَرَأَيْتُهَا كَرِهْتُ مَكَانَهَا, وَعَرَفْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَيَرَى مِنْهَا مِثْلَ الَّذِى رَأَيْتُ, فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ, وَإِنَّمَا كَانَ مِنْ أَمْرِى مَا لاَ يَخْفَى عَلَيْكَ, وَإِنِّى وَقَعْتُ فِي سَهْمِ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ, وَإِنِّى كَاتَبْتُ عَلَى نَفْسِى فَجِئْتُكَ أَسْأَلُكَ فِي كِتَابَتِي, فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَهَلْ لَكِ إِلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ؟). قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (أُؤَدِّى عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَأَتَزَوَّجُكِ). قَالَتْ: قَدْ فَعَلْتُ. قَالَتْ: فَتَسَامَعَ - تَعْنِى النَّاسَ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ تَزَوَّجَ جُوَيْرِيَةَ, فَأَرْسَلُوا مَا فِي أَيْدِيهِمْ مِنَ السَّبْيِ فَأَعْتَقُوهُمْ, وَقَالُوا: أَصْهَارُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ! فَمَا رَأَيْنَا امْرَأَةً كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً عَلَى قَوْمِهَا مِنْهَا, أُعْتِقَ فِي سَبَبِهَا مِائَةُ أَهْلِ بَيْتٍ مِنْ بَنِى الْمُصْطَلِقِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حُجَّةٌ فِي أَنَّ الْوَلِيَّ هُوَ يُزَوِّجُ نَفْسَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جویەیریەی کچی (حارث)ی کوڕی (مُصْطَلِق) لە پشکی (بني مُصْطَلِق) بەر (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس کەوت - یان کوڕە مامێکی -، نامە نوسی کرد

بۆ ئازادکردنی خۆی، جویەیریە ئافرەتێکی ئەوەندە جوان و شۆخ و شەنگ بوو هەرکەس چاوی پێی بکەوتایە دەچوە دڵیەوەو حەزی دەکرد بەردەوام سەیری بکات، عائیشە وتی: جویەیریە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لەسەر نامە نوسیەکەی، کاتێ کە گەیشتە بەر دەرگا بینیم ئەوەندە جوان بوو پێم ناخۆش بوو چونکە ترسام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ببینێ ئەوەندە جوان و شۆخ و شەنگە مارەی بکات بۆ خۆی، جویەیریە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من جویەیریەی کچی (حارث) م ئەوەی بەسەرم هاتوە لای تۆ شاراوە نیە، لە پشکی (بني مُصْطَلِق) بەر (ثابت) ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس کەوتوم، نامە نوسیم کردوە بۆ ئازادکردنی خۆم بەڵام لە توانامدا نیە ئەو بڕە ماڵە بدەم، هاتوم بۆ خزمەتت یارمەتیم بدەیت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (حەز دەکەی لەوە چاکترت دەستکەوێت و سودیشی ببێ بۆت؟) وتی: کامەیە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (من پارەی نامە نوسیەکەت بۆ دەدەم و مارەشت دەکەم بۆ خۆم). جویەیریە وتی: منیش رازی بووم، عائیشە وتی: دەنگ و باس بەناو خەڵکدا بڵاوبوەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جویەیریەی مارە کردوە بۆ خۆی، خەڵکەکە بە هۆی ئەوەوە هەرچی ئافرەتی سەبایایان لەلا بوو ئازادیان کردن، هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتیان: ئەمانە لە خێڵە خەزورانی پێغەمبەری خوان صلی الله علیه وسلم، عائیشە وتی: هیچ ئافرەتێکمان نەدیوە ئەوەندە خێر و بەرەکەت بێ بۆ قەومەکەی، بە هۆی ئەوەوە سەرجەم کەسوکارەکەی لە (بني مُصْطَلِق) ئازاد کران. ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە وەلی دەتوانێ خۆی مارە بکات لە کەسێ کە خۆی بیەوێت.

## باسی سەبارەت بە ئازادکردنی بەندە بە مەرج.

### ٣ - باب فِي الْعِتْقِ عَلَى الشَّرْطِ.

٣٩٣٢ - (حسن) عن سفينة قال: كُنْتُ مَمْلُوكًا لأُمِّ سَلَمَةَ, فَقَالَتْ: أُعْتِقُكَ وَأَشْتَرِطُ عَلَيْكَ أَنْ تَخْدُمَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا عِشْتَ, فَقُلْتُ:

إِنْ لَمْ تَشْتَرِطِي عَلَيَّ مَا فَارَقْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا عِشْتُ, فَأَعْتَقَتْنِي وَاشْتَرَطَتْ عَلَيَّ.

واتە: لە سەفینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من بەندەی ئوممو سەلەمە بووم، ئوممو سەلەمە وتی: ئازادت دەکەم بەمەرجێ هەتا لە ژیانندای خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بکەیت، وتم: ئەگەر مەرجیشم لەسەر دانەنێیت هەتا ماوم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جیا نابمەوەو خزمەتی دەکەم، ئیتر ئوممو سەلەمە ئازادی کردم و مەرجی لەسەر دانام کە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بکەم.

## باسی سەبارەت بە کەسێ بەشی خۆی لە بەندەیەکی هاوبەش ئازاد بکات.

## ٤ - باب فِيمَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ مِنْ مَمْلُوكٍ.

٣٩٣٣ - (صحيح) عن أبو المليح - قال أبو داود: قال أبو الوليد: عن أبيه - أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ مِنْ غُلاَمٍ, فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ: (لَيْسَ لِلَّهِ شَرِيكٌ). زَادَ ابْنُ كَثِيرٍ فِي حَدِيثِهِ: فَأَجَازَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِتْقَهُ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە ئەبو داود وتی: ئەبو وەلید وتی: لە باوکیەوە - دەگێڕنەوە، کە پیاوێ بەشی خۆی لە غولامێکی پشکی هاوبەش ئازاد کرد، ئەو بەسەرهاتەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (خوای گەورە هاوەڵی نیە). - ئەگەر غوڵامێ پشکی دوو کەس بوو یەکێکیان بەشی خۆی ئازاد کرد، ئەو ئازادکردنە جێبەجێ دەکرێ، پێویستە لەسەر ئەو کەسە بەشەکەی تر بکڕێ و بە تەواوی ئازادی بکات -، (ابن کثیر) لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی ئازادکردنەکەی دا.

٣٩٣٤ - (صحيح) عن أبي هريرة: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ مِنْ غُلاَمٍ, فَأَجَازَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِتْقَهُ, وَغَرَّمَهُ بَقِيَّةَ ثَمَنِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ بەشی خۆی لەی غولامێکی پشکی هاوبەش ئازاد کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی ئازادکردنەکەی دا، پارەی هاوبەشەکەی بژارد واتە بە تەواوی ئازادی کرد.

٣٩٣٥ - (صحيح) عن قتادة, بإسناده: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَعْتَقَ مَمْلُوكًا بَيْنَهُ وَبَيْنَ آخَرَ فَعَلَيْهِ خَلاَصُهُ).

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پشکی خۆی لە بەندەیەکی هاوبەش لە نێوان خۆی و کەسێکی تردا ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی بە تەواوی ئازادی بکات و لە کۆیلەیی رزگاری بکات).

٣٩٣٦ - (صحيح) عن قتادة، بإسناده: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ عَتَقَ مِنْ مَالِهِ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ).

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پشکی خۆی لە بەندەیەکی هاوبەش ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی لە ماڵ و سامانی خۆی ئازادی بکات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبوو بەشی هاوبەشەکانی ئەو بەندەیە بکات).

# باسی ئەوانەی كە باسی ئەوەیان كردوە كە بەندە خۆی كەسابەت بكات لەم فەرموودەدا.

## ٥ - باب مَنْ ذَكَرَ السِّعَايَةَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ.

٣٩٣٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَعْتَقَ شَقِيصًا فِي مَمْلُوكِهِ فَعَلَيْهِ أَنْ يُعْتِقَهُ كُلَّهُ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ, وَإِلاَّ اسْتُسْعِيَ الْعَبْدُ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پشكی خۆی لە بەندەیەك ئازاد بكات، ئەوە لەسەریەتی بەتەواوی ئازادی بكات بە ماڵ و سامانی خۆی ئەگەر ماڵ و سامانی هەبوو، ئەگینا ئەو بەندەیە كەسابەتی پێ دەكرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەكات كە بیدات بە هاوبەشەكانی تر و خۆی پێ ئازاد دەكات).

٣٩٣٨ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ, أَوْ شَقِيصًا لَهُ, فِي مَمْلُوكٍ فَخَلاَصُهُ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ, فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ قُوِّمَ الْعَبْدُ قِيمَةَ عَدْلٍ, ثُمَّ اسْتُسْعِيَ لِصَاحِبِهِ فِي قِيمَتِهِ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: فِي حَدِيثِهِمَا جَمِيعًا: (فَاسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ).

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پشكی خۆی لە بەندەیەكی هاوبەش ئازاد بكات، ئەوە لەسەریەتی لە ماڵ و سامانی خۆی ئازادی بكات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبوو بەشی هاوبەشەكانی ئەو بەندەیە بكات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی نەبوو بەش بكات، ئەوا بەندەكە بە نرخی كاتی بەندەیەك دەقەبلێنرێت، لەپاشدا ئەو بەندەیە كەسابەتی پێ دەكرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەكات كە بیدات بە

هاوبەشەكانی تر و خۆی پێ ئازاد دەكات). ئەبو داود دەڵێت: لە هەموو فەرمودەكانیاندا بەم شێوەیە: (فَاسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ).

٣٩٣٩ - عن سعيد: بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ, عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ, لَمْ يَذْكُرِ السِّعَايَةَ, وَرَوَاهُ جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ وَمُوسَى بْنُ خَلَفٍ جَمِيعًا عَنْ قَتَادَةَ, بِإِسْنَادِ يَزِيدَ بْنِ زُرَيْعٍ وَمَعْنَاهُ, وَذَكَرَا فِيهِ السِّعَايَةَ.

## باسی ئەوانەی كە ریوایەتیان كردوە كە بەندە خۆی كەسابەت نەكات.

## ٦ - باب فِيمَنْ رَوَى أَنَّهُ لاَ يَسْتَسْعِي.

٣٩٤٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ أُقِيمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُم وَأُعْتِقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ, وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ).

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پشكی خۆی لە بەندەیەكی هاوبەش ئازاد بكات، ئەوا بەندەكە بە نرخی كاتی بەندەیەك دەقەبلێنرێت، هەركەسە لە هاوبەشەكان بەشی خۆیان دەدرێتێ ئیتر بەندەكە بە تەواوی ئازاد دەبێ، ئەگینا ئەوە هەر ئەو بەشەی ئازاد دەبێ كە ئازادكراوە).

٣٩٤١ - (صحيح) عن ابن بن عمر: أن النبي صلى الله عليه وسلم بمعناه, قال: وَكَانَ نَافِعٌ رُبَّمَا قَالَ: (فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ). وَرُبَّمَا لَمْ يَقُلْهُ..

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە واتە وەك فەرموودەکەی پێشوو، لەوانەیە نافع وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە هەر ئەو بەشەی ئازاد دەبێ کە ئازادکراوە). لەوانەشە نافع نەیوتبێت.

٣٩٤٢ - (صحيح الإسناد) عن ابن عمر رضي الله عنهما, عن النبي صلى الله عليه وسلم بهذا الحديث, قال أيوب: فَلاَ أَدْرِى هُوَ فِي الْحَدِيثِ عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ شَيْءٌ قَالَهُ نَافِعٌ: (وَإِلاَّ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ)؟.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، ئەم فەرموودەی پێشوو هاتوە، ئەیوب دەڵێت: جا نازانم (وَإِلاَّ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ)، فەرمایشتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم یان شتێکە نافیع خۆی وتویەتی؟.

٣٩٤٣ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا مِنْ مَمْلُوكٍ لَهُ فَعَلَيْهِ عِتْقُهُ كُلُّهُ إِنْ كَانَ لَهُ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَهُ, وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ عَتَقَ نَصِيبُهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەشی خۆی لە بەندەیەك ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی بەتەواوی ئازادی بکات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبوو بەشی ئەوە بکات، ئەگەر ئەوەندەش ماڵ و سامانی نەبوو ئەوە با پشکی خۆی ئازاد بکات).

٣٩٤٤ - (صحيح) عن ابن بن عمر, عن النبي صلى الله عليه وسلم بمعنى (حديث) ابراهيم بن موسى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بە مانای فەرموودەکەی ئیبراهیمی کوڕی موسا هاتوە واتە فەرمودەی پێشوو.

٣٩٤٥ - (صحيح) عن ابن بن عمر, عن النبي صلى الله عليه وسلم بمعنى مالك, ولم يذكروا: (وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ). انْتَهَى حَدِيثُهُ إِلَى: (وَأُعْتِقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ). عَلَى مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بە مانای فەرموودەکەی مالك هاتووە، بەڵام راوی باسی: (وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ)ی نەکرد، فەرموودەکەی لێرەدا تەواو بوو: (وَأُعْتِقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ).

٣٩٤٦ - (صحيح) عن ابن بن عمر, أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ عَتَقَ مِنْهُ مَا بَقِيَ فِي مَالِهِ إِذَا كَانَ لَهُ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەشی خۆی لە بەندەیەك ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی باقیەکەی تری ئازاد بکات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبوو بگاتە نرخی ئەو بەندە).

٣٩٤٧ - (صحيح) عن سالم, عن أبيه, يبلغ به النبي صلى الله عليه وسلم: (إِذَا كَانَ الْعَبْدُ بَيْنَ اثْنَيْنِ فَأَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ: فَإِنْ كَانَ مُوسِرًا يُقَوَّمُ عَلَيْهِ قِيمَةً لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ, ثُمَّ يُعْتَقُ).

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، فەرموودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر دوو کەس هاوبەش بوون لە بەندەیەکدا یەکێکیان بەشی خۆی ئازاد کرد، ئەگەر دەسەلاتی هەبوو با نرخی بەشەکەی تر بدات بە شەریکەکەی بە بێ زیادو کەم دوور لە زوڵم و ستەم و غەش و فرِوفێڵ، لەپاشدا ئازادی بکات).

٣٩٤٨ - (ضعيف الإسناد) عن ابن التلب, عن أبيه: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ مِنْ مَمْلُوكٍ فَلَمْ يُضَمِّنْهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَحْمَدُ: إِنَّمَا هُوَ بِالتَّاءِ - يَعْنِي التَّلِبَّ - وَكَانَ شُعْبَةُ أَلْثَغَ لَمْ يُبَيِّنِ التَّاءَ مِنَ الثَّاءِ.

واتە: لە ئیبنو تەلیبەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ بەشی خۆی لە بەندەیەکی هاوبەش ئازاد کرد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زەمانەتی نەکردو نەیگرتە ئەستۆی خۆی.

## باسی ئەوەی ببێ بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی.

## ٧ - باب فِيمَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مُحَرَّمٍ.

٣٩٤٩ - (صحيح) عن سمرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم - وقال موسى في موضع آخر: عن سمرة بن جندب فيما يحسب حماد, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم - (مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ).

واتە: لە سەمورەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم —لە شوێنێکی تردا موسا وتی: لە سەمورەی کوری جوندوبەوە هەروەك حەمماد پێی وایە، دەگێرِنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی ببێ بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی ئەو بەندەیە یەکسەر ئازاد دەبێ).

٣٩٥٠ - (ضعيف مقطوع) عن قتادة, أن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ.

واتە: لە قەتادەوە، هاتوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی: ئەوەی ببێ بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی ئەو بەندەیە یەکسەر ئازاد دەبێ.

٣٩٥١ - (صحيح مقطوع) عن الحسن قال: مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ.

واتە: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەوەی ببێ بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی ئەو بەندەیە یەکسەر ئازاد دەبێ.

٣٩٥٢ - (صحيح مقطوع) عن قتادة, عن جابر بن زيد والحسن مثله. قال أبو داود: سعيد أحفظ من حماد.

واتە: لە قەتاوە، لە جابری کوڕی زەیدو حەسەنەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان شێوە هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: سەعید لە حەمماد چاکتر فەرمووەدەی لەبەرکردوەو لەبەرکردنی بە هێز تر بووە.

## باسی سەبارەت بە ئازادکردنی ئەو کەنیزەکانەی کە منداڵیان هەیە لە کەسانی ئازاد.

## ٨ - باب فِي عِتْقِ أُمَّهَاتِ الأَوْلاَدِ.

٣٩٥٣ - (ضعيف الإسناد) عن سلامة بنت معقل امرأة من خارجة قيس عيلان قالت: قَدِمَ بِي عَمِّى فِي الْجَاهِلِيَّةِ, فَبَاعَنِى مِنَ الْحُبَابِ بْنِ عَمْرٍو, أَخِى أَبِى الْيَسَرِ بْنِ عَمْرٍو, فَوَلَدْتُ لَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحُبَابِ, ثُمَّ هَلَكَ, فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ:

الآنَ وَاللَّهِ تُبَاعِينَ فِي دَيْنِهِ! فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِنِّي امْرَأَةٌ مِنْ خَارِجَةِ قَيْسِ عَيْلَانَ, قَدِمَ بِي عَمِّي الْمَدِينَةَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ, فَبَاعَنِي مِنَ الْحُبَابِ بْنِ عَمْرٍو, أَخِي أَبِي الْيَسَرِ بْنِ عَمْرٍو, فَوَلَدْتُ لَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحُبَابِ, فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: الآنَ وَاللَّهِ تُبَاعِينَ فِي دَيْنِهِ!. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ وَلِيُّ الْحُبَابِ؟). قِيلَ: أَخُوهُ أَبُو الْيَسَرِ بْنُ عَمْرٍو, فَبَعَثَ إِلَيْهِ, فَقَالَ: (أَعْتِقُوهَا, فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِرَقِيقٍ قَدِمَ عَلَيَّ فَأْتُونِي أُعَوِّضْكُمْ مِنْهَا). قَالَتْ: فَأَعْتَقُونِي, وَقَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَقِيقٌ فَعَوَّضَهُمْ مِنِّي غُلاَمًا.

واتە: لە سەلامەی کچی مەعقیلەوە ئافرەتێك بوو لە خارجەی قەیسی عەیلان دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی نەفامی دا مامم بردمی فرۆشتمی بە حوبابی کوڕی عەمر برای ئەبو ئەلیەسری کوڕی عەمر، (عبد الرحمن)ی کوڕی حوبابم لێی بوو - بەوە بوو بە کەنیزەکی دایکی منداڵ -، جا حوباب مرد، ژنەکەی حوباب وتی: سوێند بە (الله) ئێستا دەتفرۆشین و قەرزەکانی حوبابی لێ دەدەینەوە! منیش چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من ئافرەتێکم لە خارجەی قەیسی عەیلان لەسەردەمی نەفامی دا مامم بردمی فرۆشتمی بە حوبابی کوڕی عەمر برای ئەبو ئەلیەسری کوڕی عەمر، (عبد الرحمن)ی کوڕی حوبابم لێی بوو، جا حوباب مرد، ژنەکەی حوباب وتی: سوێند بە (الله) ئێستا دەتفرۆشین قەرزەکانی حوبابی لێ دەدەینەوە! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ وەلی حوبابە؟)، وترا: براکەی ئەبو ئەلیەسری کوڕی عەمر، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوایا، ئەویش هات پێی فەرموو: (ئازادی بکە هەرکاتێ بیستت ماڵی (فيء)م بۆ هات ئەو ماڵەی کە بەبێ جەنگ دەست موسوڵمانان دەکەوێت، ئەوکاتە وەرە قەرەبوت بۆ دەکەمەوە)، سەلامە وتی: ئازادی کردم، ماڵی (فيء)هات بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش قەرەبوی بۆ کردەوە غولامێکی پێ بەخشی لە جیاتی من.
- ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتی کۆیلە شوی کرد بە کەسێکی ئازادو منداڵی بوو ئەوە لەبەر منداڵەکەی ئازادەو نافرۆشرێت -.

٣٩٥٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: بِعْنَا أُمَّهَاتِ الْأَوْلَادِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ, فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ نَهَانَا فَانْتَهَيْنَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و پێشەوا ئەبە بەکردا ئەو کەنیزانەمان دەفرۆشت کە دایکی منداڵ بوون، کاتێ کە پێشەوا عومەر بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان ڕێگری ئەوەی لێ کردین.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی ئەو کۆیلەیەی کە ئازاد کراوە بەمەرجێ لەدوای مردنی خاوەنەکەی ئازاد ببێت.

### ٩ - باب فِي بَيْعِ الْمُدَبَّرِ.

٣٩٥٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ غُلَامًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ مِنْهُ, وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ, فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبِيعَ بسبع مئة درهم, أو بتسع مئة.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ غوڵامێکی خۆی ئازاد کرد بەمەرجێ لەدوای مردنی خۆی ئازاد ببێت، لەپاشدا پیاوەکە پێ گیرا بۆ ماڵ و سامان جگە لەو غوڵامە هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کرد فرۆشتی بە حەوت سەد درهەم، یان نۆ سەد درهەم.

٣٩٥٦ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله, بهذا, زاد: وقال - يعني النبي صلى الله عليه وسلم - : (أَنْتَ أَحَقُّ بِثَمَنِهِ, وَاللَّهُ أَغْنَى عَنْهُ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە فەرموودەی پێشو هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تۆ شایەنتری

بە نرخی ئەو بەندەیە چونکە تۆ موحتاجی، خوای گەورەش دەوڵەمەندترە لە ئازادکردنی ئەو بەندەیە لەکاتێکدا کە تۆ موحتاجی).

٣٩٥٧ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو مَذْكُورٍ, أَعْتَقَ غُلاَمًا لَهُ يُقَالُ لَهُ يَعْقُوبُ عَنْ دُبُرٍ, وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ, فَدَعَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَنْ يَشْتَرِيهِ؟). فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ النَّحَّامِ بثمان مئة درهم, فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ, ثُمَّ قَالَ: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فَقِيرًا فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ, فَإِنْ كَانَ فِيهَا فَضْلٌ فَعَلَى عِيَالِهِ, فَإِنْ كَانَ فِيهَا فَضْلٌ فَعَلَى ذِى قَرَابَتِهِ). أَوْ قَالَ: (عَلَى ذِى رَحِمِهِ, فَإِنْ كَانَ فَضْلاً فَهَا هُنَا وَهَا هُنَا).

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە ئەنصار ناوی (أَبُو مَذْكُور) بوو، غوڵامێکی خۆی ئازاد کرد ناوی یەعقوب بوو بەمەرجێ لەدوای مردنی خۆی ئازاد ببێت، لەپاشدا پیاوەکە پێ گیرا بۆ ماڵ و سامان جگە لەو غوڵامە هیچ ماڵ و سامانێکی تری نەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ ئەم غوڵامەم لێ دەکڕێت؟)، نوعەیمی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی نەححام بە هەشت سەد درهەم لێی کڕی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەشت سەد درهەمەکەی دا بە (أَبُو مَذْكُور)، لەپاشدا فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە هەژار بوو با لەخۆیەوە دەست پێ کات خێرەکەی بۆ خۆی ببێ، ئەگەر لەخۆی زیاد بوو بۆ خاوخێزانەکەی، ئەگەر لەوانیش زیاد بوو بۆ خزم و کەسوکارە نزیکەکانی)، یان فەرمووی: (بۆ ئەوانەی بە سیلەی ڕەحم پێی دەگەن، ئەگەر هەر زیاد بوو ئیتر لێرەو لەوێ بیبەخشە).

## باسی سەبارەت بەوەی بەندەکانی ئازاد بکات نەگەنە سێ یەك.

## ١٠ - باب فِيمَنْ أَعْتَقَ عَبِيدًا لَهُ لَمْ يَبْلُغْهُمُ الثُّلُثُ.

٣٩٥٨ - (صحيح) عن عمران بن حصين: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةَ أَعْبُدٍ عِنْدَ مَوْتِهِ, وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ, فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيدًا, ثُمَّ دَعَاهُمْ فَجَزَّأَهُمْ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ, فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ, فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ, وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لەکاتی سەرەمەرگدا شەش بەندەی خۆی ئازاد کرد، جگە لەو بەندانە هیچ ماڵ و سامانێکی تری نەبوو، ئەو باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، قسەی زۆر توندو ناخۆشی بە پیاوەکە فەرموو: لەپاشدا کردنی بە سێ بەشەوە، قورعەی کرد لەنێوانیاندا، دوانیانی ئازادکردو، چواریانی بە بەندەیی هێشتەوە.

٣٩٥٩ - (صحيح) عن أبو قلابة, بإسناده ومعناه, ولم يقل: فَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيدًا.

واتە: لە ئەبو قیلابەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام بە بێ: (فَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيدًا).

٣٩٦٠ - (صحيح الإسناد) عن أبو قلابة, عن أبي زيد, أن رجلا من الأنصار, بمعناه : وقال يعني النبي صلى الله عليه وسلم: (لَوْ شَهِدْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُدْفَنَ, لَمْ يُدْفَنْ فِي مَقَابِرِ الْمُسْلِمِينَ).

واتە: لە ئەبو قیلابەوە، لە ئەبو زەیدەوە، دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە ئەنصار، جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله

علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر بەرلەوە بنێژرێ ئامادەی تەرمەکی ببومایە، نەمدەهێشت لە گۆڕستانی موسوڵمانان بنێژرایە).

٣٩٦١ - (صحيح) عن عمران بن حصين: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةَ أَعْبُدٍ عِنْدَ مَوْتِهِ, وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ, فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ, فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ, وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لەکاتی سەرەمەرگدا شەش بەندەی خۆی ئازاد کرد، جگە لەو بەندانە هیچ ماڵ و سامانێکی تری نەبوو، ئەو باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قورعەی کرد لەنێوانیاندا، دوانیانی ئازادکردو، چواریانی بە بەندەیی هێشتەوە.

## باسی کەسێ بەندەیە ئازاد بکات، بەندەکە ماڵ و سامانی هەبێت.

## ١١ - باب فِيمَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ

٣٩٦٢ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ فَمَالُ الْعَبْدِ لَهُ, إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ السَّيِّدُ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەندەیە ئازاد بکات، ئەگەر بەندەکە ماڵ و سامانی هەبوو ئەوە بۆ خۆیەتی گەورەکەی مافی پێوە نیە، مەگەر گەورەکە مەرجی کردبێ ماڵ و سامانەکەی بۆ خۆی بێت).

## باسی دەربارەی ئازادکردنی بەندەی زۆڵ.

## ١٢ - باب فِي عِتْقِ وَلَدِ الزِّنَا.

٣٩٦٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَلَدُ الزِّنَا شَرُّ الثَّلَاثَةِ). وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لأَنْ أُمَتِّعَ بِسَوْطٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتِقَ وَلَدَ زِنْيَةٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مندالّی زۆڵ خراپترینی سێ کەسەکەیە - کە خۆی و دایکی و باوکین - ) ئەبو هورەیرە وتی: ئەگەر قەمچیە بکەم بە خێر لەڕێی خوای گەورەدا ئەوەم پێ خۆشترە لەوەی بەندەیەکی زۆڵ ئازاد بکەم.

## باسی سەبارەت بە پاداشتی ئازادکردن.

## ١٣- باب فِي ثَوَابِ الْعِتْقِ.

٣٩٦٤ - (ضعيف) عن الغريف بن الديلمي قال: أَتَيْنَا وَاثِلَةَ بْنَ الأَسْقَعِ, فَقُلْنَا لَهُ: حَدِّثْنَا حَدِيثًا لَيْسَ فِيهِ زِيَادَةٌ وَلاَ نُقْصَانٌ, فَغَضِبَ وَقَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَقْرَأُ وَمُصْحَفُهُ مُعَلَّقٌ فِي بَيْتِهِ فَيَزِيدُ وَيَنْقُصُ! قُلْنَا: إِنَّمَا أَرَدْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, قَالَ: أَتَيْنَا النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَاحِبٍ لَنَا أَوْجَبَ - يَعْنِى النَّارَ - بِالْقَتْلِ, فَقَالَ: (أَعْتِقُوا عَنْهُ يُعْتِقِ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە غەریفی کوڕی دەیلەمییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (واثلة)ی کوڕی ئەسقەع هات بۆ لامان، پێمان وت: فەرموودەیەکمان بۆ گێڕەرەوە بە بێ زیادو کەم، توڕە بوو وتی: کەسێ لە ئێوە قورئان دەخوێنێ لەکاتێکدا قورئانەکە لە

ماڵەكەیدا هەڵواسراوە لێی زیاد دەكات و لێی كەم دەكات! وتمان: دەمانەوێ فەرمودەیەكمان بۆ بگێڕیتەوە خۆت لە پێغەمبەری خودات صلى الله عليه وسلم بیستبێ، وتی: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی هاوڕێیەكمان كە ئاگر - پێویست بوو بۆی بە هۆی كوشتن، فەرمووی: (لەجیاتی ئەو بەندەیە ئازاد بكەن، خوای گەورە بەهۆی هەر ئەندامێكیەوە، ئەندامێكی لەئاگری دۆزەخ رزگار دەكات).

## باسی چ بەندەیە ئازاد بكرێت گەورەو چاكترە؟

## ١٤ - باب أَيِّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟

٣٩٦٥ - (صحيح) عن أبو نجيح السلمي قال: حَاصَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَصْرِ الطَّائِفِ - قَالَ مُعَاذٌ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: بِقَصْرِ الطَّائِفِ, بِحِصْنِ الطَّائِفِ, كُلُّ ذَلِكَ - فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَلَهُ دَرَجَةٌ). وَسَاقَ الْحَدِيثَ. وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (أَيُّمَا رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ رَجُلاً مُسْلِمًا فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهِ عَظْمًا مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهِ مِنَ النَّارِ, وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ أَعْتَقَتِ امْرَأَةً مُسْلِمَةً فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهَا عَظْمًا مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهَا مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئەبو نەجیحی سولەمییەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم گەمارۆی كۆشكی (طائف)مان دا، (معاذ) وتی: بیستم لە باوكم وتی: لە كۆشكی (طائف)، لەقەڵای (طائف)، بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەركەسێ لەڕێگەی خوای گەورەدا تیرێك بگرێتە دوژمن پلەیەكی بۆ هەیە لە بەهەشتدا)، جا راوی فەرمودەكەی گێڕایەوە. بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (هەر پیاوێكی موسوڵمان پیاوێكی موسوڵمان ئازاد بكات، خوای

گەورە یەك بە یەك ئێسكی ئازادكراوەكە دەكات بە سوپەرێ، بۆ یەك بە یەك ئێسكی ئازادكەرەكە، و لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێ. هەر ئافرەتێكی موسوڵمان ئافرەتێكی موسوڵمان ئازاد بكات، خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا یەك بە یەك ئێسكی ئازادكراوەكە دەكات بە سوپەرێ، بۆ یەك بە یەك ئێسكی ئازادكەرەكە و لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێ).

٣٩٦٦ - (صحيح) عن شرحبيل بن السمط, أنه قال لعمرو بن عبسة: حدثنا حديثا سمعته من رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً كَانَتْ فِدَاءَهُ مِنَ النَّارِ).

واتە: لە شورەحبیلی كوڕی (سمط)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی بە عەمری كوڕی عەبەسە: فەرموودەیەكمان بۆ باس بكە لە پێغەمبەری خودات صلی الله علیه وسلم بیستبێ، وتی: بیستبم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (هەركەسێ بەندەیەكی باوەڕدار ئازاد بكات ئازادكردنی ئەو بەندە دەبێتە هۆی پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ).

٣٩٦٧ - (صحيح) عن شرحبيل بن السمط, أنه قال لكعب بن مرة - أو مرة بن كعب - : حَدِّثْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم, فَذَكَرَ مَعْنَى مُعَاذٍ إِلَى قَوْلِهِ: (وَأَيُّمَا امْرِئٍ أَعْتَقَ مُسْلِمًا, وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ أَعْتَقَتِ امْرَأَةً مُسْلِمَةً). وَزَادَ: (وَأَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأَتَيْنِ مُسْلِمَتَيْنِ إِلاَّ كَانَتَا فِكَاكَهُ مِنَ النَّارِ, يُجْزَى مَكَانَ كُلِّ عَظْمَيْنِ مِنْهُمَا عَظْمٌ مِنْ عِظَامِهِ). (قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَالِمٌ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ شُرَحْبِيلَ, مَاتَ شُرَحْبِيلُ بِصِفِّينَ).

واتە: لە شورەحبیلی كوڕی (سمط)ەوە دەگێڕنەوە، كە بە كەعبی كوڕی موررە - یان بە موررەی كوڕی كەعبی وتوە - : فەرموودەیەكمان بۆ باس بكە كە لە پێغەمبەری خودات صلی الله علیه وسلم بیستبێ، ئەویش وەك بە هەمان مانای

فەرموودەکەی (معاذ)ی پێشوتری گێڕایەوە هەتا گەیشتە: (هەر پیاوێکی موسوڵمان پیاوێکی موسوڵمان ئازاد بکات، وە هەر ئافرەتێکی موسوڵمان ئافرەتێکی موسوڵمان ئازاد بکات)، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هەر پیاوێکی موسوڵمان دوو ئافرەتی موسوڵمان ئازاد بکات، ئەو ئازادکردنە دەبێتە هۆی رزگارکردنی لە ئاگری دۆزەخ، دوو ئێسکی ئەوان دەبێتە هۆی رزگارکردنی یەك ئێسکی پیاوە ئازادکەرەکە).

## باسی سەبارەت بە گەورەیی ئازادکردنی بەندە لەکاتی لەش ساغی دا.

## ١٥ - باب فِي فَضْلِ الْعِتْقِ فِي الصِّحَّةِ.

٣٩٦٨ - (ضعيف) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَثَلُ الَّذِى يُعْتِقُ عِنْدَ الْمَوْتِ كَمَثَلِ الَّذِى يُهْدِى إِذَا شَبِعَ).

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (وێنەی ئەو کەسەی لەکاتی سەرەمەرگدا بەندە ئازاد دەکات وەك ئەو کەسە وایە کاتێ کە خۆی تێر بوو ئەوکاتە لەخواردنەکەی دەبەخشێت).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوكی پیتەكان و خوێندنەوەی قورئان

# ٣١ - أول كتاب الحروف والقراءات

## ١ - باب

٣٩٦٩ - (صحيح) عن جابر رضى الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى).

واتە: لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلى). سورە النساء: ١٢٥.

٣٩٧٠ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَقَرَأَ فَرَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ, فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَرْحَمُ اللَّهُ فُلاَنًا! كَائِنٌ مِنْ آيَةٍ أَذْكَرَنِيهَا اللَّيْلَةَ كُنْتُ قَدْ أَسْقَطْتُهَا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە پیاوێ لە شەونوێژدا بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، كاتێ كە رۆژبوەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (رەحمەتی خوا لە فلان كەس بێت، چەند ئایەتێكی یادخستمەوە كە من لەیادم برابونەوە).

٣٩٧١ - (صحيح) ابن عباس رضي الله عنهما, نزلت هذه الآية: (وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ) فِي قَطِيفَةٍ حَمْرَاءَ فُقِدَتْ يَوْمَ بَدْرٍ, فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَعَلَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَهَا, فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَغُلَّ مَفْتُوحَةُ الْيَاءِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ﴾. قەدیفەیەکی سور لە ماڵی غەنیمەت دیار نەمابوو لەرۆژی جەنگی بەدردا، هەندێ خەڵك وتیان: لەوانەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بردبێتی بۆ خۆی، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾.سوره آل عمران:١٦١.
واتە: وە بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبوو کە خیانەت بکات، وە هەر کەس خیانەت بکات بەو خیانەتەوەی کردویەتی دێت (بەکۆڵیەوەیە) لە پاشەڕۆژدا (ڕۆژی هەستانەوە)، پاشان پاداشت دەدرێتەوە هەموو کەسێك هەرچی کردبێت، وە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت.

٣٩٧٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَالْهَرَمِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە چروکی و ڕەزیلی، لەتەمەنی پەککەوتەیی و گرفتاری).

٣٩٧٣ - (صحيح) عن لقيط بن صبرة قال: كُنْتُ وَافِدَ بَنِي الْمُنْتَفِقِ - أَوْ: فِي وَفْدِ بَنِي الْمُنْتَفِقِ - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, فَقَالَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - (لاَ تَحْسِبَنَّ). وَلَمْ يَقُلْ: لاَ تَحْسَبَنَّ.

واتە: لە (لقيط)ی کوڕی صەبیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من نوێنەری هۆزی مونتەفیق بووم - یان: یەکێ بووم لە نوێنەرانی هۆزی مونتەفیق - بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە - فەرموودەکە پێشتر بە ژمارە: ١٤٢ بە تەواوی هاتوە - پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لاَ تَحْسِبَنَّ). نەیفەرموو: لاَ تَحْسَبَنَّ.

٣٩٧٤ - (صحيح) عن ابن عباس قال: لَحِقَ الْمُسْلِمُونَ رَجُلاً فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ, فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ, فَقَتَلُوهُ, وَأَخَذُوا تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ, فَنَزَلَتْ: (وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا). تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: موسوڵمانان گەیشتن بە پیاوێ رانە مەڕێکی خۆی پێ بوو، وتی: سڵاوی خواتان لێ بێ، ئەوانیش وایان دەزانی لەبەر ئەوەی خۆی و مەڕەکاتی سەلامەت بن بۆیە سەلامیان لێ دەکات، کوشتیان و رانە مەڕەکەیان برد بۆ خۆیان، لەوبارەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾. سورە النساء: ٩٤. واتە: نەڵێن بەو کەسانەی کە سڵاو(ی موسڵمانانە)تان لێ دەکەن تۆ بڕوادار نیت؟ بەدوای شتوومەك و سامانی دنیایی دا بگەڕێن. ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ مەبەستی لێی رانە مەڕەکەیە.

٣٩٧٥ - (حسن صحيح) عن زيد بن ثابت: أن النبي صلى الله عليه و سلم كان يقرأ: (غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) وَلَمْ يَقُلْ سَعِيدٌ: كَانَ يَقْرَأُ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾. سورە النساء: ٩٥.

٣٩٧٦ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: قرأها رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَالْعَيْنُ بِالْعَيْنِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم، بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَٱلْعَيْنُ بِٱلْعَيْنِ ﴾. سورە المائدە: ٤٥.

٣٩٧٧ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: أن النبي قرأ: (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنُ بِالْعَيْنِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم، بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنُ بِٱلْعَيْنِ ﴾. سورە المائدە: ٤٥.

٣٩٧٨ - (حسن) عن عطية بن سعد العوفي قال: قرأت على عبد الله بن عمر: (اللَّهُ الَّذِى خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ) فَقَالَ: (مِنْ ضُعْفٍ) قَرَأْتُهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا قَرَأْتَهَا عَلَيَّ, فَأَخَذَ عَلَيَّ كَمَا أَخَذْتُ عَلَيْكَ.

واتە: لە (عطية)ی کوڕی سەعدی عەوفییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەم شێوەیە ئەم ئایەتەم خوێندەوە بۆ (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ﴾ سورە الروم: ٥٤، ئەویش وتی: (مِنْ ضُعْفٍ). منیش بە (مِنْ ضَعْفٍ) خوێندمەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم، ئەویش بە هەمان شێوە بە (مِنْ ضُعْفٍ). بۆی خوێندمەو.

٣٩٧٩ - (حسن) عن أبو سعيد: عن النبي صلى الله عليه وسلم: (مِنْ ضُعْفٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە بە (مِنْ ضُعْفٍ) لە پێغەمبەرەوە صلی اللە علیە وسلم هاتوە.

٣٩٨٠ - (حسن صحيح) عن أبي بن كعب قال: (بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْتَفْرَحُوا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: بِالتَّاءِ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ ﴾. سورە یونس: ٥٨.

٣٩٨١ - (حسن صحيح) عن أبي: أن النبي صلى الله عليه وسلم قرأ: (بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْتَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا تَجْمَعُونَ).

واتە: لە ئوبەییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾.

٣٩٨٢ - (صحيح) عن أسماء بنت يزيد: أنها سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقرأ: (إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ).

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە هاتوە، کە لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم، بیستوە بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندوتەوە: ﴿ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ﴾. سورە هود: ٤٦.

٣٩٨٣ - (صحيح) عن شهر بن حوشب قال: سألت أم سلمة: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: (إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ) فَقَالَتْ: قَرَأَهَا: (إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ).

واتە: لە شەهری کوڕی حەوشەبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە ئەبو سەلەمە دەربارەی چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەم ئایەتە: ﴿ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ

صَٰلِحٍۖ ﴾ لەلایەن پێغەمبەری خواوە؟ ئەویش وتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیە دەیخوێندەوە: (إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ).

٣٩٨٤ - (صحيح) عن أبي بن كعب قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَعَا بَدَأَ بِنَفْسِهِ, وَقَالَ: (رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى مُوسَى! لَوْ صَبَرَ لَرَأَى مِنْ صَاحِبِهِ الْعَجَبَ), وَلَكِنَّهُ قَالَ: (إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِي).

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەپاڕایەوە یەکەم جار لەخۆیەوە دەستی پێ دەکرد، وە دەیفەرموو: (ڕەحمەتی خوا لە خۆمان و لە موسا بێت، ئەگەر ئارامی بگرتایە شتی سەیری زیاتری دەبینی لە هاوڕێکەی مەبەستی لە پیاوە ساڵحەکەیە کە لە سورەتی (الكهف)دا باسی هاتوە، بەڵام وتی: ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِيۖ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي﴾. سوره الكهف: ٧٦. واتە: (مووسا) ووتی ئەگەر دوا ئەم جارە پرسیاری هەرشتێکم لێ کردی (ڕەخنەم لێ گرتیت) ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە، چونکە بەڕاستی لەلایەن منەوە بیانووت هەیە (لەوەی وازم لێ بێنیت).

٣٩٨٥ - (ضعيف) عن أبي بن كعب: عن النبي صلى الله عليه و سلم أنه قرأها: (قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّ) وَثَقَّلَهَا.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا﴾.

٣٩٨٦ - (صحيح) عن مصدع أبي يحيى قال: سمعت ابن عباس يقول: أَقْرَأَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ كَمَا أَقْرَأَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ) مُخَفَّفَةً.

واتە: لە میصدەعی کوڕی یەحیاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ بوو دەیوت: ئوبەی کوڕی کەعب ئەم ئایەتەی بۆ خوێندمەوە وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیخوێندەوە: ﴿فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾. الكهف : ٨٦.

٣٩٨٧ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِ عِلِّيِّينَ لَيُشْرِفُ عَلَى أَهْلِ الْجَنَّةِ فَتُضِيءُ الْجَنَّةُ لِوَجْهِهِ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ). - قَالَ: وَهَكَذَا جَاءَ الْحَدِيثُ: (دُرِّيٌّ). مَرْفُوعَةُ الدَّالِ لاَ تُهْمَزُ - (وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لَمِنْهُمْ وَأَنْعَمَا).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان پیاوێ لەخەڵکی بەرزترین پلەکانی بەهەشت سەرپەرشتی ئەهلی بەهەشت دەکات روخساری وەك ئەستێرەی درەوشاوەو سپی و جوان دەدرەوشێتەوە). (پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوای لێ بێ لەوانەن، خاوەن ئەو نیعمەت و فەزڵە گەورەن). - راوی وتی: (دُرِّيٌّ). لە فەرموودەدا بەم شێوەیە هاتوە-.

٣٩٨٨ - (حسن صحيح) عن فروة بن مسيك الغطيفي قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَذَكَرَ الْحَدِيثَ, فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَخْبِرْنَا عَنْ سَبَإٍ مَا هُوَ؟ أَرْضٌ أَمِ امْرَأَةٌ؟ فَقَالَ: (لَيْسَ بِأَرْضٍ وَلاَ امْرَأَةٍ, وَلَكِنَّهُ رَجُلٌ وَلَدَ عَشَرَةً مِنَ الْعَرَبِ فَتَيَامَنَ سِتَّةٌ وَتَشَاءَمَ أَرْبَعَةٌ). قَالَ عُثْمَانُ الْغَطَفَانِيُّ مَكَانَ الْغُطَيْفِيِّ وَقَالَ حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الْحَكَمِ النَّخَعِيُّ.

واتە: لە فەروەی کوڕی موسەیکی (الْغُطَيْفِيِّ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، پیاوێ لە خەڵکەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم هەواڵمان بدەرێ وشەی (سَبَإٍ) چییە؟ - کە دوو جار لە قورئاندا هاتوە:
﴿ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴾ سورە النمل:٢٢، ﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ ﴾ سورە سبأ:١٥. - زەوی یە یان ئافرەت؟ فەرمووی: (نە زەوی یە وە نە ئافرەت، بەڵکو پیاوێك عەرەب بووە دە کوڕی هەبووە، شەشیان لە یەمەن بوون و چواریان لە شام).

٣٩٨٩ - (صحيح) عن أبو هريرة, عن النبي صلى الله عليه وسلم, - قال إسماعيل: عن أبو هريرة رواية - فذكر حديث الوحي, قال: فذلك قوله تعالى: (حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم - ئیسماعیل وتی: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە- جا باسی فەرموودەی وەحی کرد، وتی: ئا ئەوە فەرمایشتەکەی خوای گەورەیە: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ ﴾. سورە سبأ:٢٣.

٣٩٩٠ - (ضعيف الإسناد) عن أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَلَى قَدْ جَاءَتْكِ آيَاتِي فَكَذَّبْتِ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتِ وَكُنْتِ مِنَ الْكَافِرِينَ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا مُرْسَلٌ, الرَّبِيعُ لَمْ يُدْرِكْ أُمَّ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾. سورە الزمر: ٥٩.

٣٩٩١ - (صحيح) عن عطاء - قال ابن حنبل: (لم أفهم) جيدا - عن صفوان - قال ابن عبدة: ابن يعلى - عن أبيه قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقْرَأُ: (وَنَادَوْا يَا مَالِكُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي بِلاَ تَرْخِيمٍ.

واتە: لە (عطاء)ەوە - ئیبنو حەنبەل وتی: باش (لێی تێنەگەیشتم) - لە صەفوانەوە - ئیبنو عەبدە وتی: ئیبنو یەعلا - لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَنَادَوْاْ يَـٰمَـٰلِكُ﴾ . سوره الزخرف: ٧٧.

٣٩٩٢ - (صحيح) عن عبد الله – بن مسعود – قال: أَقْرَأَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي أَنَا الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ).

واتە: لە (عبد الله) - ی كوڕی مەسعود - ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی بۆ خوێندمەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾. سوره الزاريات: ٥٨.

٣٩٩٣ - (صحيح) عن عبد الله, أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يقرؤها: (فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ). يَعْنِى مُثَقَّلاً. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَضْمُومَةَ الْمِيمِ مَفْتُوحَةَ الدَّالِ مَكْسُورَةَ الْكَافِ.

واتە: لە (عبد الله) - ی كوڕی مەسعود - ەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾. القمر: ١٥.

٣٩٩٤ – (صحيح الإسناد) عن عائشة رضي الله تعالى عنها قالت: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقرؤها: (فَرُوحٌ وَرَيْحَانٌ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ﴾ . سوره الواقعه: ٨٩.

٣٩٩٥ - (ضعيف الإسناد) عن جابر قال: رأيت النبي صلى الله عليه وسلم يقرأ: (يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینی بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ﴾. سورە الهمزە: ٣.

٣٩٩٦ - (ضعيف الإسناد) عن أبو قلابة: عَمَّنْ أَقْرَأَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَيَوْمَئِذٍ لاَ يُعَذَّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ, وَلاَ يُوثَقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ).

واتە: ئەبو قیلابە لە هەندێ لە هاوەڵانەوە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندوتەوە: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذَّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾﴾. سورە الفجر: ٢٥- ٢٦.

٣٩٩٧ - (ضعيف الإسناد) عن أبو قلابة قال: أَنْبَأَنِي مَنْ أَقْرَأَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, أَوْ مَنْ أَقْرَأَهُ مَنْ أَقْرَأَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَيَوْمَئِذٍ لاَ يُعَذَّبُ).

واتە: لە ئەبو قیلابەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێم گەیشتوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندوتەوە: (فَيَوْمَئِذٍ لاَ يُعَذَّبُ).

٣٩٩٨ - (ضعيف الإسناد) عن أبو سعيد الخدري قال: حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا ذَكَرَ فِيهِ جِبْرِيلَ وَمِيكَالَ. فَقَرَأَ: (جِبْرَائِلَ وَمِيكَائِلَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ خَلَفٌ: مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً, لَمْ أَرْفَعِ الْقَلَمَ عَنْ كِتَابَةِ الْحُرُوفِ, مَا أَعْيَانِي شَيْءٌ, مَا أَعْيَانِي جِبْرَائِلُ وَمِيكَائِلُ.

واته: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموودەیەکی گێڕایەوە باسی جیبریل و میکائیلی کرد، بەم شێوەیە خوێندیەوە: (جِبْرَائِلَ وَمِيكَائِلَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ خَلَفٌ: مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً, لَمْ أَرْفَعِ الْقَلَمَ عَنْ كِتَابَةِ الْحُرُوفِ, مَا أَعْيَانِي شَيْءٌ, مَا أَعْيَانِي جِبْرَائِلُ وَمِيكَائِلُ.

٣٩٩٩ - (ضعيف) عن أبو سعيد الخدري قال: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَاحِبَ الصُّورِ فَقَالَ: (عَنْ يَمِينِهِ جِبْرَائِلُ وَعَنْ يَسَارِهِ مِيكَائِلُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ خَلَفٌ: مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً, لَمْ أَرْفَعِ الْقَلَمَ عَنْ كِتَابَةِ الْحُرُوفِ, مَا أَعْيَانِي شَيْءٌ, مَا أَعْيَانِي جِبْرَائِلُ وَمِيكَائِلُ.

واته: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی ئەو مەلائیکەیەی کرد کە فوو دەکات بە (شەیپور) کەڕەنادا، فەرمووی: (جیبرئیل لەلای ڕاستیەوە و میکائیل لەلای چەپیەوە). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ خَلَفٌ: مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً, لَمْ أَرْفَعِ الْقَلَمَ عَنْ كِتَابَةِ الْحُرُوفِ, مَا أَعْيَانِي شَيْءٌ, مَا أَعْيَانِي جِبْرَائِلُ وَمِيكَائِلُ.

٤٠٠٠- (ضعيف الإسناد) عن الزهري - قال معمر: وربما ذكر ابن المسيب - قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ يَقْرَءُونَ: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ), وَأَوَّلُ مَنْ قَرَأَهَا: (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) مَرْوَانُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ :هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ, عَنْ أَنَسٍ, وَالزُّهْرِيِّ, عَنْ سَالِمٍ, عَنْ أَبِيهِ.

واته: لە زوهریەوە - مەعمەر وتی: لەوانەیە باسی ئیبنو موسەییەبی کردبێت - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر و (عثمان) بەم شێوەیە ئەم ئایەتەیان خوێندۆتەوە: ( مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ )، یەکەم کەس بەم شێوەیە خوێندیەوە مەروان - ی کوڕی حەکەم - بوو: ( مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ). سورە الفاتحە: ٣.

٤٠٠١ - (صحيح) عن أم سلمة أنها ذكرت - أو كلمة غيرها - : قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ, الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ, الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ, مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) يَقْطَعُ قِرَاءَتَهُ آيَةً آيَةً. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ يَقُولُ: الْقِرَاءَةُ الْقَدِيمَةُ (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دەوەستا، (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) دەوەستا، (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دەوەستا، (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) دەوەستا. واتە ئایەت بە ئایەت کەمێك لەسەریان دەوەستا. ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو دەیوت: خوێندنەوەی کۆنی بەم شێوەیە بووە: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ).

٤٠٠٢ - (صحيح الاسناد) عن أبو ذر قال: كُنْتُ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى حِمَارٍ, وَالشَّمْسُ عِنْدَ غُرُوبِهَا, فَقَالَ: (هَلْ تَدْرِي أَيْنَ تَغْرُبُ هَذِهِ؟) قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ, قَالَ: (فَإِنَّهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَامِيَةٍ).

واتە: لە (أبو ذر)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتی خۆر ئاوا بوون بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەر گوێدرێژێکەوە بوو، منیش لە پاشکۆی دا سوار بوو بووم، فەرمووی: (ئایا دەزانی ئەمە لەکوێ ئاوا دەبێت؟ واتە خۆر). وتم: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (بێگومان خۆر لە کانیاوێکدا کە قوڕە ڕەشەی بەدەوردایە ئاوا دەبێت). مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی: (تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ) سوره الكهف: ٨٦. بەم شێوەیە خوێندەوە: (تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَامِيَةٍ).

٤٠٠٣ - (صحيح) عن ابن الأسقع قال: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَهُمْ فِي صُفَّةِ الْمُهَاجِرِينَ فَسَأَلَهُ إِنْسَانٌ: أَيُّ آيَةٍ فِي الْقُرْآنِ أَعْظَمُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ).

واتە: لە ئیبنو ئەسقەعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆ ئەو شوێنەی کە موسوڵمانە هەژارو بێ نەواکان تێیدا نیشتەجێ بوون لە مەدینە، کەسێ پرسیاری لێ کرد وتی: چ ئایەتێ لە قورئاندا گەورەترین ئایەتە؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ ﴾. سورە البقرە: ٢٥٥.

٤٠٠٤ - (صحيح) عن شقيق, عن ابن مسعود: أَنَّهُ قَرَأَ: (هَيْتَ لَكَ). فَقَالَ شَقِيقٌ: إِنَّا نَقْرَؤُهَا: (هِئْتُ لَكَ). يَعْنِي فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَقْرَؤُهَا كَمَا عُلِّمْتُ أَحَبُّ إِلَيَّ.

واتە: لە شەقیقەوە، لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (هَيْتَ لَكَ). سورە یوسف: ٢٣. شەقیق وتی: ئێمە بەم شێوە دەمانخوێندەوە: (هِئْتُ لَكَ). واتە: ئیبنو مەسعود وتی: بەو شێوەیە دەیخوێنمەوە کە فێرکراوم ئەوەم بەلاوە خۆشترە.

٤٠٠٥ - (صحيح) عن شقيق قال: قيل لعبد الله: إِنَّ أُنَاسًا يَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ: (وَقَالَتْ هِيتَ لَكَ) فَقَالَ: إِنِّي أَقْرَأُ كَمَا عُلِّمْتُ أَحَبُّ إِلَيَّ: (وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ).

واتە: لە شەقیقەوە دەگێڕنەوە، کە وترا بە(عبد الله)ی کوڕی مەسعود: هەندێ خەڵك بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی دەخوێننەوە: (وَقَالَتْ هِيتَ لَكَ). ئیبنو مەسعود وتی: من بەو شێوەیە دەیخوێنمەوە کە فێرکراوم ئەوەم بەلاوە خۆشترە: (وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ).

٤٠٠٦ - (حسن صحيح) عن أبو سعيد الخدري قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: قال الله [ عزوجل ] لبني إسرائيل: (ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ تُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بە بەنی ئیسرائیل دەفەرموێت: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡ﴾.سوره البقره: ٥٨. واتە: بەم شێوەیە دەیخوێنرێتەوە.

٤٠٠٧ - عن هشام بن سعد, بإسناده, مثله.

واتە: لە هیشامی کوڕی سەعدەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٤٠٠٨ – (صحيح الاسناد) عن عروة: أن عائشة رضي الله عنها قالت: نَزَلَ الْوَحْيُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَ عَلَيْنَا: (سُورَةٌ أَنْزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي مُخَفَّفَةً, حَتَّى أَتَى عَلَى هَذِهِ الآيَاتِ.

واتە: لە عوروەوە دەگێڕنەوە، کە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی: وەحی دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە بۆمان: ﴿سُورَةٌ أَنزَلۡنَٰهَا وَفَرَضۡنَٰهَا﴾. سوره النور:١.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی گەرماو.

# ٢٥- أول كتاب الحمام

## باسی سەبارەت بە چوونە گەرماو.

## ١ - باب الدُّخولِ فِي الْحَمَّامِ.

٤٠٠٩ - (ضعيف) عن عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا, قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ دُخُولِ الْحَمَّامَاتِ, ثُمَّ رَخَّصَ لِلرِّجَالِ أَنْ يَدْخُلُوهَا فِي الْمَيَازِرِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوونە گەرماوە گشتیەکانی قەدەغەکرد، لە پاشدا ڕێگەی دا بە پیاوان بە پشتەماڵەوە بچن.

٤٠١٠ - (صحيح) عن سالم بن أبي الجعد - قال ابن المثنى: عن أبي المليح - قال: دَخَلَ نِسْوَةٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا, فَقَالَتْ: مِمَّنْ أَنْتُنَّ؟ قُلْنَ: مِنْ أَهْلِ الشَّامِ, قَالَتْ: لَعَلَّكُنَّ مِنَ الْكُورَةِ الَّتِي تَدْخُلُ نِسَاؤُهَا الْحَمَّامَاتِ؟ قُلْنَ: نَعَمْ, قَالَتْ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَا مِنِ امْرَأَةٍ تَخْلَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا إِلاَّ هَتَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ تَعَالَى).

واتە: لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە - ئیبنو (المثنى) وتی: لە ئەبو مولەیحەوە - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ژنانی خەڵکی شام چوون بۆلای عائیشەوە ڕەزای

خوای لێ بێ وتی: ئێوە کێن؟ وتیان: خەڵکی شامین، وتی: لەوانەیە خەڵکی ئەو ناوچەیە بن کە ژنەکانیان دەچنە گەرماوە گشتیەکان؟ وتیان: بەڵێ، وتی: من خۆم بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ جل و بەرگەکەی خۆی دابنێ و خۆی رووت بکاتەوە لە غەیری ماڵی خۆیدا ئەوە بێگومان هەتکی پەیمانی شەرم و شکۆی نێوان خۆی و نێوانی خوای گەورەی کردوە).

٤٠١١ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّهَا سَتُفْتَحُ لَكُمْ أَرْضُ الْعَجَمِ, وَسَتَجِدُونَ فِيهَا بُيُوتًا يُقَالُ لَهَا الْحَمَّامَاتُ, فَلاَ يَدْخُلَنَّهَا الرِّجَالُ إِلاَّ بِالأُزُرِ, وَامْنَعُوهَا النِّسَاءَ إِلاَّ مَرِيضَةً أَوْ نُفَسَاءَ).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان لەمەودوا خاکی عەجەم رزگار دەکەن، ماڵانێکی تێدا دەبینن پێیان دەڵێن: گەرماوەکان، با پیاوەکانتان نەچنە ناویانەوە ئیللا بە پشتەماڵەوە نەبێت - واتە عەورەتیان داپۆشراو بێت -، لە ئافرەتانیان قەدەغەبکەن، ئیللا ئەوانەیان نەبێت کە نەخۆشن یان زەیسانن.

## باسی رێگری کردن لە خۆڕوتکردنەوە.

## ٢ - باب النَّهْيِ عَنِ التَّعَرِّي.

٤٠١٢ - (صحيح) عن يعلى: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بِالْبَرَازِ بِلاَ إِزَارٍ, فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ, فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ, ثُمَّ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ, فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ).

واتە: لە یەعلاوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی دی لە دەشتێکدات بێ پەردە خۆی دەشت، لەبەرئەوە چووە سەرجێگای وتاردان

و سوپاس و ستایشی خوای کردوو، لەپاشدا فەرمووی: (بەڕاستی خوای باڵادەست و گەورە زۆر بەشەرم و داپۆشەرە شەرم و داپۆشینی پێ خۆشە، هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە خۆی شت با خۆی داپۆشێت).

٤٠١٣ - (حسن) عن يعلى: عن النبي صلى الله عليه وسلم بِهَذَا الْحَدِيثِ.
قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الأَوَّلُ أَتَمُّ.

واتە: لە یەعلاوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم ئەم فەرموودەی پێشو هاتوە.
ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەی یەکەم تەواوترە.

٤٠١٤ - (صحيح) عن زرعة بن عبد الرحمن بن جرهد عن أبيه - قال: كان جرهد هذا من أصحاب الصفة -, أنه قال: جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَنَا وَفَخِذِى مُنْكَشِفَةٌ, فَقَالَ: (أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ).

واتە: لە زورعەی کوڕی (عبد الرحمن)ی کوڕی جەرهەدەوە، لە باوکیەوە جەرهەد -جەرهەد یەکێ بووە لە هاوەڵانی صوففە(أصحاب الصفة) - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناوماندا دانیشتبو رانم بەدەرەوە بوو، فەرمووی: (ئایا نازانی ران (عەورەت)شەرمگەیە).

٤٠١٥ - (ضعيف جدا) عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَكْشِفْ فَخِذَكَ, وَلاَ تَنْظُرْ إِلَى فَخِذِ حَيٍّ وَلاَ مَيِّتٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ فِيهِ نَكَارَةٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (رانت دەرمەخە، سەیری رانی زیندوو مردوویش مەکە.

## باسی ئەوەی دەربارەی خۆڕوتکردنەوە هاتووە.

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي التَّعَرِّي.

٤٠١٦ - (صحيح) عن المسور بن مخرمة, قال: حَمَلْتُ حَجَرًا ثَقِيلاً فَبَيْنَا أَمْشِي, فَسَقَطَ عَنِّي ثَوْبِي, فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خُذْ عَلَيْكَ ثَوْبَكَ وَلاَ تَمْشُوا عُرَاةً).

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەردێکی گەورەم هەڵگرتبو لەوکاتەدا کە ڕێم دەکرد پۆشاکەکەم کەوت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (پۆشاکەکەت هەڵگرەوەو لەبەری بکەرەوە، بە رووتی رێ مەکە).

٤٠١٧ - (حسن) عن بهز بن حكيم, عن أبيه, عن جده قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, عَوْرَاتُنَا مَا نَأْتِي مِنْهَا وَمَا نَذَرُ؟ قَالَ: (احْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلاَّ مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِذَا كَانَ الْقَوْمُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ؟ قَالَ: (إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لاَ يَرَيَنَّهَا أَحَدٌ فَلاَ يَرَيَنَّهَا). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, إِذَا كَانَ أَحَدُنَا خَالِيًا؟ قَالَ: (اللَّهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَا مِنْهُ مِنَ النَّاسِ).

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، شەرمگاکانمان کامەی دەرخەین و کامەی داپۆشین؟ فەرمووی: (عەورەتی خۆت لە هەموو کەسێك داپۆشە جگە لە هاوسەرەکەت و ئەو کەنیزەی کە بوویتە خاوەنی کە سەیری بکات). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی ئەگەر خەڵکەکە زۆربوون و چوو بوون بەناو یەکتردا چۆن؟ فەرمووی: (هەتا دەتوانی با کەس عەورەتت نەبینێ). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی ئەگەر یەکێکمان خۆی بە تەنها بوو شوێنەکە چۆڵ بوو

چۆن؟ فەرمووی: (خوای گەورە لە هەموو کەسێکی تر شیاوترە کە شەرم و شکۆی لێ بکرێ).

٤٠١٨ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري, عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عُرْيَةِ الرَّجُلِ, وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلَى عُرْيَةِ الْمَرْأَةِ, وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ, وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي ثَوْبٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (با پیاو سەیری عەورەتی پیاو نەکات، هەروەها با ئافرەتیش سەیری عەورەتی ئافرەت نەکات، با پیاو بە رووتی خۆی نەنوسێنێ بە پیاوێکی ترەوە لەژێر پۆشاکێکدا یان لەناو نوێنی خەوتندا، هەروەها با ئافرەتیش بە رووتی خۆی نەنوسێنێ بە ئافرەتێکی ترەوە لەژێر پۆشاکێکدا یان لەناو نوێنی خەوتندا).

٤٠١٩ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم (لاَ يُفْضِيَنَّ رَجُلٌ إِلَى رَجُلٍ وَلاَ امْرَأَةٌ إِلَى امْرَأَةٍ, إِلاَّ وَلَدًا أَوْ وَالِدًا). قَالَ: وَذَكَرَ الثَّالِثَةَ فَنَسِيتُهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (با دوو پیاو پێکەوە لەناو جێگایەکدا نەخەون بەڕوتی، هەروەها دوو ئافرەتیش پێکەوە لەناو جێگایەکدا نەخەون بەڕوتی، مەگەر کوڕ یان باوك و دایکی بن). - فەرمودەکە لاوازە بێگومان تەنها بۆ ژن و مێرد دروستە پێکەوە بەڕووتی بخەون - راوی وتی ناوی سێیەمیشی برد بەڵام من لەیادم چو.

## نـــاوەڕۆك